نایانپەرستن ! دەستان لیٚ ئەشیٚوێنن شێتان ئەکەن شەلتان ئەکەن ! لەکوردەواری خۆمان ئەلیٚ ئەگەر داری سەر ئەو قەبرە ببڕی گۆج ئەبی ئیفلیج ئەبی کوێر ئەبیٚ وائەبیٚ هەتا داوای ! ئەگەر داوای لیٚ نەکەی ئەگەر دەستکاری قەبرەکەی بکەی یانی ئەوترسە ئەخەنە دلی خەلکەکە تا ئێستاش زۆر قەبر هەیە ئەبینی قەبری بەحسیاب پیاو چاکە ! شێخ و مشایخە ! ناوێرن دەستکاری شتێکی سەر قەبرەکە بکەن چەندەها دارو دارستانیان هەیە ئەلێن ناوێرین بیبڕین ئەگەر لەزستان ئەگەر ڕەقیش بینەوە لەبەر ئەوەی خاوەنی ئەو قەبرە دەستمان تووشی شەلەل ئەکا ! ئەگەر ڕێز و ئیحترامی بۆ دانەنێن بەحیساب ئەلیٚ ئەمە توشی زەرە ئەکا ! بەس خوای گەورە ئەفەرموویٚ : نا نەتووشی زەرەرتان ئەکا ! نەتووشی قازانجیشتان ئەکا ! یانی ئەگەر بیپەرستن هیچ سودێك نابینن ئەگەر نەشی پەرستن هیچ زەرەرێکتان تووش نابیٚ بەلاٚم لەم ڕوانەگەیەوە کە تووشی شیرك ئەبن گەورەترین زەرەر تووشتان ئەبیٚ (وَيَقُولُونَ هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِۚ)[1] ئەیان وت تکامان بۆ ئەکەن لەلای خوای تعالی ئەوە ئەصلی شیرکەکەیانە کەواتە ئەصلی شیرکەکە ئەوە نیە کە ئەوان وتوویانە ئەو پیاو چاکانە عالمی دروست کردوە ئێمەی دروست کردوە دونیا ئەبا بەرێوە مردوو و زیندووی بەدەست بیٚ ! (وفي زماننا الحاضر يقولون: )ئینجا شێخ ئەلیٚ :لەزەمانی ئەمرۆی ئێمەدا ئەو خەڵکە ئەلێن چی ؟ (هؤلاء وسائل نتوسل بهم إلى الله عز وجل وهذا كله دين الجاهلية وهو باطل ؛ لأنه عبادة لغير الله عز وجل. ) ئەمرۆ ئەلێن وسائیل وەسیلەیە ! ئەها کەلیمەی وەسیلە لەقورئاندا هاتوە ! تەبعەن ئەو کەلیمەی وەسیلە کە لەقورئاندا هاتوە بەمەستی و بەمانای عیبادەت دێت واتا ئەوانەی پێش ئێوە کاتێك عیبادەتیان کردوە بۆخوای تعالی عیبادەیان کردوە بەوەسیلە بۆ نزیك بوونەوە لەخوا ئێوەش وابکەن ! ئەمان دێن ئەلێن ئەو پیاو چاکانە ئەو رسولانە ئەو ئەنبیائانە ئەمانە وەسیلەی ئێمەن لەلای خوا داوایان لیٚ ئەکەین تا لەخوا مان نزیك بکەنەوە خوا لێمان خۆش بیٚ ئەو کەلیمەیە ئەمرۆ ئەوها بەکار ئەهێنن

[1] : سورة يونس اية : ١٨

**(قوله تعالى له دعوة الحق والذين يدعون من دونه لا يستجيبون لهم بشيء)**

**(وكما قال تعالى:** لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ)[١] **گەر تەواوی ئایەتەکە بهێنن** (إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦۚ وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ)[٢] **مانای ئایەتەکە :** (لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ) **واتا عیبادەی صەحیح یانی عیبادەی ڕاست عیبادەی دروست تەنها بۆ خوایە خوای گەورە عیبادەی دروست نەبێ نایەوێی خالص و پوختە نەبێ بۆ ئەو نایەوێی وە عیبادەت بۆ هیچ کەسێکی تر نییە دەعوە بەمانای عیبادە و پەرستن و پەیرەویی لێکردن و بەقسە کردن ئەبێ خالص بۆ خوا بێت پوختە بۆ خوا بێ بۆ غەیری خوا دروست نیە بۆ خواشی بکەی شیرکی لەگەلدا بکەی دروست نیە !** (لَهُۥ دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّۚ) (لَهُۥ) **یانی (الله)** (دَعۡوَةُ ٱلۡحَقِّ) **واتا عیبادەی ڕاست و دروست بۆخوای گەورەیە بۆ کەسیتر نیە کەس شایستەی پەرستن نیە کەس شایستەی پەیرەویی لێکردن نیە تەنها رب العالمین نەبێ ئەگەر بۆخواشی بکەی شەیرك پەیدا بکەی ئەوەیش قبول نیە چونکە حەق نیە و خالص نیە** (وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ) **ئەوانەی کە ئێوە داوای دەکەن لەغەیری خوا هیچ جوابێکیان نیە ناتوانن وەلامتان بدەنەوە ! هیچ شتێکتان وەلام نادەنەوە ئەها نمونەکە چۆن ئەفەرمووێی** (إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ) **سەیری ئەم نمونە جوانەکە کە خوای گەورە باسی ئەکا ئەگەر تۆ توێنوت بێ ئالەوێ بەرداغێك ئاو هەبێ دەستت رابگرێی ئاوەکە دێت بۆت ! نایەت ئاوەکە** (إِلَّا كَبَٰسِطِ كَفَّيۡهِ)**هەردوو دەستی درێژبکەی بۆ ئاوێك** (إِلَى ٱلۡمَآءِ لِيَبۡلُغَ فَاهُ) **بۆ ئەوەی بگات بەدەمی ، ئاخر چۆن ئەگات بەدەمی ناگات** (وَمَا هُوَ بِبَٰلِغِهِۦ)[٣] **خوای گەورە ئەفەرمووی ناگا !** (وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ)[٤] **ئەو داوایانەی کە ئەوان ئەیکەن بۆ غەیری خوا بۆ صالحین و ئەنبیاء و رسول و ئەوشتانە ! لەغەیری خوای تعالی ئەلێ** (إِلَّا فِي ضَلَٰلٍ) **واتای چی** (ضَلَٰلٍ) **واتا لەوپەی دووریەتیدایە لەحەق ! لەو پەرەی دووریەتیدایە لەصەواب بۆ؟ چونکە شیرکیان پەیدا کردوە بۆ خوای تعالی ! خوای گەورە ناوی نان چی ؟! (**وَمَا دُعَآءُ ٱلۡكَٰفِرِينَ **) یەکسەر تکفیری کردن بۆیە عولەمایان ئەفەرموون إجماعە لەسەر ئەوەی هەر کەسێك غەیری خوای**

[١] : سورة الرعد اية : ١٤
[٢] : سورة الرعد اية : ١٤
[٣] : سورة الرعد اية : ١٤
[٤] : سورة الرعد اية : ١٤

داوا كرد كافره ! بزانێ یان نەزانێ ئەگەر نەزانێ وەك چەند جار باسمان كردوه ئەگەر كەسێك پێی وت موعەزەبیش ئەبێ لەسەری ئەگەر ئەوكەسە بزانێ ئەوە موعەزەبە واتا ئەگەر نەزانێ موشرێكیكە (غير المعذب) هەتا ئەزانێ هەتا ئیقامە حوجەی لەسەر ئەكرێی ئەگەر بزانێ ئەوە موشریك موعەزەبە واتا موشریك لەسەر دوو بەشە :

*موشریكێكی موعەزەب .

*موشریكێك موعەزەب نیە .

ئەها خوای گەورە ئەفەرمووێی (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[١] خوای گەورە ئەفەرمووی : : ئێمە عەزابی كەس نادەین ! هەتا پێغەمبەری بۆ نەنێرین یان دەعوەی پێغەمبەرەكەی پێی نەگا ! بەلاَم پێش ئەوە هەر كافره ئاگادار بە ئایەتەكە وەكو چەند جار باسمان كردوه باسی ئەوە ناكا بلێ كافر نیە كافره بەس ئایە موعەزەبە یان موعەزەب نیە ئەگەر حەقیقەتی پێی گەیشت موعەزەبە حەقیقەتی پێی نەگەیشت لەسەر ئەو جەهالەتە رۆیشت ئەوە كافرێكە رۆژی قیامەت خوا تاقی ئەكاتەوە ! ئەوها ناچێتە بەهەشتەوە بەم شێوازە ئەبێ تاقی بكاتەوە ! بەلاَم ئایە پرسیارێك دێتە كایەوە ئەمرۆ ئەم نەزانینە هیچ عوزرێكی بۆماوەتەوە لەناو كۆمەلگای ئێمەدا ! ؟ ئەو هەموو عیلمە هەیە ئەو هەموو تێ گەیشتنە كابرا ناچێت بەداوایدا بگەرێی واتا كابرایەكی موعریضە لەبەداواچوونی زانستەكان بەداوا چوونی زانستی تەوحید.

شێخ (فوزان ) ئەفەرمووێی :

(له دعوة الحق) یانی چی ؟ (أي العبادة الصحيحة كما قال تعالى : أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ)[٢] بزانن دین خالص نەبێ پوختە نەبێ خوا قبولی ناكا ، لێرەدا با ئیشارەتێك بە ئیخلاص بكەین :

ئیخلاص : واتا پوختە كردنی عیبادەت بۆ خوا ! نابێ بەشی كەسی لێ بدەی مەبەستت هیچ شتێك نەبێ تەنها (الله) نەبێ ! مەبەستت ریاء و سومعە بێ یان شیركی أكبره و أصغر لەعیبادەتەكە خوا قبولی ناك ئاگادارین ئەگەر أكبر بوو بە ئەبەدی بۆ جەهەنم ئەگەر

[١] : سورة الإسراء اية :١٥
[٢] : سورة الزمر اية : ٣

أصغريش بوو خوا لەو شيركە خۆش نابێ وەكو تاوانە گەورە كان نيە محوى كاتەوە إلا ئەبێ تۆ حەسەناتى گەورەت هەبێ تا بيسرێتەوە ! ئێستا تۆ جارى واهەيە كبائير ئەنجام ئەدەى كبائيرەكە ئەسرێتەوە بەچ ئايەتەك خواى گەورە ئەفەرمووێى ئەسرێتەوە !( إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ )[1] بەس ئەو سيئەيە شيركى بەرناكەوێت ئاگاداربە يانى ئەو شيركە ناچێتە ضمنى ئەو يانى إلا ئەبێ تۆ حەسەناتى راجيحەت هەبێ يانى محو نابێتەوە بەس ئەگەر حەسەناتى راجيحەت هەبێ حەسەنات واتا عيبادەتى زۆرت هەبێ كەوا (فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَٰزِينُهُۥ)[2] لەبەر ئەوە شيركى أكبر لێخۆشبوونى بۆ نيە ! ئاگادار بە ئەبێ تەوبەى لێ بكەى ئينجا بەتەوبە ئەسرێتەوە تەوبە نەكەى ناسرێتەوە ! شيركى أصغرەيش بەهەمان شێوە بەلاّم چيە موجيب خلود بۆ ئاگرى جەهەنەم واتا دائيمەن كابرا ئەسوتێت لەئاگرى جەهەنم هى أكبر بەس هى أصغر ناء ئەگەر حەسەناتى راجيحەى هەبێ بەقەدەر ئەوە ئەسوتێنرێى و دێتە دەرەوە ! لەشيركى أصغر شيركى أصغر وەكو وتمان قەولى صەحيح ئەوەيە خواى گەورەلێ خۆش نابێ إلا ئەبێ تۆ حەسەناتى راجيحەت هەبێ جا لێرەدا خاليص پوختە كردن ئەبێ بزانرێى :

يەكەم: ئەبێ شيرك بخوێنى بۆ ئەوەى نەكەويە ناويى بۆئەوەى نەبى بەموشريك.

دووەم: ئەبێ ئاگادارى عيبادەتەكانت بى ئيخلاصى تێدابكەى بۆخوا رياء و سومعە نەخەيتە ناو ئيشەكانت يانى لەبەر خاترى خەڵك بۆ ئەوەى بتبێنن يان بۆئەوەى گوێيان لێ بێ خوا پەنامان با بۆيە عولەمايان ئەفەرموون ئيخلاص زۆر زۆر عەزيزە ئاگاداربن هەرشتێكت كرد ئەبێ بۆخوايە داوات لێ ئەكەم ئەمە لەبەر خاترى تۆ بكەم ئەگەر زانيت پاڵنەرەكەت خوا نەبوو مەيكە نييەتى خۆت تەواو خاوێن بكەرەوە ئينجا ئيشەكەت بكە ! (والله جل وعلا لا يقبل إلا دعوة الحق يعني الدين الخالص) واتا دەعوەى خالص نەبێ دينى خالص نەبێ خوا قبولى ناكا (أما الذي يعبد الله ويعبد معه غيره فهذه دعوة شرك لا يقبلها الله. ) ئەوەى كەوا لەگەل خوادا غەيرى خوا بپەرسترێى داوا بكا هەرچى جۆرێى لەبەرشەكانى عيبادەت بكات ئەوە خواى تبارك وتعالى لێ قبول ناكات .

[1] : سورة هود اية : ١١٤
[2] : سورة القارعة اية : ٦

(وقوله : ﴿وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ﴾[1] یانی ئەوانەی کەوا عیبادەتیان بۆ ئەکرێی لەغەیری خوای تعالی (عام في كل من دعي من دونه سواء من الملائكة أو من الرسل أو من الصالحين أو من الأصنام أو من أي شيء) سەیریکە هەرکەسێك کە ئەپرسترێت هەرکەسێك کە ئەپەرسترێی هەرکەسێك هەرشتێی ئەپرسترێی لەغەیری خوای تعالی ئەوە عامە یان نا ! هەرکەسێك داوای لیێ بکرێی یان عیبادەتی بۆ بکرێی یان هاواری بۆ بکرێی یان بەقسەی بکرێی یان پەیرەویی لێبکرێی لەغەیری خوا ! مەلائیکەبێ رسول بێ صالحین بێ ئەصنام بێ یان ئەلێن (أو من أي شيء) دەستور بێ یاسا بێ ئەوەی ئەمرۆ قەومایەتی بێ دیموکراتی بێ لیبرالیەت بێ دەولەی مەدەنیەت بێ ئومەمی موتەحیدە بێ ئەمریکا بێ ئەوروپا هەرشتێك لەوبابەتانە پەنا ئەگرین بەخوا خوای تعالی ئەوانە قبول ناکا (وقوله: ﴿لَا يَسۡتَجِيبُونَ لَهُم بِشَيۡءٍ﴾[2] یانی (أي لا يستجيبون لمن دعاهم بشيء لأنهم عاجزون لا يقدرون على شيء) ئەوانەی کە ئێوە هاواریان بۆ ئەکەن ئەوانە ناتوانن وەلامتان بدەنەوە خوای گەورە ئەفەرمووێی (﴿وَمَنۡ أَضَلُّ مِمَّن يَدۡعُواْ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَن لَّا يَسۡتَجِيبُ لَهُۥٓ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِ وَهُمۡ عَن دُعَآئِهِمۡ غَٰفِلُونَ ۝ وَإِذَا حُشِرَ ٱلنَّاسُ كَانُواْ لَهُمۡ أَعۡدَآءٗ وَكَانُواْ بِعِبَادَتِهِمۡ كَٰفِرِينَ﴾)[3] خوای گەورە لەو ئایەتە پێمان ئەلێ هەرکەسێك تۆ داوای کەی لەغەیری خوا بێ ئاگایە لەتۆ لەرۆژی قیامەتیش کافرە بەو عیبادەتەی تۆ ئەی کەی ! ئینکاریت لێ ئەکا ئەلێ بۆ داوای منت کرد ! خۆمن نابێ داوام لێ بکرێت ، جا ئەو خەڵکە بابێنێتە بەر چاوی خۆی کە ئەلێ (یارسول الله) ﷺ [4] رۆژی قیامەت پێغەمبەر ئەبێ بەدووژمنت ئەلێ بۆ داوای منت کرد بۆ داوات لەخوا نەکرد ! یان ئەلێ (یا صحابە یان یا تابعین یان یا ئەولیاء ،،،،،)یان کە ئەلێن (یاغوس)[5] هانا بردن تەنها بۆ خوایە ئەوانە هەموویان لەرۆژی قیامەت ئەلێن ئێمە بێئاگابووین لەئێوە یەکەم وە دووەمیش ئێمە کافرین بەوعیبادەتەی کە ئێوە کردووتانە کەواتە (﴿خَسِرَ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةَ﴾)[6] کابرا دونیاشی لەدەست دەرچووە ئاخیرەتیشی لەدەست دەرچوو لێرە باسی ئیشارەت بەوە ئەدەین بۆچی موئەلیف

[1] : سورة الرعد اية :١٤
[2] : سورة الرعد اية : ١٤
[3] : سورة الأحقاف اية : ٥-٦
[4] : أستغفر الله / ماموٚستا تەوبەی کرد .
[5] : ئەم کەلیمەیە کوفرە وشیرکە
[6] : سورة الحج اية : ١١

ئەوەی هێناوەتە پێشەوە كەوا ئەڵێ ئەوان إقراریان بە ربوبیەت كردوە بەس إقراریان بە عبودیەت بۆلای خوای گەورە نەئەكرد بەتەنها ئەویش نەك عیبادەتی بۆ نەكەن بەتەنها بۆئەویان نەئەكرد بۆ خوایان ئەكرد بۆ غەیری خواشیان ئەكرد بەخالصی شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) ئەیەوێت ئەو شوبهانە رەتكاتەوە كە لەزەمانی ئەودا دروست بووە تەبعەن هەر زەمانێك شوبهەی خۆی هەیە لەزەمانی شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) ئەو عالم و ئەومامۆستا ئاینی و ئەوخەڵكەی كە خوێندەواری دینی ئیسلامی هەبووە و رۆژوو و نوێژو عیبادەت ئەكا دواتر داوا لەغەیری خوا ئەكا دێن كێشەیەك دروست ئەكەن بۆ ئەم دەعوەی شێخ(محمدی كوری عبدالوهاب) رەحمەتی خوای لێ بێ كە ئەلێن تۆ هەلەی موشریكینی زەمانی پێغەمبەر ﷺ ئەصلن بڕوایان بەوە نەبووە كە خوا رەبیش بوە ! كە خالق بوە ئاگاداری ئەو خاڵیە هەن ! بەڵێ قورئان سەرلەبەری پڕە لەدەلیل كە رەدی ئەم جۆرە قسانە ئەداتەوە بەس ئێستا بابێن بزانین شوبوهاتی ئەوان چیە ! ئەوان ئەلێن : نا بۆیە خوای تبارك وتعالی ئەوانی بەموشریك و كافر لەقەلەم داوە لەبەر ئەوەی ئەوانە بڕوایان بە ربوبیەتیش نەبوە چ جای الالوهیەت ئایا وایە بابزانین دەلیلەكانیان چیە ! بۆ نمونە :ئەلێن سەیریكە خوای گەورە فەرموویەتی : (وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسۡجُدُواْ لِلرَّحۡمَٰنِ قَالُواْ وَمَا ٱلرَّحۡمَٰنُ)[1] ئەوەتا ئەوەتا ئەمە بەكێ ئەوترێ موشریكی زەمانی پێغەمبەر ﷺ ئەگەر پێیان بوترێ سەجدە بۆ رەحمان بەرن ، ئەوان ئەلێن (مانعریف الرحمن) ئێمە رەحمان ناناسین ئێمە خوامان نەزانیوە ناوی رەحمان بێ ! رەحمان چیە تۆ داوا مان لێ ئەكەی سجدەی بۆ بەرین لێرەدا ئەبێ زۆر ورد بین ئەمە یەكێكە لەو شوبوهانەی كە ئەوان ئەلێن كاكە ئەصلەن بڕوایان بەوە نەبوە و بڕوایان بەخوا نەبوە ! ئەها ئێمە هەموو جاری ئەلێ ئەوان بڕوایان بەخوا هەبووە كە دروستی كردوون كەدونیایی دروست كردوە بەس عیبادەتیان بۆ خوا و بۆ غەیری خوا گێراوەتەوە خوا لەسەر ئەوە بەموشریكی داناون ، كەواتە كێشەكەیان كێشەی الالوهیەت بوو یان ربوبیەت ؟ ئێمە ئەلێن الالوهیەت ، ئەوان دێن بەحیساب مامۆستا و شارەزا و عالەمەكانی لەزەمانی (محمدی كوری عبدالوهاب) هەتا ئێستا ئەلێن نەكاكە ئەوە نەبوو بابەتەكە ئەوان هەر بڕوایان بەخوا نەبوە باشە بابزانین وایە ! ئەوان ئەلێن بڕوابوون بەخوا

[1] : سورة الفرقان اية :٦٠

کافیه بزانی که ئەو دروستی کردووی ئەوه تۆ ئیتر موسلمانی ئەوه تۆ ئیتر موحیدی یانی تعریفی تەوحید بەوه ئەکەن (لا اله ) یانی (لا خالق الا الله) خالق نیه إلا الله ) ئایا ماناکەی وایه ؟ نەء (لا یانی لا مئلومه لا معبوده لا متبوعه لا موتاعه الا الله) ئەوان ئەڵێن نا (لا خالق ، لا رازق ، لا موحیه لا مومیته الا الله) یانی خالق ورازق ئەگەر تۆ ئیعتقادت وابێ که خالق و رازق و موحی و مومیت غەیری خوایه ئەو کات تۆ کافر ئەبی ئەوه کافر بوونەکەیه ! ئینجا ئەمه شوبهەتەکانیانه !

یەکێکی تر لەبەلگەکانیان :

تەبعەن ئەو ئایەتەیان هێناوه ئەڵێن (أشهيد أن الكفار انكر وكفر بارحمن ) ئەوه نیه لەئایەتەکه ئینکاری رەحمانیان کردوه ئەوەیەك ،دووەم (وَهُمۡ يَكۡفُرُونَ بِٱلرَّحۡمَٰنِ)[1] کەواته بڕوایان بەخوا نەبووه ! ئەوەش وردبن بزانه ئەم شوبوهاتانه چۆن رەد ئەدەینەوه ئەڵێ وتویانه کافرەکان کوفریان کردوه به ربوبیەتی خوا ! که خالق و رازقه .

شوبهەیەکی تریان : ئایەتێکی تر ئەهێنەوه (وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِي ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ)[2] ئەوان ئەڵێن ئەها موجادەله ئەکەن لەخوا دا ! یانی چۆن موجادەله ئەکەن لەگەل خوادا کافرەکانی زەمانی پێغەمبەر ﷺ (وموضوع المجادلة هي الربوبية)ئەڵێن ئەمه ربوبیەته وتویانه خوا ئێمەی دروست نەکردوه موجادەلەکه لەوێدایه یانی (یجادلون أن الله لیس ربً وإنما معه أرباب)ئەڵێن ربێکی خالص نیه بەلکو (أربابه)ئەربابی لەگەلدایه ئەمه یەکێکی تره لەشوبهەکانیان .

شوبهەیەکی تر با بهێنین : (وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًا)[3] ئەڵێن ئەوەتا ئەوه ئایەته لەسەر ئەوەی کەوا خوای گەورە فەرموویەتی ئەو پێغەمبەرانه ئەمرتان پێی ناکەن که مەلائیکه و پێغەمبەران بکەن به ئەرباب کەواته ئەوان کردویانه به ئەرباب (أربابا) چیه واتا خالق رب یانی خالق جا ئەم خالانه زۆر گرینگه که ئێمه باسیان ئەکەین جیاوازی لەنێوان کەلیمەی (رب لەگەل الاله)شێخ (فوزان ) بەتفصیل باسی ئەم بابەته ئەکا پێشەوه بچینه لەسەر ئەو ئەم شوبوهانه ئەخوێنین و رەدیشی ئەدەینەوه جا ئەچینه سەر

[1] :سورة الرعد اية : ٣٠
[2] : سورة الرعد اية :١٣
[3] : سورة ال عمران اية :٨٠

شەرحەکەی شێخ(فوزان) ئەوان ئەلێن (وهوم أتخذو أربابا) یانی ئەوانە کراون بە (رب) (ورب هو خالق) یانی ئەوانە هاتوون ئەمەیان کردوە بەخوا دروستکار یانی ! وە(رب)یش خالقە (وهذه الاياة تدلوا على الدونيا تدلوا أن قريش كفر فى ربوبية) ئەوە دەلیلە لەسەر ئەوەی قوریش لەربوبیەتدا کافربوە نەك لە الالوهیەتدا .

شوبهەیەکی تر : (فَلَا تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ أَندَادًا)[1] خوای گەورە نافەرمووێی ئێوە (نید) واتا هاوێنە بۆ خوای تعالى دروست مەکەن ودامەنێن ئەلێن ئەوان بۆیە کافر بوون (لئن اتخذوا أندادا من دون لله ) یانی لەغەیری خوا هاوێنەیان دروست کردوە بەو واتایەی کە ئەلێ خیلاصەی شوبهەکەیان ئەلێن کوفرەکەیان کوفر بوە لە ربوبیەتدا .

ئینجا یەك یەك با رەدی ئەو شوبهانە بدەیەنەوە :

رەدی یەکەم شوبهە : کە ئەلێ : (وَإِذَا قِيلَ لَهُمُ ٱسْجُدُوا۟ لِلرَّحْمَٰنِ قَالُوا۟ وَمَا ٱلرَّحْمَٰنُ)[2] لێرەدا با سەیری شوبهەکە بکەین ئایا کێشەی ئەوان ئەوە بوو کە ئینکاری ناوەکە بکەن یاخود ئینکاری موسەماکە بکەن یانی خوا خۆیی جل وعلى ! ؟ یانی ئێمە (أسم و مسما)مان هەیە ناو ناوە بۆ زاتێك ئایە ئەوان ئینکاری ناوەکەیان کردوە یان زاتی ناوەکەی زاتەکەی کەناوەکەی پێی ناسێنراوە سەیرکەن نمونەیەك ئەهێنینەوە : لەزەمانی صولحی عودەیبیە کاتی صولحی عودەیبیە لەصولحی عودەیبیە کاتێك کەهاتن صولحەکە بنوسن سوهەیل چی وت ؟ کە پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)[3] وتی چی ؟ وتی نەء ئێمە نازانین رەحمان کێ یە (بسمك اللهم) کەواتە ئینکاری لە (الله)بوو یان لەناوەکە بوو ! ؟ ئینکاری لەناوەکە نەبوو إقراریان بە(الله) هەبوو کەواتە ئەوە نەبوو کەوا بلێن خوا نییە بلێن خوای تبارك وتعالى بەتاك و تەنها (رب)نیە کەسیتری لەگەلدایە نەخێر ئینکاریان لەوە بوو کە ئێمە نەمانزانیوە خوا ناوی رەحمان بێ کەواتە ئینکاری زاتی خوا ناکەن کە خوا خالقە ! ئاگاداری ئەو خاڵەبن زۆر گرینگە.

---

[1] : سورة القبرة اية :٢٢
[2] : سورة الفرقان اية :٦٠
[3] : سورة الفاتحة اية : ١

ردەی شوبهەی دووەم : ((وَهُمۡ يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ)[1] ئەوان کەموجادەلە ئەکەن لەخوای تعالی لەچیدا موجادەلەکە ئەکەن ئەمان ئەلێن لە ربوبیەتە نا ئاخر لەالالوهیەتە لەالالوهیەتدا موجادەلەیان کردوە (وَهُوَ شَدِيدُ ٱلۡمِحَالِ) یانی چی ؟ یانی خوای تبارك وتعالی زۆر زۆر بەدەسەلات و بەقوەت و بەبطشە کەوا سەرپێچی بکات (ٱلۡمِحَالِ) بەمانای (شديد الحول والقوة) خوا زۆر بەقوەت و بەهێز و توانایە بەوەی کەوا سزای ئەو کەسەبات کە سەرپێچی فەرمانەکانی بکات موجادەلەی ئەوان لە الالوهیەت و لەبەحڤدابوو ئێمە زۆر جار لەسورەتە مەککیاندا ئەلێن سورەتی مەککەیان سێ خالێ زۆر گرینگی تێدایە :

*رەد دانەوەی موشریکین بۆئەوەی کە قبولی الالوهیەتیان نەکردوە نەك ربوبیەت .

*ریسالە .

* معد.

ئینکاری ئەو سێ شتەیان کردوە ئینکاری الالوهیەت کەتەنها بۆ خوا بێ ئەویش نەك هەر الالوهیەت نەبێ بۆ خوا نا چونکە (الله) بۆخۆی معنای الالوهیەتی تێدایە (أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًا)[2] کێشەکەیان ئەوەیە ئەصلەن لەربوبیەتدا کێشەیان نەبوو لە الالوهیەتیشدا إقراریان ئەکرد بۆ خوا بەلاَم لەگەل ئەو کەسانیتریان دا ئەنا خوای تعالی ئەفەرمووێی : ئەلێ لەگەل من نابێ کەسیتر دابنێن کەواتە (يُجَٰدِلُونَ فِى ٱللَّهِ) [3] یانی چی ؟ موجادیلەکەیان چی بوو لەگەل پێغەمبەرﷺ ئەوەبوو کە چۆن ئەبێ ئێمە تەنها عیبادەت بۆ خوا بگەرێنینەوە کەسانیتریش هەن عیبادەت ئەکرێن ئەوانە شوفەعان بۆخوای تعالی بەس ئەوان ناویان نان شوفعاء باشە ئەمە کێشەکەیان بوو ئەمە موجادەلەکەیان بوو .

رەدی شوبهەی سێیەم : (وَلَا يَأۡمُرَكُمۡ أَن تَتَّخِذُواْ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةَ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ أَرۡبَابًاۗ)[4] یانی چی ؟ خوای تعالی باسی ئەوەمان بۆ ئەکا پێغەمبەران کاتێك کەخوا ناردونی بۆ ئەوەی عیبادەت بۆ خوا بکرێت وایە یان نا ! ئایا ئەو پێغەمبەران ئەمریان بەکەس کردوە کە مەلائیکە و نەبی بن بە أربابا کەلیمەی (أربابا) کێشەی ئەم قبوری و ئەو موشریکانەیە کەباسی ئەکەن بزانین

[1] : سورة الرعد اية :١٣
[2] : سورة ص اية :٥
[3] : سورة الرعد اية :١٣
[4] : سورة ال عمران اية :٨٠

(أرباب) یانی چی ؟ (أرباب) بەمانای الاه دێی بەمانای (رب) نیە یانی چی (رب) بەمانای (خالق و رازق) بەمانای چیە ؟ (الاله)ئلوه معبود واتا مانای (أرباب) (الالهة تعبد من دون لله ) پێغەمبەران هاتوون بلێن مەلائیکە و پێغەمبەران بپەرستن لەگەل خوادا و لەغەیری خوا ! شتی وایان وتوە شتی وایان نەوتوە کەواتە لێرەدا قسەکەی ئەوان رەت ئەکرێتەوە بلێن کێشەکەی ئەوان کێشەی رەب بوە نەك الاه بوە .

یەکێکی تر لە شوبهەکانیان : کە خوای گەورە باس دەکا کە دەلالەت لەوەدەکا کە نیزاع لە الالوهیەت بوە نەك ربوبیەت خوای گەورە لەئایەت بە صریح بۆمان باس ئەکا ئەلێ (وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشۡرِكُونَ)[1] سەیری ئەو ئایەتەکەن بەوردی (وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ) واتا زۆربەی زۆری ئەوانەی کە ئیمانیان بەخوا هەیە إلا ئەوانە إلا موشریکن ! یانی ئیمانیان بە ربوبیەت هەیە موشریکن لە الالوهیەتدا ! (وَمَا يُؤۡمِنُ أَكۡثَرُهُم بِٱللَّهِ) لەلایەنی ربوبیەتەوە إلا لەلایەنی الالوهیەتەوە موشریکن یان خوای گەورە ئەفەرمووێی (فَلَا تَجۡعَلُواْ لِلَّهِ أَندَادًا)[2] (أندادا) لەچی و لەچیە لەربوبیەتیش و لە الالوهیەتیشە نابێ (أندادا) دابنێ بەهیچ شێوەیەك لەکاتێکدا ئەوان لە الالوهیەتدا ندیان داناوە .

لەدوای ئەمە شێخ (فوزان)دێت باسی ئەوەمان بۆ ئەکا کە ئەبێت ئێمەی موسلمان لە کەلیمەی (رب ، الاله) تێ بگەین چیە بۆیە ئەلێ :

## (فائدة في بيان معنى الرب والإله)

بابزانین مانای رب و الآله چیە بەکورتی ئەلێن : (رب) لەگەل (الآله)ئەگەر پێکەوە باسکران هەردووکیان هەریەك مانا ئەدا ئەگەر یەکێکیان باس کرا هەردوو ماناکە ئەگەێنی وەکو ئیسلام و ئیمان ئەلێ : (الله جل وعلا في القرآن ذكر الرب في مواضع) خوای گەورە لەقورئان لەچەندەها شوێن باسی (رب)ی کردوە (وذكر الإله في مواضع) (الاله)یشیان باس کردوە (خذ مثلا سورة الناس يقول سبحانه وتعالى : بسم الله الرحمن الرحيم (قُلۡ أَعُوذُ بِرَبِّ ٱلنَّاسِ ۝١

[1] : سورة يوسف اية:١٠٦
[2] : سورة القبرة اية :٢٢

مَلِكِ ٱلنَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ ٱلنَّاسِ)[1] سەیرکە (رب الناس وإله الناس) هەردووکی باس کرد فەرق چە لەنێوان (رب الناس وإله الناس) (فما الفرق بين رب الناس وإله الناس ؟ هل هما بمعنى واحد ؟) ئایا (رب و الآله)یەك مانای هەیە (إذا يكون الكلام مكررا) کەواتە کەلامەکە دووبارەبوویەوە (أوأنهما بمعنيين فلابد من معرفة الفرق بينهما) یان جیاوازە لەنێوانیاندا (وكثيرا ما يأتي ذكر الرب كقوله تعالى : قُلْ مَن رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ ٱلسَّبْعِ وَرَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٨٦﴾ سَيَقُولُونَ لِلَّهِ)[2] تۆبلێ کێ دروستکاری ئاسمانەکان و زەوییە ! دروستکاری هەر حەوت ئاسمانەکەیە ؟! وە کێ پەروەردگار و دروستکاری عەرشی گەورەیە؟! ئەلێن (الله) . ئەلێن خوا دروستی کردوە (فتكرر لفظ الرب وتكرر لفظ الإله فما معنى كل منهما ؟) ئەمە ئێستا دووبارەبوویەوە بابزانین مانای چیە !

(فالرب معناه المربي لخلقه بنعمه ومغذيهم برزقه تربية جسمية بالأرزاق والطعام ، وتربية قلبية روحية بالوحي والعلم النافع وإرسال الرسل. ) مانای رب ئەوەیە کە خوای گەورە ئەو خەڵکەی پەروەردەکردوە بەنیعمەتەکانی خۆیی خواردنی داونەتێ بەریزقی خۆیی پەروەردەی کردوون و جسمی پەروەردەکردوون دلی پەروەردەکردوون بەپەروەردەکردنێکی رۆحی وەحی بۆناردوون ژیانی خستۆتە ناو دلیانەوە کە قورئانە عیلمی نافع واتا زانستی بەسوودی داونەتێ پێغەمبەرانی بۆ ناردوون .ئەمە تەربیەتە لەلایەنی خوا ئەمە ئیشی رەبە !.

(ومن معاني الرب أنه المالك للسماوات والأرض فرب الشي مالكه والمتصرف فيه)مانایەکی تری ئەوەیە کە خاوەنێتیە خاوەنی هەموو ئاسمانەکان وزەوییە کەواتە (رب شئ ) واتا مالك متصرف لەوشتەدا خاوەنیەتی و ئەتوانێ تەصەروف تێدابکا (ومن معاني الرب المصلح الذي يصلح الأشياء) ئەوەی کەوا شتەکان چاك ئەکا (ويدفع عنها ما يفسدها) ئەوشتەی کەوا خراپی ئەکا لێ دوورئەخاتەوە (فالله سبحانه وتعالى هو الذي يصلح هذا الكون وينظمه على مقتضى إرادته وحكمته سبحانه وتعالى. )خوای گەورە ئەم کەونەی رێك خستوە بەرێك و پێکی ئەهێنی و ئەیبات ناهێڵێت تێك بچێ ئەگەر خوا نەبێ تێك ئەچێ ئەمە مانای رەب.

---

[1] : سورة الناس اية :١-٣

[2] : سورة المؤمنون اية : ٨٦-٨٧

مانای (الاله)( أما الإله فمعناه المعبود من أله) ئاگاداربن ئەو فيعله ئاوها ظبط كەن (أله يأله بمعنى عبد يعبد) (فإله) إله چيه : (معناه معبود) مانای پەستراو پەيرەويى لێكراو بەقسەكراو (إله)ئەوەيە تۆ بەقسەی بكەی پەيرەويى لێ بكەی عيبادەتی بۆ بكەی ئەوە ماناكەيەتی (وليس معناه الرب) مانای (إله) مانای (رب) نيه (وإنما معناه المعبود) يانی پەرستراو بەقسەكراو پەيرەويى لێكراو (والإلهية هي العبادة والوله هو الحب) كەليمەی (والوله) لەزمانی عەرەبيدا مانای حوبە بەمانای خۆشەويستی بۆ ئەو كەسە (لأنه سبحانه وتعالى يحبه عباده المؤمنون ويخافونه ويرجونه ويتقربون إليه) لەبەر ئەوەی عەبدەكانی خۆشيان ئەوێت وە لێ ئەترسن وە هيوايان پێی هەيە وە خۆيان لێ نزيك ئەكەنەوە بەعيبادات (هذا هو معنى الإله) ئەوە مانای (الاله)بوو .

(فتبين الفرق بين معنى الرب ومعنى الإله)ئێستا زانيم مان (رب)واتا دروستكار ،يانی بەڕێوبردنی كاروبار يانی ڕێكخەری كاروباری عەبدەكان و ئاسمان وزەويی مولكەكەی خۆيی يانی ئەو خوايەی كەوا ئيش وكاری بەندەكانی ڕێك وپێك ئەكا لەرزق ورۆزووی و ژيان و مردن ئەوانيتر ،،، بەرنامەيان بۆ ئەنێرێتە خوارەوە بۆ ئەوەی لەسەری برۆن ئەوە ئيشی ربوبيەتە ، مانای الالوهيەت ئەوەيە : كە ئەبێ بپەرسترێی بەقسە بكرێی و پەيرەويی لێ بكرێی (وأنهما ليسا بمعنى واحد) كەواتە يەك مانای نەبوو (ومن قال إنهما بمعنى واحد فقد غلط)ئەوەی كەبلێ يەك مانای هەيە هەلەی كردووە (والعلماء يقولون إذا ذكرجميعا) عولەما ئەلێن ئەگەر هەردووكی باسكرا پێكەوە ئەگەر (رب و إله)پێكەوە باسكرا وتمان (الرب والاله) (صار الرب له معنى والإله له معنى) كەواتە ئەگەر لە جومەلەيەكماندا هەردوو وشەی (رب وإله)مان هێنا بەيەكەوە هەريەكەيان مانايەكی هەيە (وإذا ذكر واحد دخل فيه معنى الرب) بەلأم ئەگەر بەتەنها يەكێكيان باسكرا مانای ئەويش دەچێتە ناويی نمونەيەك ئەهێنينەوە تۆ سەيری قەبر بكە لە سوئالی قەبردا لێت ئەپرسرێی (من ربك) يانی چی ؟يانی (من الآهك) هەردووكی ئەگرێتەوە يانی (من ربك ومن الآهك) هەردووكی ئەگرێتەوە دروست كاری تۆ پەرستراوی تۆ كێ يە ؟هەردووكی ئەگرێتەوە (أما إذا ذكرا جميعا مثل ما في سورة الناس فإنه يكون للرب معنى وللإله معنى آخر) ئەگەر پێكەوەش باسكران هەريەكێك مانايەكی هەيە (كما في لفظ الفقير والمسكين) نمونەيەكمان بۆ ئەهێنيتەوە شێخ ئەفەرمووێی : فەقير و

مسكین ئەگەر وترا فەقیر و مسكین پێكەوە باسكران فەقیر كێ یە و مسكین كێ یە ؟ ئەوە هەرەیەكێ مانایەكی هەیە ئەگەر وتمان فەقیر ئەوە ئەویش دەگرێتەوە (إذا ذكرا جميعا كما في قوله تعالى : إِنَّمَا ٱلصَّدَقَٰتُ لِلۡفُقَرَآءِ وَٱلۡمَسَٰكِينِ)[١] ئەوەتا هەردووكی باسكراوە یان نا كەواتە هەریەكێكیان مانایەكی هەیە ماناكەی چیە (صار للفقير معنى وللمسكين معنى) فەقیر مانایەكە و مسكین مانایەكە (فالفقير هو الذي لا يجد شيئا) فەقیر ئەوەیە كە هیچی نیە ،( وأما المسكين فهو الذي يجد بعض الكفاية) مسكین هەیەتی بەس بەشی ناكا ئەوەیە یەكێكە لەماناكان كەواتە وەكو یەك وابوون ماناكەی یانی فەقیر حالی خراپترە لەمسكین ،مسكین هەندێی حالی لەو باشترە بەلاّم هەردووكیشیان نەدارن (فالمسكين أحسن حالا من الفقير) مسكین باشترێكە لەفەقیر ، ئێمە ئەگەر نمونەیەك یان دەلیلێك بۆ ئەم قەولەی شێخ بهێنینەوە لەسورەتی الكهف دەستمان ئەكەوێی (أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتۡ لِمَسَٰكِينَ)[٢] سەفینەشیان هەیە و مسكینیشن ئەزانی ئەوە نمونەی چیە ؟ مەسەلەن پینج شەش مسكین سەیارەیەك ئەكرن تا إستفادەی لێ بكەن ئایا ئەو تەكسیە كارو باری رۆژانەیان جێ بەجێ ئەكا پێنج شەش مسكین سەیارەیەك بكڕن ! بەشیان ئەكا نەخێر بەتەئەكید بەشیان ناكا وابەشی كەسێك ناكا چ جای ئەوەی پینج شەش كەس هەیان بێ ،سەفینەی بەم شێوەیە خوای گەورە دەلێ چەند كەسێكی مسكین خاوەنی سەفینەیەك بوون ناوی بردن بە مسكین كەواتە هەیانە یان نیانە هەیانە بەلاّم بەشیان ناكات (ومثل لفظ الإسلام والإيمان) هەروەها ئیسلام و ئیمانیش (إذا ذكر الإسلام والإيمان صار الإسلام معناه الأعمال الظاهرة والإيمان معناه الأعمال الباطنة)ئەگەر ئیسلام و ئیمان پێكەوە باسكران ئیسلام یانی عیبادەتەكانی كە بەدیارن وەكو نوێژ و رۆژو وتاعەتەكان ئەگەر ئیمان باسكرا لەگەل ئیسلامدا یانی ئەو ئیمانەی كەلەدلی ئینساندایە (كما في حديث جبريل : قال : أخبرني عن الإسلام . قال: الإسلام أن تشهد أن لا إله إلا الله وأن محمدا رسول الله وتقيم الصلاة وتؤتي الزكاة وتصوم رمضان وتحج البيت إن استطعت إليه سبيلا)[٣] ئەوە باسی تەفسیری ئیسلامی كرد بەشتە دیاردەكان

---

[١] :سورة التوبة اية :٦٠

[٢] :سورة الكهف اية :٧٩

[٣] : مسلم الإيمان ) ٨ (، الترمذي الإيمان ) ٢٦١٠ ( ، النسائي الإيمان وشرائعه ) ٤٩٩٠ .

بالأركان الظاهرة)بەرووکنە ظاهیرەکان (قال : أخبرني عن الإيمان . قال: أن تؤمن بالله وملائكته وكتبه ورسله واليوم الآخر وتؤمن بالقدر خيره وشره)[1] (فسره بالأعمال الباطنة وهو إ يمان القلب)ئەوە ئەگەرپێکەوە باسکران ، ئەی ئەگەر بەتەنها باسکران (هذا إذا ذكرا جميعا صار لكل واحد معنى وإذا ذكر أحدهما وحده دخل فيه الآخر) ئەگەر بەتەنها وتمان ئیمان ئەبێ بلێ والله ئیمان پەیوەستە بەداخلەوە نەء ئیمان ناخیشە و دەریشە هەردووکیانە ئیسلامیش بەهەمان شت ئێستا کە خوای گەورە ئەفەرموێی : سەربارەت بە ئیسلام ئەوەی کە غەیری ئیسلام هەلبژێریی لێ وەرناگیرێی (وَمَن يَبْتَغِ غَيْرَ ٱلْإِسْلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقْبَلَ مِنْهُ)[2] ئەوە بەمانای چیە ؟ هەردووکیەتی ، یانی ئیمان و ئیسلام .

(ومن هنا نعرف الفرق أيضا بين توحيد الربوبية وتوحيد الألوهية)ئالێرەدا جیاوازی و فەرقی نێوان ربوبیەت و الالوهیەت دەرکەوت ربوبیەت مەبەست لەچیە وە الالوهیەت مەبەست لەچیە (فتوحيد الربوبية هو الإقرار بأن الله هو الخالق والرازق) ربوبیەت ئەوەیە کەوا کەوا خوا خالق و رازقە ئەو ئینسانی دروست کردوە ئەو بوونەوەری دروست کردوە ئەو دروستکارە ئێمە دروستکراوین ئەوە ربوبیەتە (المحي المميت) ئەژێنی و ئەمرێنی (أي الاعتراف بأفعال الله سبحانه وتعالى) دان بنێن و بیسەلمێنین کەوا خوای تعالی ئێمە و بوونەوەری هەمووی دروستکردوە (وتوحيد الألوهية معناه إفراد الله بأعمال العباد التي يتقربون بها إليه مما شرع)تەوحیدی الالوهیە ئەوەیە تۆ خوا بەتەنها بپەرستی واتا ئیشەکانی خۆت هەمووی بۆ خوا بگەرێنیتەوە نەیدەیت بەکەسیتر سەمع و تاعە گوێرایەلی زەلیلی پەرستن نوێژ و ڕۆژوو تاعەت چۆن نوێژەکەت تەنها بۆ خوا ئەکەی ئەبێ داواکەشت بۆ خوا بێ چۆن داواکەت تەنها بۆ خوا بێ ئەبێ نەزرەکەشت بۆ خوا بێ ئەبێ هەمو قروبات و نزیکبونەوەکانت بۆخوا بێ بۆ کەس نەبێ لەوانە ئەوەی کە ئەمرۆ زۆر خەڵك تێدا تووشی گێژاو بووە بەقسە کردنی شەرعەکەی خوای گەورە دێت شەرعێکی تری داناوە لەگەل شەرعەکەی خوی گەورە خوای گەورە ئەفەرموێی (شَرَعُوا۟ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمْ يَأْذَنۢ بِهِ ٱللَّهُ)[3] خوا ئەبێ تەشریع دابنێ نەك عەبد تەبعەن کە ئەلێن خوا ئەبێ تەشریع دابنێ ئەو ڕێنمای ئێمە ئەکا ئێمەی خلق کردوە و

[1] : مسلم الإيمان ( ٨) ، الترمذي الإيمان ( ٢٦١٠ ) ، النسائي الإيمان وشرائعه ( ٤٩٩٠ )
[2] ;سورة ال عمران اية :٨٥
[3] : سورة الشورى اية :٢١

هیدایەتیشمان ئەدا (ٱلَّذِی خَلَقَ)[1] ئەو خوایە کە خەلقی کردوە هیدایەتیش ئەدا بەلاَم ئەبێ تۆ هیدایەت لەغەیری ئەو وەربگریی ئەگەر هیدایەتت لەغەیری ئەو وەرگرت شەریکت بۆ خوا قەراردا ئەوە لەتەشریعدا هەرووەکو چۆن بلێ لەگەل خوادا خوایەکی تر ئەم بوونەوەرەی دروست کردوە (هذا معنى توحيد الألوهية فهناك فرق بين توحيد الربوبية وتوحيد الألوهية وما دمنا قد عرفنا معنى توحيد الربوبية وتوحيد الألوهية نأتي إلى حالة المشركين الذين بعث إليهم رسول الله . ﷺ)ئێستا ئێمە ئەوەمان زانی تەوحیدی ربوبیە چیە وە تەوحیدی الالوهیە چیە ، تەبعەن ئەم تەقسیمە ئاگاداربە هەندێك هەن ئیعراف پێ ناکەن شوبوهاتیان هەیە ئەلێن لەکوێی ئەمە هاتوە ئەمە تەقسیمێکی إصطلاحیەئاگاداربن یانی عولەمایانی عقیدەی ئیسلامی هاتوون کەسەیری قورئانیان کردوە تەماشایان کردوە خوای گەورە لەقورئاندا باسی چیمان بۆ ئەکا، باسی ئەوەمان بۆ ئەکا کە کافرەکان ئیعتراف بەوە ئەکەن کە خوا ئەوانی دروست کردوە چەندەها ئایەتمان هەیە لەسەر ئەوە ئەگەر تۆ لێیان بپرسی کێ ئەرز و ئاسمانی دروستکردوە ئەلێن خوا ! ئەی باشە بۆ بەقسەی ناکەن یەکسەر لێرە تەوحید بوو بەچەند بەشەوە کەواتە !؟ تەوحیدی ربوبیە و الالوهیە ئەی تەوحیدی ئە سماء صیفات کە بەشی سێیەمە ئەوەش لەباسی لەهەموو سیفەتەکانی خوا کە لەقورئان باسکراوە نابێ کەسی تێدا بەشدار بکەی ئەمە تەوحیدی ئەسماء صیفات وە عولەما هەیە تەوحید ئەکا بە دووبەشەوە تەماشاکەن لەلایەنی إصطلاحەوە موشکیلەمان نیە ئەیکا بەدوو بەشەوە ئەلێ تەوحیدی خەبەریی تەوحیدی طلەبی :

یەکەم :تەوحیدی خەبەریی :ربوبیە و ئەسماء صیفات پیکەوە گرێی ئەدا خوای تعالی خەبەر ئەدا لەخۆیی بۆ ئێمە کە من خوای ئێوەم ئەوەش ئەسماء وصیفەتەکانم ئەوە خەبەریی .

دووەم : تەوحیدی طلەبی : طلەبی ئەوەیە کە تۆ عیبادەت بۆ ئەو بکەی .

بەم شێوە تەوحیدەکە کرا بەدوو بەشەوە ربوبیە و ئەسماء صیفات لەژێر خەبەریدا جێ ئەبێتەوە وە الالوهیە طلەبیە .

[1] :سورة ابراهيم اية :٣٢

هەیە ئەڵێت سێ وەکو ئەوی ئێستا باسمان کرد ربوبیە و الالوهیە و ئەسماء صیفات .هەیە ئەڵێت چوار تەوحیدی إتباعیش واریدە لەلای عولەمایان ئەڵێن بەڵێ تەوحیدی الالوهیە ئەوەیە ئەبێ بۆخوا ئیشەکە بکەیت و موتابەعەی پێغەمبەربکەیت ﷺ بەڵام دێن ئەیکەن بە قسمی چوارەم بۆ ئەوەی إهتمامی پێ بدرێت کە ئەبێ تجریدی موتابەعە بۆکێ بێت ؟ بۆ رسول الله بێت ﷺ چۆن تجریدی ئیخلاص بۆخوا ئەکەی بەتاقی تەنها ئیخلاص پوختەئەکەیەوە بۆ خوای تعالی ئەبێ شوێن کەوتنیش پوختە بکەیتەوە بۆ پێغەمبەر ﷺبۆچی؟ تاگرینگی بە دوورکەوتنەوەی لەبیدعەکان بدرێت ئەڵێن تەوحیدی إتباع ،واتا تەوحیدی (الالوهیەت وربوبیەت و ئەسماء صیفات و إتبارع) هەندێك دێن باسی تەوحیدی حاکمیەت ئەکەن تەوحیدی حاکمیەت سەیرکەن ئەگەر بێتوو کەلیمەی حاکمیەت بێنین لەسەر ئەو ئایەتانەی کە حوکم تەنها هی خوایە وەکو مانا هیچ کێشەمان نیە ،ئایا لەکۆنا عولەما ئەم تەوحیدی حاکمەیەیان بەشێوەیەك لە شێوەکان جیاکردۆتەوە لە تەوحیدەکانیتر سەیرئەکەین هەیە خستۆتیە ژێر ربوبیەتەوە هەیە خستۆتیە ژێرالالوهیەتەوە بەڵام هەردووکیان دروستە، ئەگەر بەربوبیەت بلێن لەولایەنەی کە تەوحیدی حوکم حوکمرانیەت تەنها بۆ خوایە لەربوبیەتدا (أَلَا لَهُ ٱلۡخَلۡقُ وَٱلۡأَمۡرُ)[1] واتە: ئیشی خوای پەروەردگارە کەوا شەریعەت دابنێی ئەوە ئیشی ئەوە ئەفعالی خوا نابێ کەسیتر ئەو ئیشە بکا ، لەلایەنی الالوهیەتەوە تەحاکم بۆ کێ بکەین ئێمە ؟ بۆخوا ئەکەین ئەوە عیبادەت نیە ئێمە ئەیکەین ئەو عیبادەتە بۆ غەیری خوا بێ شیرکە یان نا لەولایەشەوە لەکێ جێگای بوویەوە لەتەوحیدی الالوهیەت جێگەی بوویەوە ،ئەگەر تۆبیهێنی بەتەنها بلێ تەوحیدی حاکمیەت مەبەستەکەت ئەوە بێ تەنها خوا بپەرستین تەشریعی ئەو بەرێوە بەرین جێ بەجێ بکەین سەبارەت بەئایەتەکانی قورئان چ موشکیلەیەکت هەیە نەخێر بەعکسەوە ئەبێت وابێت ئەگەر وانەبێت تۆ موشریکی ! (وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا)[2] چەندەها ئایەتمان هەیە دەربارەی حوکم کەنابێت تۆ شەریك بکەی بەرامبەر بەشەریك تەوحیدە (وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا)خوای گەورە شەریك پەیاناکا لە حوکمیدا خوا کەس ناکا بەبەشدار لەحوکمی خۆیدا

[1] :سورة الأعراف اية :٥٤
[2] :سورة الكهف اية :٢٦

كەواتە نابێ تۆش بەشداری بكەی بەشداری كەس بكەی لەو حوكمرانيەتيە ئەبێ تەنها خوای تعالى حوكمرانمان بێ نابێ ئيعتراف بەكەسيتر بكەی حوكمرانيمان بكا ،بەڵام لێرە كێشەيەكی گەورەيان دروست كردوە لەسەر ئەوە كە نەخێر ئەمە بيدعەيە وە ئەم تقسيمە لە سەلەفەوە نەهاتوە كەكاتێك ئێمە سەيری دينەكەمان ئەكەين هەمووی تەوحيدە يەكخواپەرستيە چ لەروانگەی (الربوبيه والالوهيەت و ئەسماء صيفات و إتباع و حاكميەت و حوكمرانی )بێ هەمووی ئەبێ تۆ يەك خوا بپەرستی جا هەندێك ئەلێن لە هيئە كباری عولەما لە لجنەی دائيمدا شێخ (بن عثيمين) رەدی داوەتەوە لەتەوحيدی حاكميەت ئەوی كەوا بلێ (ضال والمضيل) ئێمە ئەگەر سەيری فتواكان بكەين نەقد لەتەوحيدی حاكميەت وەك نقد لەگەرانەوەی شەريعەت و حاكميەت بۆ خوای گەورە نييە لەولايەنەوە ! ئاگاداربن چونكە إقراری حاكميەتەكە كراوە لەهەردوو فتواكەدا سەيربكەين بەس ئايا كراوە بەبەشێك لەبەشەكان جيابكرێتەوە ياخود مەبەستێكی كەيی پێی هەبێ كابرا بلێ ئەبێ يەك حاكم هەبێ لەسەر زەميندا ئێمەش ئەزانين ئەگەر يەك حاكم نەبوو لەسەر زەميندا بەدينی خوا ئێشكا لەچەندها ولات و ولاتی موسلمانان عولەما فتوای ئەوەياندا وە كە هەر جێگەيەك لەوشوێنانە ئەگەر حاكمی جياواز جياواز هەبوو هەمووی بەشەريعەتی خوای گەورە حوكمی ئەكرد پێويستە ئەو خەلكە سەمع و تاعەيان بۆ بكەن چونكە كاتی وا هەبووە لەسەر زەويدا بەتأكيديش يەك حاكم نەبووە چەندها حاكم هەبوە ئايا ئەبێ مەسلەحەتی حوكمرانيەتی ئيسلامی پێشێل بكرێی بگەرێنەوە بۆكەلامی عولەمدا لەكاتێكدا كە ئەگەر بێتوو حاكمێكی موسلمان هەموو موسلمانی بەرێوە نەبرد ولاتەكان بەش بەش بوون لەهەموو ئەو ولاتانەدا ئەبێ حاكمێك هەبێ بەدينی خوا ئيش بكا وە ئەبێ ئەوخەڵكە سەمع وتاعەی بۆ ئەو حاكمە هەبێ مادەم بەكيتابی خوا بيانبات بەرێوە .پاشان ئەلێ (نأتي إلى حالة المشركين الذين بعث إليهم رسول الله ﷺ فإنهم كانوا مقرين بالنوع الأول الذي هو توحيد الربوبية ولم يدخلهم في الإسلام) ئەوان يعترافيان بەتەوحيدی ربوبيەت كرد بەڵام خستيەناو ئيسلامەوە ؟ نەخێر (بل اعتبرهم الرسول ﷺ كفارا مشركين)پێغەمبەری خوا ﷺ بەكافر و بەموشريكی دانان (وقاتلهم وهم يقرون بتوحيد الربوبية) شەريشی لەگەلدا كردن لەكاتێكدا ئيمانيشيان بەخوا هەبوو كە دروستكارە (فهم أقروا بتوحيد الربوبية وجحدوا توحيد الألوهية لما طلب منهم أن يفردوا الله

بالعبادة ويتركوا عبادة الأصنام قالوا) کاتێك کەوا ئەوان بڕوایان بەوە هەبوو کەوا خوا بەتاك وتەنها ئەوانی دروست کردوە بەڵام عیبادەتیان بەتەنها بۆ خوا نەئەگەڕاندەوە بۆ خوا بۆ غەیری خوایان ئەگەڕاندەوە پێغەمبەرﷺ داوای لێکردن بەتەنها عیبادەت بۆ خوا بگەڕێنەوە ملکەچی و زەلیلی تەنها بۆ خوا بیّ واز لەعیبادەتی ئەصنام بێنن ئەصنامیش بریتی بوو لەو رەمزانەی کە ئەوان ئەیان وت پیاو چاکن و باشن لەلای خوا شەفیعن نەك بۆ خودی بەردەکەی بکەن هەبوو بۆخودی بەردەکەشی ئەکرد بەس زۆربەیان بۆ ئەرواحەکانیان ئەکرد ئێستا هەموومان ئەزانین(ود وبغوس و سواع ونصر) کەخوا لەقورئاندا باسی کردوون ئەمانە لەئەصلدا حجەر نەبوون پیاو چاك بوون دواتر تمیسالیان بۆ دروست کراوە کەواتە ئەوان داوا لەرۆحەکان ئەکەن (أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ)[1] ئەیانوت عجيب ئەیان وت چۆن ئەبیّ ئێمە بەس بلێن بۆخوا ئاخر ئەی پیاو چاکان ئەوانیش رێزیان هەیە لەلای خوا نزیکمان ئەکەنەوە لەلای خوا ئاخر یەکەم ئەوانە صالحن دووەم نزیکمان ئەکەنەوە لەخوا (لأنه قال لهم قولوا لا إله إلا الله) پێغەمبەرﷺ پێی وتن بلیّ (لا اله)واتە : ئێمە بەهیچ شێوازێك ئیعتراف ناکەین بەهیچ پەرستراوێك بەهیچ پەیرەویی لێکراوێك بەهیچ بەقسەکراوێك بەهیچ کەسێك زەلیلی خۆمانی بۆ دەربرین (إلا الله) نەبیّ کە ئەوان تیّ گەیشتن لەمانای ئەو کەلیمەیە (فهم فهموا معنى لا إله إلا الله وهو أنه لا يعبد إلا الله وحده لا شريك له) یانی ئەوان تیّ ئەگەیشتن پێغەمبەر ﷺ چی لەوانی داوا ئەکرد (فهم فهموا معنى لا إله إلا الله) ئەیانزانی ئەوە یانی چی ئەیانزانی کە نابیّ تۆ لە (الله) زیاتر داوا لەکەسیتر بکەی (وهم لهم أصنام ولهم معبودات كثيرة لا يريدون تركها والاقتصار على عبادة الله) بەلام ئەوان نەیان دەویست (لات و مەنات عوزا و هوبەل و نصر) تەرك بکەن ئەیان وت لەگەل خواشدا ئەمانەش داوا ئەکرێت (وهذا لا يرضيهم ولذلك أنكروا وقالوا) لەبەر ئەوە ئینکاری دەعوەی پێغەمبەریان کرد ﷺ وتیان (أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ)[2] ئایە هەموو ئالیهەکان ببێت بەیەك ! چۆن ئەبیّ ! (طلب منا أن نعبد الله وحده) داوا مان لیّ ئەکا کەئێمە تەنها (الله) بپەرستین بەتەنها ئەیپەرستین بەس لەگەل ئەودا ئەوانەش داوا ئەکەین بۆ ئەوەی نزیکمان بکەنەوە لەخوای تعالى ئائەمە بەهیچ

[1] سورة ص اية :٥
[2] سورة ص اية :٥

شێوەیەك قبول نەکراوە لەلای پێغەمبەر ﷺ خوای گەورە فەرمووی ئەمە شیرکە هەروەها ئەیان وت: (ونترك عبادة اللات والعزى ومناة وهبل وغيرها من الأصنام هذا شيء لا يعقل عندهم) ئەیان وت نا ئێمە عقلمان نایبرێی هاوار ئەکەین بۆ ئەمانە بۆ ئەوەی نزیکمان بکەنەوە لەخوای تعالى (مَا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِي الْمِلَّةِ الْآخِرَةِ)[1] ئێمە لەباو باپیرانمان شتی وامان گوێی لێ نەبوە (ملة آبائهم فهذا احتجاج بما عليه آباؤهم)ئەوان باوباپیرانی خۆیان کرد بە بەلگەیان ئەمرۆش با تەماشاکەین بەهەمان شێوە رێبازی باو باپیران کراوە بەرێباز یان نا ؟ ئێمە تەماشای هەرکەسێك بکەین لەوانەی ئێستا رێبازی پێشوانیان کردوە بەرێبازی خۆیان ئەوە (لینینە و مارسك و سارکەر) فلان وفلان ،،،لەهەموو بەشەکانیتردا هەریەکەی قدوەیەکیان هەیە هەریەکەی رێبەرێکیان هەیە هەریەکەی خوان رێبازێکیان هەیە چۆن ئەبێ ئێمە باوباپیرانمان تەرك کەین یانی کاتێك کە تۆباسی ئیسلامی راستەقینەیان بۆ ئەکەیت ئەوان دێن ئەلێن باوباپیرانمان وایان نەکردوە ئێستاش لەوان خەلکیدا کاکە ئەوەی تۆ ئەیلێت گوێمان لێ نەبوە باپیرانمان کوا شتی وایان وتوە یانی بەهەموو جۆرەکانیەوە چ جۆری عیبادەت و داواکردن چ جۆری تەشریع و یاسادانان بێ (الحجة الملعونة التي احتجت بها الأمم من قبل إذا دعوا إلى عبادة الله)ئەو بەلگە نەعلەت لێکراوەی کەوا هەرکەسێك تۆ داوای کەی بلێ بەتەنها خوا بپەرستە ئەلێ نا باوباپیران نا رێبازەکەمان نا فلان وفلان (حتى فرعون يقول)هەتا فیرعەونیش وتی (فَمَا بَالُ الْقُرُونِ الْأُولَىٰ)[2] ئەوان لەپێش ئێمەدا ئەورێگەیان گرتۆتە بەر کوا شتی وامان گوێی لێ نەبوە کەتۆ داوای ئەکەی عیبادەت تەنها بۆ (الله)بکرێی (فهم لما فهموا معنى لا إله إلا الله استغربوا هذا واستنكروه وتواصوا برفضه وفي الآية الأخرى يقول سبحانه فيهم : إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٣٥﴾ وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ)[3] کاتێك لەمانای (لا اله الا الله) تێ گەیشتن زۆریان پێی غەریب بوو ئینکاریان کرد وە ئەوان یەکتریان ئامۆژگاری ئەکرد کەوا رەفزی بکەن ئەها کوتلە دروست ئەکەن حیزب دروست ئەکەن جماعات دروست ئەکەن کۆمەلگا دروست ئەکەن وەرن با بەهەموومان دژایەتی ئەوە بکەین وەك ئەمرۆش ئەیبینین ئەمرۆ چەندەها کۆمەلگا و حیزب وفیرەق هەیە

[1] :سورة ص اية :٧
[2] :سورة طه اية :٥١
[3] :سورة الصافات اية :٣٥-٣٦

كە هەموویان لەسەر یەكشت كۆبونەتەوە موتەفیق هەموویان لەسەر یەكشت كۆبونەتەوە كە دژایەتی (لا اله الا الله)بكەن نابێ تەنها خوا بپەرسترێی ئەبێ بەشەرەكان بپەرسترێی بەقسەی بەشەرەكان بكرێی ئێمە رێباز بۆخۆمان دابنێن (یقول سبحانه فیهم : إِنَّهُمْ كَانُوٓاْ إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ)ئەگەر هەركاتێك پێیان بوترێی بلێن (لا اله الا الله) نابێ لە (الله) زیاتر بپەرسترێی ئەوان چی ئەكەن إستكبار ئەكەن إستكبار یانی چی ؟ لەو (لا اله الا الله)یە خۆ بەزل ئەزانن وەهەروەها لەو كەسەشی كە ئەو (لا اله الا الله)یەی هێناوە تەكەبووری لەسەر لێ دەدەن (وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ)[1] ئێمە چۆن ئەوپەرستراوانەی خۆمان بەجێ بهێلین بۆ شاعیرێكی شێت بە پێغەمبەریان ئەوت ﷺ ئەمرۆش هەركەسێك ئەو دەعوەیە بكات وای پێ ئەلێن ئەگەر تۆ بەراستەقینە دەعوەی ئیسلام بكەی لەواقیعی ئەمرۆماندا چیت پێ ئەلێن ؟ جێگات ئەبێتەوە لەكۆمەلگای ئەمرۆدا ؟! ئیسلامی راستەقینە بێنی كەنابێ لەغەیری (الله)زیاتر بپەرسترێی وە نابێ بەقسە بكرێی پەیرەویی لێبكرێی پێت ئەلێن كاكە تۆ لەسەر زەوی جیگات نابێتەوە تۆ شێتی ! برۆ بۆ ئەو كێوی دەشتە ! (وهذا یبین معنی لا إله إلا الله تماما ویوضحه ویقطع الجدال) كەواتە ئەمە مانای (لا اله الا الله) بەجوانی ئاشكرا كرد ئەو ئایەتە وەهەروەها هەموو جیدالێكی بریی هەموو موناقەشەیەكی كۆتایی پێ هێنا (فإن فیه ردا علی من غلط في معنی لا إله إلا الله) كەواتە مانای (لا اله الا الله) ئەو كەسەی بەهەلە لێ تێ گەیشتوە ئەمە مانا كەی بۆ روون كردینەوە بەرامبەر بەوكەسانەی كەوا هەلە تێ گەیشتوون (فعلماء الكلام في مقررا تهم وعقائدهم یقولون لا إله إلا الله معناها لا خالق ولا رازق ولا قادر علی الاختراع إلا الله هذا معنی الإله عندهم. )موتەكەلیمون عولەما ئەوانەی كەوا (نحو وصەرف و بەلاغە وعلومی مصطلاح علومی اصول فقهە ،،) لەم عیلمانە عیلمی كەلام لەدینی ئیسلامدا ئەمە عیلمی عقیدەمان هەیە عیلمی تەوحیدمان هەیە عیلمی سونەمان هەیە عیلمی شەریعەمان هەیە نەك كەلام ئەوان كەعالمن لە فەلسەفات ولەحیسابی خۆیان حیكمەتی خۆیان هێناویانە مانای (لا اله الا الله)بەچی بۆ إعراب ئەكەن ! (لاخالق ) بەچی بۆت مانا ئەكەن (لا خالق) (لاخالق موجد الا الله) ئەوە هەلەیە (لا اله الا الله) واتا (لا معبود بالحق الا الله) پەرستراو نیە پەرستراو هەیە و

[1] :سورة الصافات ایة :٣٥-٣٦

زۆر زۆریش هەیە بەلام حەق نیە لا اله بحق واتا پەرستراوەكان هیچیان حەق نیە تەنها (الله) نەبێ ئەوە مانای (لا اله الا الله)یە ئەوان ئەلێن (لا خالق) واتا دروستكراو نیە ، (ولا رازق)رزق دەرنیە (ولا قادر)بەتوانا نیە (علی الاختراع) لەسەر داهێنان (الا الله) (هذا معنی الإله عندهم) ئەوە مانای (اله) لای ئەوان ئەو مانایە هەلەیە (لااله الا الله)مانا كەی ئەوەیە بلێ پەرستراو بەقسەكراو پەیرەویی لێكراو نیە بەحەق هەیە بەس بەحەق نیە (الا الله) نەبێ .

((یقول شیخ الإسلام ابن تیمیة رحمه الله تعالی " : والحاذق منهم من یقولیاني)یانی كابرا زۆر زۆر شارەزا بێ ئەلێ چی :( الإله هو القادر علی الاختراع)تەعریفی ئیلاهت بەچی بۆ ئەكا ئەوەی كەبەتوانایە لەسەر داهێنان(وهذا غلط وجهل كبیر باللغة وبالشرع المطهر إذ معنی الإله المعبود)شێخ الاسلام ئەفەرمووێی ئەمەش هەلەیە ئەمە نەزانینێكی زۆر زۆر گەورەیە لە زمانی عەرەبی تۆ كەلیمەی (اله)بەمانای چی مانا بكەی بەمانای خالق ومختریع نەخێر بەمانای معبودە واتا پەرستراو بەقسەكراو پەیرەویی لێكراو (الذي تألهه القلوب وتخضع له وتتقرب إلیه)كە ئینسان ئەیپەرستێی وەخۆیی بۆ زەلیل ئەكا وەخۆیی لێ نزیك ئەكاتەوە )[1]

(فهم لم یفهموا معنی الإله ولذلك یقولون لا إله إلا الله ویكثرون ، ولهم أوراد في اللیل والنهار یرددونها ) ئەوانەی ئەمرۆ مانای (لا اله الا الله) نازانن كەواتە موشریكینی زەمانی پێغەمبەر ﷺ ماناكەیان ئەزانی وبەلاّم قبولیان نەئەكرد ئەوەی ئەمرۆمان ماناكەی نازانێ ئەیلێ بەزمان بەس ماناكەی نازانێ ئەكەوێتە شیركەوە (ویكثرون)یانی زۆرن ئەلێن (لا اله الا لله) بەس ئاگاداربە ئەم وتنە سوودی نیە مادەم ماناكەی نازانێ مادەم جێ بەجێ ماناكەی نازانێ (ولهم أوراد في اللیل والنهار یرددونها) زیركی بەیانیان و ئێوان چەندەها زیكر ئەخوێنن (ومع هذا یعبدون القبور والأضرحة ویستغیثون بغیر الله عز وجل) یانی ئێوە سەیری ئەو چوار كەلیمەیە بكەن كە (حب الكلام الی الله)[2]یە هەر هەمووی پەیوەستە بە (الله)ەوە سەیریكە (سبحان الله) خوا پاكە لەشریك خوا پاكە لەعەیب (الحمدلله)سوپاس بۆ ئەو خوایەی كە تەنهایە سوپاس بۆ خوا لەسەر هەموو نیعمەتەكان (لا اله الا لله) هیچ خوایەك شایستەی پەرستن نیە بەحەق (الاالله ) نەبێ (الله أكبر)(الله) لەهەموو گەورەیەك گەورەترە كەسی

[1] : ) انظر معنی كلامه في التدمریة ص ١٨٦ ، ١٨٥ ، تحقیق محمد بن عودة السعوي وفي مجموع الفتاوی ١٣\٢٠٣

[2] : (سبحان الله والحمدلله ولا اله الا الله والله اكبر)

هێشتەوە !؟ نەخێر کەچی ئەوەش ئەلێن لەگەل ئەوەشدا داوا لەقەبرەکان و پیاوچاکان وئەوانە ئەکەن ئەوەش ئەلێن کەچی لەگەل ئەوەشدا شوێن یاسا و ڕێسایی بەشەرەکان ئەکەون (فلم يفهموا معنى لا إله إلا الله وأنها تطلب منهم ترك عبادة القبور والأضرحة وعبادة ما سوى الله من الأصنام والأشجار والأحجار) ئەوە مانای ئەوەیە کە داوای ئەوەیان لیٚ ئەکا کە عیبادەتی هەموو ئەوشتانە بەجیٚ بهێلن مردوان زیندووان دار بەرد خۆر مانگ ئەستێرە زەویی هەموو شتێك مەلائیکە پێغەمبەران پیاو چاکان ناپەرستڕێی عیبادەت بۆ وان ناکرێی إلا بۆ (الله)نەبیٚ (فإذا قالوها لزمهم ترك عبادة الأوثان) ئەگەر ئەمەیان وت ئەبیٚ ئەوشتانە تەرك بکەن ئەگینا هەلیان وەشاندەوە ئەوەیە پێی ئەوترێی (نواقض لا اله الا الله) هەروەها ئەلێن ئەوکەسانەی کەوا ئەلێن (لا اله الا الله) ئەبیٚ دەستور و یاسا و شەریعەتی خوا جیٚ بەجیٚ کەن ئەگەر نا دەستور و یاسا و شەریعەتی بەشەریان جیٚ بەجیٚ کرد ئەوە (لا اله الا لله)کەیان هەلوەشاندەوە (والمشركون الاولون توقف والم يقولها)شێخ(صالح )ئەلیٚ ئەوانەی پێشوو نەیان دەوت بۆچی نەیان دەوت چونکە ماناکەیان ئەزانی کەتویان (لا اله الا الله) یانی تەواو شوێن (الله)نەبیٚ شوێن کەسیتر ناکەوین لە عیبادەت و لەسەمع و تاعە (الانهم قالوها لزمهم ترك عبادة الأوثان )ئەگەر بیان وتبایە ئەبوایە بتەکانیان وازلیٚ هێنابایە پیاو چاکانیان واز لیٚ هێنابایە مردووان و زیندووانیان واز لی ٚهێنابایە (أما هؤلاء فقالوها وعبدوا غير الله) ئەما موشریکینی ئەمرۆیی ئێمە ئەیلێن کەچی لەگەل ئەوەشدا چی ئەکەن شەیرکەکە هەر ئەکەن (فالأولون أحذق منهم)یانی چی واتا ئەوانەی پێشوو زیرەکتر و شارەزاتر بوون بەمانای (لا اله الا الله) (ولهذا يقول الشيخ : لا خير في رجل جهال المشركين أعلم منه بمعنى لا إله إلا الله. ) ئەلیٚ خێر نیە لەکەسێکدا موشریکە جاهیلەکان زاناتر بیٚ پێی بەمانای (لا اله الا الله) وەرە باورد بینەوە لەم کەلیمەیە خێر نیە لەکەسێکدا کەوا نەزانە موشرکەکان هی زەمانی پێغەمبەر ﷺ شارەزاتربێتن بەمانای (لا اله الا الله) لەمان ،

پرسیار ئەمەیە : ئەلی جهال ،موشریکینی ئەم زەمانەی بە نەفالم لەقەلم دا کەچیش ئەلیٚ (أعلم) ئەمەش چیە زانا ! جاهیلیشە و زاناشە ! چۆن ئەبیٚ ؟!

ئەلێن زانابووە بەماناکەی بەس جاهیل بوە بە عەمەل پێکردنی روونە ماناکەی ئەوان ئەیان زانی ماناکەی چیە ئیشیان پێی نەئەکرد کەواتە جاهیلن ئەگەر زانایەك ئیش بە عیلمەکەی

نەکا ئەوپەڕیی نەفامییە تۆ عیلمت هەبێ ئیشی پێ نەکەی بۆچی باشە پێغەمبەرچی ئەفەرمووێی ﷺ (اعوذبك من علم لا ینفع)[1] کە عیلمەکە نەفعی نەبوو پەنات پێ ئەگرم خوایە لەتۆ لەو عیلمەی کە نەفعی نەبێ ، بۆیە پێیان ئەڵێ جهالی موشرکین (أعلم)عالمە بەلام جاهیلیشە لەبەر ئەوەی ئیشی پێی ناکا کەواتە ئەصل بریتیە لە عەمەل ئاگاداربن ئەوەی ئەمڕۆ ماناکەی نازانێت لەبەر ئەوە شیرك و تەوحید تێکەلاو ئەکەن .

## (قتال رسول االله ﷺ لهم لیکون الدعاء کله والنذر الله)

شیخ محمدی کوری عبدالوهاب دەڵی: (وتحققت أن رسول الله ﷺ إنما قاتلهم لیکون الدعاء کله الله ، والنذر کله الله ، والذبح کله الله ، والاستغاثة کلها بالله ، وجمیع أنواع العبادة کلها الله)شێخ ئەفەرمووێ :بۆت ساغ بویەوە و بۆت دەرکەوت کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەل موشریکەکان دا جەنگی بۆئەوەی کەوا دوعا هەمووی بۆلای خوا ئاراستە بکرێیتەوە داوا لەکەس نەکرێت لەسەر ئەمە لەحەقی ئەوانە جەنگی کەوا ئەوان داوایان لەخوا و غەیری خوا ئەکرد ئەیفەرمووی ئەبێ دوعا هەمووی بۆ خوا بێ نابێ لەکەسیتر داوا بکەی وە نەزر هەمووی بۆ خوا بێ نابێ بۆ کەسیتر بکرێی هەروەها سەربرینی حەیوان ئەبی تقرب بۆ خوا بکرێی پی نەك بۆ کەسیتر هەروەها هانا بردن لەنارەحەتیەکانا بۆ خوا بێت تەنها هەموو جۆرەکانی عیبادات هەمووی بۆ خوا بێت شێخ صالح ئەفەرمووێ(أي لا یکون بعض ذلك الله وبعضه للبدوي ، وبعضه الله وبعضه للحسین ، لابد أن یکون الدعاء کله الله ، والذبح کله الله ، والنذر کله الله ، وسائر العبادات کلها الله ، وهذا هو الدین الصحیح) ئەفەرمووێی : نابێ تۆ هەندێکی بۆخوا بکەی وهەندێکی بۆ (البدی )وی کی بو؟

البدوی: ناوی (ئەحمەد البدوی)یەکابرایەکی شیعی باطنیە لەفاس لەدایك بووە لەمەغریب وەلە تەنتاء مردووە لەمیصر ئەمە لەمیصر مەولودی بۆ ئەکرێی سالأنە هەموو سالێك ئەمە لەژیانی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) باسمان کرد کەچی بۆکراوە لەکاتی خۆیی کە کاتی مەولودەکانی کەدێی بەقەدەر کێوی عەرەفە خەلك کۆئەبێتەوە لەمەولودەکەیدا هەتا ئەڵێ لەسالی (٩٩٦)باس ئەکا لەکیتابی (جمع علی توحید)لەلاپەرە (٤٨)باس ئەکا ئەڵێ ئەوانەی

[1]

ئامادەبووانی مەولودی نەبەویی بوون (٣) ملیۆن کەس بوون بەشەرتێك کابرایەکی شیعی باطنییە ! کافری غەداری موشریك بدووی !بۆ زانیاریتان ئەمانە ئەوانەبوون ئەحفادی ئەوانە بوون کەکاتی خۆی صەلاح الدین ئەیوبی دەری کردن لەمیصر دەولەتەکەی رووخاندن دەولەتی باطنی شیعی کە رووکەشیان رەفز بوو رووکەشیان کوفری محظ بوو واتا لەرووکەشدا خۆیان بە شیعەی عەلەوی ئەناساند دەولەتی فاطیمي درۆئەکەن تەبعەن لەناخیشیانا کافری تەواو بوون.

جاکاتیَ خۆی کە صەلاح الدین ئەیوبی (رەحمەتی خوای لیَ بیَ)وە بوو میصری لەژێر دەست دەرهێنان و تەفرووتونای کرد هەلتان رۆیشتن بۆ مەغەریب دواتر ئەحفادەکانیان بەرێگایی تەصەوف گەرانەوە ئەوە بوو یەك لەوانە (ئەحمەد البدوی) کەروویکردە (طنطاء) شارێکە لەمیصر ئێستاش لەگەلیدا بێت لەمیصر ئەوایە جا بزانە (٣)ملیۆن لەمەولودی ئەم کابرایە بلێت (یابدوی)یانی (٣)ملیۆن موشریك باسیش مان کرد کەوا ئەوانە چۆن هەتا لەکاتی لەمیصر ئەحفادەکانی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) کەلەمیصر مەولودەکانیان بینیوە بەچاوی خۆیان ، دەلێن خەلکانێکی زۆر وەکو حاجیان تەشبیە نەبێت چۆن لەکێوی عەرەفە کۆئەبوونەوە ئەوەها کۆئەبوونەوە ئەمە چیە وەلا مەولوودی نەبەوویە ! ئەی ئەو هەموو ئافرەتە چیە ؟ وەلا ئەوانە خۆیان نەزر کردوە بۆ رابواردن بۆ (بدوی)صدەقەی (بدوی) بێت ئینجا ئەمە زۆر لەهەموو شاروشارۆچکەیەك موسلمانانە زۆرە ئەمەی کە بەخۆمان ئەلێن موسلمان ملیارێك و ئەوەندەیە ئەبیَ چەندی ئائەلەو بابەتانە بیَ جارێی (٣) ملیۆنی لێرەدا رۆیی هەر لەیەك مولوددا ئینجا حیسابی تر بکە لەهەموو شارو شارۆچکە و ولاتێکانی ترا بزانە چەندی ئەمێنێتەوە خوای گەورە پەنامان بدات هەروەها بەعزێکی بۆخوا بۆ (حوسێن )بەخۆتان ئەزانن لە(نەجف و کەربالا)چی ئەکرێت ئێرانێکی گەورە و گران (الا مارحم ربك )بی زۆر بەی زۆری ئەوها موشریك وهاوار ئەکاتە (یاحسێن) (، لابد أن یکون الدعاء کله الله) ئەبی هەمووی بۆ خوا بیَ نابیَ بۆکەسیتر بیَ ئەو عیبادەتانە هەمووی بۆخوا بیَ ئەوە دینی صەحیحە هەرشتێك لەو دینە بۆخوا و بۆغەیری خوا ئەگەر زەرەیەکیش بیَ بۆ غەیری خوا قبولی ناکا (، أما أن تکون العباة مشترکة بین االله وبین القبور والأضرحة والأولیاء والصالحین فهذا لیس هو التوحید) ئەما ئەگەر عیبادەت ئاوها بەشداری تیا بکەی بۆخوا و بۆ غەیری

خوا بۆ قەبر وبۆ (بدوی ) بۆ فلان وبۆفلان ئەمە توحید نیە ئەمە یەكخوا پەرستی نیە توحید ناوەكەی لەخۆیەتی یانی ئەبی خوا بەیەك بزانی نابی چەند خوایەك بناسی وعیبادەتیان بۆ بكەی (بل هذا هو دین المشركین) شێخ یەكسەر تەسریحی ئەدا ئەڵێ ئەمە دینی موشركینە جا ئێستا بەداخەوە زۆر كەس كەلەبارەی مەسەلەی بەموشریك كردن و بەكافر كردن قسەئەكا ئەلی بە مطلقی ئەلی ئەوەی ئەوە بكات موشریكە بەس بە تعین نالێن نازانم چی ڕێگەیان لێ ئەگرێی بۆئەوەی بەتعین پێیان بلێ ئەوە موشریكە ! ئەی خوا نەیوتوە جل وعلی پێغەمبەر نەیووتوە ﷺ علمای ئیسلام نەیان فەرمووە ! ئەوەتا فتواكانی شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) فتواكانی ئەحفادی فتوای بن باز صەریحە لەوەی كە نەزانینیش ناخوا بەوە مەسئەلەیە ئەوكەسەی كەتۆتە ناوشیرك موشریكە ئنجا چەند جارتیكراری ئەكەینەوە ئەم بابەتە ئایەتە كەیان لێ تیك ئەچی كە خوای تعالی ئەفەرمووێ (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا )[1] ئێمە ئەلێن ئەو موشریكانەی كەنەیانزانیوە خوا تعزیبیان نادا هەتا إقامە حوجەیان لەسەر نەكرێت كەواتە موشریكە إقامە حوجەی لەسەرە بۆ ئەوەی توشی ئەگەر إقامە حوجەی لەسەركرا بۆئەوەیە تووشی عەزاب بێت جا ئەگەر لەدونیایا نەبوو لەئاخیرەت خوای تعالی تاقی ئەكاتەوە كەواتە فەرقە لەنێوان بەموشریك كردنیان فەرقە لەنێوان عەزابدانیان شەرط نیە هەموو كافرێك تعزیب بدرێی شەرت نیە هەموو كافرێكیش إقامە حوجەی لەسەر كرابێ ئەم خالە زۆر گرینگە شەرط نیە هەموو كافرێك تەعزیب بدرێی وە شەرط نیە هەموو كافرێكیش إقامە حوجەی لەسەر كرابێ كافر هەیە إقامە حوجەی لەسەر نەكراوە كافریشە ! چی ئەلێ بەو ئەفریقایانەی كە ئێستا دار و بەرد ئەپەرستن ! موسلمانن؟! كافرە ، بەلام إقامە حوجەی لەسەر نەكراوە یانی شایستەی عەزاب نیە خوا جل وعلی بەحیكمەتی خۆی بەعدلی خۆی عەزابیان نادات هەتا پێیاننەگا جا ئەگەر لەدونیادا پێیان گەیشت ئەوە مالە لەسەریان پێیان نەگەیشت ئەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژی قیامەت خوای گەورە تاقیان ئەكاتەوە ئەو یەهود و نصارایانەی كەئێستا لەسەر یەهودیەت و نصرانیەت ئەڕۆن ئێستا هەندێك ئەلێن هیچ نازانن ئایە ئەوانە حوكمیان چیە ؟! ئەوانە كافرن خۆ موسلمان نینە بەلام كەنازانن ئەو نەزانینە مانع نیە لەكافر كردنیان بەس

[1] :سورة الإسراء اية :١٥

مانعه له تعزيبدانيان ئەم خاڵە زۆر گرینگە تێ بگەیت بۆیە ئەوانە موشریكن خوا پەنامان با ئینجا لەولاتی ئیسلامیشا علماء  حوزر ناهێڵێتەوە لەولاتی ئیسلاما عوزریش نیە ئەبێ بگەرێی بەدوایدا ئەبێ بگەرێت بەدوای حەقیقەتەكەدا بۆیە بەشێخ بن باز ئەڵێن كەس هەیە إقامە حوجەی لەسەر بێ ئەلی مەگەر ئەوانەی لە ئەفریقا و لەوشوێنانەی كەهیچ ئاگایان لەدین نیە لەقورئان نیە لەزمانی عەرەبی نیە مەگەر ئەوانە ئەگەرنا عالەمی ئیسلامی هەمووی شەو رۆژ قورئان ئەدرێی بەگوێیانا شەو رۆژباسی پێغەمبەریان بۆ ئەكرێی ﷺ شەو و رۆژباسی (لا اله الا الله) یان بۆئەكرێی (بل هذا هو دين المشركين وإن كان صاحبه يعترف بتوحيد الربوبية ويصوم ويصلي ويحج ويعتمر إلى غير ذلك. )ئەوە دینی موشریكە با خاوەنەكەشی بلێ وەلا خوا منی دروست كردوە خوا ئاسمانی دروست كردوە خوا هەمووشتێكی دروست كردوە هەتا با رۆژو بگرێت با نوێژ بكات باحەج بكات با عمره بكا ئەوانە هەموو بەتاڵە لەبەر ئەوەی خوای گەورە فەرموویەتی (لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ)[1].

## (قرارهم بتوحيد الربوبية لم يدخلهم في الإسلام)

شێخ  محمدی كوری عبدالوهاب دەلی:(وعرفت أن إقرارهم بتوحيد الربوبية لم يدخلهم في الإسلام)زانیت كەوا إقرار كردنی ئەوان بەوەی كەوا خوا دونیای دروست كردوە ئەوانی دورست كردوە ئەوان بەوە نەچوونە ناو ئیسلام ئەوە نەیخستنە ناو ئیسلامەوە ، شێخ ئەلێ (أي لما كان إقرارهم بتوحيد الربوبية الذي ذكره االله عنهم وسجله عليهم لم يدخلهم في الإسلام ،) خوای گەورە خۆیی باس ئەكات لەقورئان لێیان بپرسن كێ ئەرز وئاسمانی دروست كرد ؟ ئەلێن : الله، ئایە خوا بەوە ناوی نان موسلیم و موحید نەخێر بۆ ؟ چونكە أعتراف ناكەن بە الالوهیەت ! یانی ئیشەكانیان خالیص بۆ خوا ناگەرێنەوە (دل على أن التوحيد المطلوب ليس هو توحيد الربوبية) جا ئەتوانین لێرە بلێن (فحسب) یانی دەلالەت لەوە ئەكا لەسەرئەوەی كەوا توحیدی مطلوب ئەو یەكخوا پەرستیەی كە خوا لەئێمەی داوا كردووە

[1] :سورة الزمر اية :٦٥

پێغەمبەر پێ وتن ﷺ بلێن (لا اله الا الله) ئەوان وتیان (أَئِنَّا لَتَارِكُوٓاْ ءَالِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ)[٢] ئێمە خواکانی خۆمان بەجێ بێلین بۆ شاعیرێکی شێت ! کە بەپێغەمبەریان ئەوت ﷺ والعیاذ بالله ناویان نابوو شاعیرێکی شێت ! خوای تعالی ئەفەرمووێی (بَلْ جَآءَ بِٱلْحَقِّ)[٣] نەخێر وانیە بەلکو ئەو بەقورئان هات بەتەوحید هات بەیەکخوا پەرستی هات ئەوەی کە ئەو هاتوە پێی ئەو پەیامەی ئەو خوا پێی ناردوە بریتیە لە تەوحید ویەکخوا پەرستی ئەوە حەقەکەیە (وَصَدَّقَ ٱلْمُرْسَلِينَ)[٤] ئەو پێغەمبەرە و پێغەمبەرانی پێش خۆیی عەمەلی ئەوان ودینی ئەوان سەلماندووە کە ئەوان دینیان راستەقینەیە وە ئەو تەوحید ویەکخواپەرستیەی کە پێغەمبەرانیش هێناویانە ئەم ئەیسەلمێنی ئەلێ کەوا رێگەی راستە دینی پێغەمبەران هەموو یەك دینە لەبەر هەموویان لەسەر (لا اله الا الله)ن ، (فهم فهموا معنى لا إله إلا الله) کەواتە کافرەکان تێی گەیشتبوون کە مانای (لا اله الا الله)چیە (وأبوا أن يعترفوا به)بەلآم ئیعترافیان نەئەکرد پێیان رازی نەبوون بیلێن (لأنه يلزمهم بترك عبادة الأصنام) لەپێش هەموو شتێك کە وتت (لا اله)یانی ئیلزام ئەکرێن واز لەهەرچی پەستراوی تر هەیە بهێنن ئیتر صەنەم بێ حەجەر بێ بەردبێت هەشتێك بێ زیندووان بێ مردووان بێ داربێ بەرد بێ ئاسمان بێ زەوبێ خۆربێ ئەبێ وازی لێ بهێنی (وهم لا يريدون هذا)ئەوانیش ئەوانەیان نەدەویست (وإنما يريدون البقاء على عبادة الأصنام)ئەیانویست لەسەر ئەوە بمێنەوە بۆیە هەر لەبیدایەتەوە نەیان دەوت (لا)(لا اله الا الله) نەیان دەوت (ولم يجرؤوا أن يقولوا لا إله إلا الله ويبقوا على عبادة الأصنام) جورئەتی ئەوەیان نەکرد کە ئەم قسەیە بکەن چونکە لەسەر عیبادەتی ئەصنام بمانایەتەوە ئەوەشیان بوتبایە ئەوە تناقوض بوو (لأن في هذا تناقضا وهم يأنفون من التناقض ، في حين أن كثيرا من المنتمين إلى الإسلام اليوم لا يأنفون من هذا التناقض) ئەوان جورئەتیان نەئەکرد ئەوە بلێن چونکە ئەیانزانی ئەمە بلێن یەکسەر بەدرۆ ئەکەونەوە یەکەسەر ئیشەکەیان درۆیە چونکە چۆن ئەبێ تۆ بلێ(لا اله الا الله) دوایش غەیری خوا بپەرستی ئەیانزانی ئەمە پێچەوانەیە ئەوانیش حەزیان نەئەکرد قسەکانیان پێچەوانەبێ بەلآم

---

[١] :سورة الصافات اية :٣٦-٣٧
[٢] :سورة الصافات اية :٣٦
[٣] :سورة الصافات اية :٣٧
[٤] :سورة الصافات اية :٣٦-٣٧

زۆربەی زۆری خەڵكی كە ئەمڕۆ خۆیی داوەتە پاڵ ئیسلام وبەناو ئەڵێ من موسلمانم ئەوان ئالەو تناقضە لەوپێچەوانەیە خۆیان بەبەرز ڕاناگرن بەداخەوە تنازول ناكەن لەوە (فهم يقولون لا إله إلا الله بحروفها)ئەوان بە حەرفەكانی ئەلێن (لا اله الا الله) یانی بەس حەرفەكانە (ولكنهم يخالفونها ويعبدون غير الله من القبور والأضرحة والصالحين بل والأشجار والأحجار وغير ذلك ، فهم لا يفهمون معنى لا إله إلا الله. )ئەمان ئەیلێن بەزمان بەكەلیمە ئەیلێن بەلاّم موخالەفەی ئەكەن ئەچن غەیری خوا ئەپەرستن ئینجا غەیری خوا قەبرە ئایە صالحینە ئایە دارو بەردە ئایە هەرچی شتێك هەیە ئەمڕۆ ئەو هەموو ڕێنمایی و یاسایی بەشەریی كە دانراوە كەدژی یاسایی خوای تعالی یە ئەپەرسترێی كابرا ئەڵێ (لا اله الا الله) ئەچێ یاسایی بەشەریی ئەپەرستێت ئەچێ بەقسەی كافران ئەكا بەقسەی یەهود و نەصارا و بەقسەی ئەورووپی و ئەمریكی بەقسەی غەیری دینی راستەقینەی خوای تعالی ئەكا ئەشلێ (لا اله الا الله) لەبەر ئەوەی مانای (لا اله الا الله )تێ نەگەیشتوە بەراستی چونكە ئەگەر ماناكەی تێ بگەیشتایە نەئەچوو وابكات خۆ ئەگەر تێ گەیشتبێ ئەوە بكا ئەوە تەواو عینادی ئەكا لەگەل بابەتەكە .

(فلا يكفي التلفظ بلا إله إلا الله) كەواتە بەس نیە بەزمان بلێن (لا اله الا الله) (دون علم بمعناها وعمل بمقتضاها) عیلمت نەبێ بەماناكەی ئیش نەكەی بەوەی كە (لا اله الا الله) پێت رائەسپێرێی لەو كارو كردەوانەی كە ئەبێت بە ئەكرك و ئەچێتە سەر شانت ئەبێ جێ بەجێ بكەیت (بل لابد من العلم بمعناها أولا) كەواتە ئەبێ یەكەمجار بزانی ماناكەی چیە (ثم العمل بمقتضاها) پاشان ئەبێت كاری پێ بكەیت (لأنه لا يمكن أن يعمل بمقتضاها وهو يجهل معناها)ناكرێی شتی وا كابرا ناكرێی ئیش بكرێی بەمقتضای (لا اله الا الله) بەلاّم ماناكەی نەزانیت (لا يمكن أن يعمل بمقتضاها وهو يجهل معناها)یانی ئەگەر كابرا ماناكەی نەزانێت ئیشی چی پێ ئەكات! ناتوانێت ئیشی پێ بكات (ولهذا يقول جل وعلا : ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ﴾[1] خوای تعالی بەپێغەمبەر ئەفەرمووێی ﷺ ئەی محمد ئەی پێغەمبەرەكەی خوا تۆ بزانە پێش هەموو شتێك(فَٱعۡلَمۡ) وەك وتمان كەلیمەیەكە

[1] :سورة محمد اية ١٩

لەپێش داخوازیەكانە لەپێش داواكارییەكانە لێت داوا ئەكرێی بۆئەوەی ئاگاداری خۆت بێت و وشیار بی كەوا چیت لیٚ داواكراوە و بزانە مانای (لا اله الا الله)چیە لەپێشدا بزانە (أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ) هیچ خوایە شایستەی پەرستن نیە بەحەق تەنا (الله) نەبیٚ دوای ئەوە (وَٱسۡتَغۡفِرۡ لِذَنۢبِكَ وَلِلۡمُؤۡمِنِينَ وَٱلۡمُؤۡمِنَٰتِۗ)[1] داوای لێبوردن بكە لەخوای تعالی لەتاوانەكانت وە دوای لێبوردن بكە بۆ باوەڕدارانی پیاوان و ژنان ،تەبعەن مەسئەلەی (ذنب) لێرە بەكورتی ئەوەندە باس ئەكەین پێغەمبەری خوا ﷺ پێغەمبەران هەموویان واتا ئایا ئەكەونە تاوانەوە ؟!

بەتەئكید تاوانی گەورە بەهیچ شێوەیەك ناكەونە ناویی كبائیریان نیە ئەی صاغیر و بچوك ؟ قەولی صحیح ئەوەیە ئەكەونە صغائیر و بچوك بەلاٚم بەردەوام نابن لەسەر صغائیر كە خوای تعالی ئاگاداری كردنەوە ئیتر بەردەوامی لەسەر صغائیر ناكەن ئەوە ئەو (ذنب)ەیە كە خوای تعالی ئەلێت داوای لیٚ خۆشبوون بكە لەخوای تعالی (فبدأ بالعلم قبل القول والعمل) ئایا ئایەتەكە پێش قەول و عەمەل پێش ئەوەی بلیٚ بكە ومەكە چی وت ؟! زانیاری هەبیٚ بە (لا اله الا الله) كەواتە ئێمە بەموسلمانان ئەلێن ئەی موسلمانان یەكەم شتێك تۆ پێی بویت بەموسلمان و چویتە ناو دینی ئیسلام (لا اله الا الله محمد رسول الله) یە وەرە جاری مانای ئەم دووفەقەرەیە بزانە ئینجا بزانە چیت لیٚ داوا ئەكرێت ئەگەر ماناكەی نەزانیت بەتەئەكید ناشتوانی پارێزگاری بكەی لەسەر ئەوشتانەی كە پێچەوانەی (لا اله الا الله محمد رسول الله)یە تۆلەكاتێكدا ئەلیٚ من ناپەرستم تەنها خوا نەبیٚ بەلێن بیٚ لەخوا زیاتر كەس نەپەرستم بەقسەی كەس نەكەم سەمع و تاعە بۆ كەس نەكەم تەنها بۆ بەرنامەكەی خوا نەبیٚ پێغەمبەر محمدیش ﷺ تەنها لەرێگەی ئەوەوە من عیبادەتیش ئەكەم عیبادەت ناكەم بۆ خوا تەنها لەرێگەی پێغەمبەرەوە نەبیٚ ﷺ كەواتە لێرەدا شیرك و بیدعەت لەخۆت دوور خستەوە كەچی تەماشا ئەكەی عالەمێكی زۆر لەشیرك و بیدعەیە لەبەر ئەوە مانای (لا اله الا محمد رسول الله)یان نەزانیوە تۆ ئەگەر رازی بێت (الله) پەرستراوی تۆ بیٚ چۆن ئەچی غەیری (الله) ئەپەرستی ! ئەگەر رازی بیٚ محمد ﷺ پێغەمبەری تۆ بیٚ تۆ چۆن ئەچی شەریعەت لە غەیری ئەو وەرئەگریی بیدعە و ضلالات چۆن ئەكەی (فالذي يجهل معنى لا إله إلا الله لا يمكن

[1] :سورة محمد اية ١٩

أن يعمل بمقتضاها على الوجه الصحيح) ئەوەی کە مانای (لا اله الا الله )نەزانێ بەتەئەکید ناتوانی کاریش بکا بەوەی کە (لا اله الا الله) داوای لێ کردوە ناتوانی چونکە تێ نەگەیشتوە

(جهل من يدعي الإسلام مراد قول لا إله إلا الله)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ: (فإذا عرفت أن جهال الكفار يعرفون ذلك) سەیری کەن کافرە جاهیلەکان کە ئەمە ئەزانن (فالعجب ممن يدعي الإسلام وهو لا يعرف من تفسير هذه الكلمة ما عرفه جهال الكفرة ،) بەراستی عەجائیبە ئەوە إدعای ئیسلام ئەکا ئەوەندە نازانێت کە کافرەکان ئەیانزانی ئەوان ئەیانزانی کە (لا اله الا الله)یانی چی کەچی هی ئێمە نازانێ (بل يظن أن ذلك هو التلفظ بحروفها من غير اعتقاد القلب لشيء من المعاني. ) وا ئەزانی تەنها هەرئەوەندەیە بەزمان بلێ (لا اله الا الله) تەبعەن ئەمە کێشەیەکی زۆر زۆر گەورەیە خوای تعالی تەنها وتەمان لێ وەرناگرێی بەلکو وتە و عەمەلمان لێ وەرئەگرێی قەول و عەمەل ئەبێ تۆ ئەو قەولەی کە ئەیلێت بەعەمەلیش بیسەلمێنیت .

شێخ (صالح) ئەلێ:

(هذا من أعجب العجب أن جهال الكفار والمشركين في عهد النبي ﷺ يعرفون أن معنى هذه الكلمة هو إخلاص العبادة لله وترك عبادة غيره) یانی جاهیلەکان لەموشریکەکانی زەمانی پێغەمبەر ﷺ  مانایەکەیان ئەزانی کە بریتیە لەئیخلاصی عیبادە بۆ خوای تبارك وتعالى ،واتە ئەبێت عیبادەت پوختەکەیتەوە تەنها بۆ خوا هەموو جۆرەکانی عیبادەت نابێ بۆ غەیری خوای تعالی بکەیت (وترك عبادة غيره) ئەبێ عیبادەی غەیری ئەوی تەرك بکەیت (فلذلك امتنعوا عن النطق بها تحاشيا لترك عبادة آلهتهم وتعصبا لباطلهم) بۆیە ئەوان نەیان دەوت بۆئەوەی خۆیان بپارێزن لەوەی کەوا خۆیان بەدروو بگرن لەوەی کە عیبادەتی ئالیهەکانیان تەرك بکەن ! ئەگەر وایان بوتایە ئەبوایە عیبادەتی ئالیهەکانیان تەرك بکردایە ئەوانیش تعصوبیان هەبوو بۆ باطلەکەی خۆیان ئەوەیان نەدەوت ئەیانوت نەخێر ئێمە هەر لەسەر ئەوە دەبین هەتا (ئەبو تالیب) سەیرکە سەرەرای ئەو هەموو ئامۆژگارییەی پێغەمبەر بۆی ﷺ لەکۆتاییەکەیدا وتی : من لەسەر دینی  عبدالمطلیبم ،( ومن يدعي الإسلام اليوم لا يفهم أن معنى هذه الكلمة هو ترك عبادة القبور والأضرحة وإخلاص العبادة لله) ئەوانەی ئەمرۆ

إدعای ئیسلام ئەكەن سەیركە بزانە شێخ چی ئەڵێت ئەڵێ ئەوانەی إدعای ئیسلام ئەكەن یانی ئەوانە لەسەر ئیسلام نین هەر بەإدعاكردن نابێت كەتۆ وتت من موسلمانم ئەبێ جێ بەجێ بكەیت ئەوانەی ئەمڕۆ إدعای ئیسلام ئەكەن مانای (لا اله الا الله) نازانن كەبریتیە لە ئەبێ عیبادەی قەبرەكان تەرك بكەی ئەبێ عیبادەت خاوێن بكەیتەوە بۆ خوا تەبعەن لێرە كە ئەڵێ عیبادەی قەبرەكان ئەبێ ئەوەش بزانین وەكو عولەمایان ئەفەرموون شنقطی ئەفەرمووی:چۆن نابێ لەعیبادەتی خوادا شەریك پەیدا بكەی بەهەمان شێوەش نابێ لەحوكمرانیەتی خوادا نابێ شەیرك پەیدا بكەی ،[1] ئەوەی ئەمڕۆ زۆر زۆر بەسەر بەناو موسلماناندا چەسپێنراوە پەنائەگرین بەخوا لەلایەنی ئەهلی باطلەوە ئەوەیە كە حوكمرانیمان بۆ غەیری خوا بەسەردا فەرزكراوە ! وە هەركەسێك ئەو حوكمرانیە بەراست بزانی وە لەژێر ئەو حوكمرانیە بڕوات و پێی راست بێت ورەزامەندی خۆیی لەسەر دەرببڕێت هەول نەدا بۆ گۆرینی پەنا ئەگرین بەخوا شەریكی پەیدا كردوە لەحوكمرانیدا وەكو خوای گەورە ئەفەرمووێی: (وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا)[2] خوای گەورە كەس شەیرك ناكا لەحوكمەكەی خۆیدا خوای گەورە بەهیچ شێوەیەك رازی نیە كە ئەو حوكمی داناوە لەناو ئێمەدا غەیری ئەو حوكمە بەكاربێت ئەو حوكمی خوایە بەلاوە بنرێت تنحی شەریعەتی ئیسلام بكرێت جا هەردوو لایەنەكە چ لایەنی گەرانەوەی عیبادەت بۆ غەیری خوا یاخود سەمع و تاعە كردن بۆ هەر رێنمایەك و یاسا و رێسایەك كە غەیری خوای تعالی بێت ئەوە هەموو شیركە پەنا ئەگرین بەخوای تبارك وتعالی (فلذلك صار يقولها وهو مقيم على شركه لا يأنف التناقض والجمع بين الضدين)لەبەر ئەوە كابرا ئەمە ئەڵێت هەردوو لایەنەكە سەیركە كابرا خۆیی زۆر بەموسەقەف ئەزانێ دیموكراتیەتم بۆ جێ بەجێ ئەكا ! یاسای بەشەرەكانم بۆ جێ بەجێ ئەكات دژایەتی خوا و پێغەمبەری خوا ئەكات ﷺ وە خۆیی بەموسلمانیش ئەزانێ ! واللە ی كاكە ئەوە هیچ موسلمانیەتی نیە موسلمان ئەوەیە تۆ تەسلیم بیت بەشەریعەتی خوا كە تۆ شەریعەتی خوات فرێدا و شەریعەتی شەیتانت هێنا ئەوە كەی تەسلیم بوونە با هەتا ئێواری بلێت (لا اله الا الله) هیچ ئیستفادەی نیە بەهەمان شێوەش

---

[1] : أوضاء البيان

[2] : سورة الكهف اية :٢٦

کاتێك کەتۆ ئەلێ خوا خوای منە (الله) خوای منە تۆ چۆن داوا لەمردووان و زیندووان بکەی ! تۆ چۆن ئەبێ عیبادەت بۆ غەیری خوای تعالی بکەی هەر جۆرێك لەجۆرەکانی عیبادەت (فصار جهال الكفار أعلم منه بمعنى لا إله إلا الله) کەواتە بەراستی کافرەکان بەو جەهالەتەی خۆشیانەوە زۆر زۆر شارەزاتر بوون لەمان بەمانای (لا اله الا الله) (ولا حول ولا قوة إلا بالله العظيم ، وصار هذا المدعي للإسلام يظن أن المراد بهذه الكلمة هو النطق بحروفها من غير اعتقاد لمعناها) ئەم کابرایەی کە شوێن ئیسلام کەوتوە بەحیسابی خۆیی إدعای ئیسلام ئەکا وا ئەزانێ موسلمان بوون تەنها ئەوەیە بلێت (لا اله الا الله) بەبێ ئەوەی بزانێ ماناکەی چیە بەبێ ئەوەی بزانێ کارکردن بەو (لا اله الا الله)یە ئەمە فەرزە لەسەرت (فصار يردد معها دعاء الموتى والمقبورين ليلا ونهارا) ئەلێ (لا اله الا الله) کەچی لەهەمان کاتیشدا ئەلی یا فلان و یا فلان هاوار ئەکاتە غەیری خوای تعالی .

## (خلط من يدعي الإسلام بين معنى الرب والإله)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ : (والحاذق منهم يظن أن معناها لا يخلق ولا يرزق ولا يدبر الأمر إلا الله) (الحاذق) یانی شارەزا یانی کابرای زیرەك و لێزان لەمانە وائەزانێ مانای (لا اله الا الله) چیە ، یانی چی (والحاذق منهم) مەبەستی لە عولەماکانە کە لەناو موسلماناندا بە عالمێکی گەورە دانراون لە ئەشعەرییەکان و ماتوریدییەکان ولەصۆفیەکان و لەرافزییەکان لەوانەی کە عولومێکی زۆری لەعیلمی ئالە وعیلمی کەلام کە لەوانە زۆر زۆر شارەزان ئەمە وائەزانێ مانای (لا اله الا الله) (لا يخلق ولا يرزق ولا يدبر الأمر إلا الله) واتا (لا اله الا الله) کەلیمەی (اله)ی بەچی ماناکرد بەخالق بەرازیق ئەوە زیرەکەکەیانە (لا يخلق ولا يرزق الا لله ، ولا يدبر الأمر إلا الله) بەس ئایا مانای (لا اله الا الله) ئەمەیە ؟! (إله) بەمانی معبودە پەرستراو نەك بەمانای خالق (رب)بەمانی خالقە باسی هەردووکیمان کرد لە بابەتەکانی پێشوودا جا ئەوەی کە سەری لێیان شێواندوە ئەوەیە وەرەن مانای راستەقینەی (إله)مان بۆ بکەن بزانین (إله)مانی چی یانی (المعبودە بحق) پەرستراو کە شایستەی پەرستنە بو راستەقینە تەنها (الله)یە بەس ئەمان ئەوانە ئەلێن (لايخلق ولا يرازق) ئەم قسەکەیان ئەوەیە ئەگەیەنێت موحید لای ئەوان ئەوەیە کەبلێت لەگەل خوا نابێ خالقێکی تر دابنێ ئەگەر دات

نا ئەوە شەریکت پەیدا کردوە مانای (إله) ناهێنە پێشەوە کەبلێن ئەگەر لەگەل خوادا کەسێکیترت پەرست کەسێکی ترت داوا کرد یان شەریعەتێکی ترت داهێنا غەیری شەریعەتی خوا ئەوە ئەو کاتە تۆ ئەبیت بە موشریك ئەوان وانالێن ئەوان ئەلێن : (لا خالق ولارازق الا الله) .

شێخ (صالح) ئەلیٚ:

(كما ذكر ذلك شيخ الإسلام ابن تيمية في الرسالة التدمرية[1]) باسی شێخ الاسلام (ابن تيميه)مان بۆ ئەکات رەحمەتی خوای لی بێت لەریسالەکە کە بە (التدمريه)بەناوبانگە کەباسی ئەوە ئەکات ئەو ریسالەیە باسی لایەنی ئەسماء صیفاتمان بۆ ئەکا توحیدی ئەسماء صیفاتمان بۆ ئەکات ئەم ریسالەیە ئەم بابەتەی بە تفاصیلی باس کردوە شێخ الاسلام (ابن تيميه) لەوێدا باسمان بۆ ئەکات وە لەغەیری ئەویشدا (عن علماء الكلام) کەناسراون بە عولەما عیلمی کەلام ،

عیلمی کەلام :ئێمە لەلای خۆمان نالێن عیلمی کەلام لەعقیدەدا ئەلێن عیلمی تەوحید عیلمی سوننە عیلمی ئیمان ئەم ناوەکانیانە بەلاَم عولەمای ئەشعەرییە و عولەمای ماتوریدیە ئەو عولەمایانەی تر تەماشائەکەن ئەم جۆرە ئیعتقاد وئیمان و ئەم جۆرە بڕوابوون بەخوا لەچیدا کۆئەکەنەوە لەعیلمی کەلامدا ئینجا کەلام لەچیەوە هاتوە یان وەکو عولەمایانیان ئەلێن کە جیاوازیان تێدا دروست بوە کە کەلامی خوا مخلوقە یان نا یاخود قسە کردن لەسەر بابەتی ئیعتقادی بەبیٚ گەرانەوە بۆ نصوصی کیتاب و سوننە یان قسە کردن لە ئەسماء صیفات بەبیٚ گەرانەوە بۆلای سەلەڤ ئومەت بەلکو بەفەلسەفە و بەوشتانەی کەوا کەوتونەتە ناویەوە ئەلێن ئەمجۆرە عولەمایانە ئەلێن ، واتا شێخ(الاسلام) وادەلیٚ (أن الإله عندهم) لەلای عولەمای کەلام (اله) (عندهم هو القادر على الاختراع) یانی (اله) ئەوەیە کەوا توانای هەبیٚ بەسەرداهانێندا یانی شت دروست بکا (يعني هو الذي يقدر على الخلق والرزق والإحياء والإماتة)ئەوەی کە بتوانی شت دروست بکا رزق بدا وە خەلك دروست بکا وەبیمرێنی ئەمە لای ئەوان مانای (اله)ئەمەیە کەواتە کە مانای (اله) ئەمە بوو ئەگەر یەکێك بلێت والله من ئیمان وایە کەوا لە (الله) زیاتر کەسیتر لەگەل خوادا نییە کە خەلق بکات رزقبدا ئەلێن تۆ

[1] : انظر التدمرية ص ١٨٥ تحقيق الدكتور محمد بن عودة السعوي ، ومجموع الفتاوى:١٣\٢٠٣

موحیدی ! تۆ یەکخوا پەرستی با عیبادەتیش بۆ غەیری خوا بکات ئەوە لێرە کێشە کە ئەوەیە بەراستی (ويبنون عقائدهم على هذا ، ويفسرون لا إله إلا الله بهذا المعنى ، ويجعلون التوحيد هو الإقرار بتوحيد الربوبية وهذا غلط عظيم. ) ئەوان مانای (لا له الا الله÷)یەکە لەسەر ئەمە تەفسیر ئەکەن وەتوحید و یەکخوا پەرستی لەسەر ئەم ئەساسە باس ئەکەن کە گوایە تەوحیدی ربوبیەتە نەك تەوحیدی الالوهیەت ئەمەش هەلەیەکی زۆر گەورەیە چونکە ئەنبیاء ورسول کێشەیان لەگەل (عليهم الصلاة والسلام) لەگەل ئومەتەکەیان نەبوە لەسەر ئەوەی وەرەن بڕوا بەخوا بهێنن خوا هەیە هەموویان زانیویانە و بڕوایان بەخوا هەبوە کێشەکەیان لەسەر وەرن عیبادەتەکانیتان تەنها بۆ خوای گەورە بگەڕێنەوە .
(فإذا كان هذا حال العالم منهم فكيف بالجاهل ؟) دەباشە لە ئومەتی ئیسلام ئەگەر ئەمە عالەمەکان ئاوابن ئەبێ جاهیلەکان حالیان چۆن بێ ئەگەر عالەمەکان حالیان وابوو مانای (إله)نەزانن ئێ بێ جاهیلەکان حالیان چۆن بێ (وما هذا إلا من قلة الاهتمام بدعوة التوحيد) ئەمەش هەموو بەراستی لەگرینگی نەدان بەعیلمی یەکخوا پەرستی تەوحیدەوە هاتووە ،( وتقليد الآباء والأجداد) لاسایی کردنەوەی باو باپیران (والاكتفاء من الإسلام بمجرد الانتساب لأغراض وأهداف دنيوية الله أعلم بها، من غير تعرف على الدين الحقيقي الذي أساسه التوحيد الخالص. ) ئەمە هەمووی ئەوەیە کەوا ئەمانە بەوە رازی بوون تەنها ناوی ئیسلامیان پێوە بنرێی نەچنە ناو حەقیقەتی ئیسلام یان ئیتر هەر دەفێکیتریان هەبوە لەهەدەفە دونیاییەکان کەخۆیی ئەزانی وە بەبێ ئەوەی بزانێ کە دینی راستەقینە کامەیە کە ئەساسەکەی تەوحیدی خالصە .

## (عدم خيرية من يكون جهال الكفار أعلم منه بمعنى لا إله إلا الله)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ : (فلا خير في رجل جهال الكفار أعلم منه بمعنى لا إله إلا الله) هیچ خێرێك نیە لەکەسێکدا کە کافرە جاهیلەکان زاناترین بەمانای (لا اله الا الله) لەم!

شێخ (صالح) ئەلێ :

(لا خير في رجل يدعي الإسلام بل يدعي أنه من أهل العلم) کابرا إدعای ئیسلام ئەکا بەڵکو إدعای ئەوە ئەکا کە لەعولەمایی ئیسلامە لەعولەمایی موسلمانانە (ولا يفهم معنى لا إله إلا الله)مانای (لا اله الا الله) تێ نەگەیشتووە (وقد فهمها كفار قريش وعرفوا معناها. ) کافرەکانی قوریش تێی گەیشتبوون ماناکەشیان ئەزانی .

(إن الأمر خطير ، والعار شنيع ، والواجب على المسلمين أن ينتبهوا لدينهم)بەراستی ئەم بابەتە بابەتی تەوحیدی بابەتێکی زۆر زۆرگرینگە و قەدرێکی گەورەی هەیە وئەبێت لەلامان زۆر بەگەورەیی و بەقەدرەوەی سەیری بکەین ئەبێ گرینگی زۆری پێبدرێت وە ئینسان بکەوێتە ناو شیرك وضلالەتەوە بەراستی شتێکی زۆر حەقیر و ناشرینە و ئەبێ ئاگاداربین وە واجب لەسەر موسلمانان ئەوەیە ئەبێ وریابن بۆ دینەکەیان دینەکەیان دیراسەبکەن ئەبێ بزانن (لا اله الا الله) یانی چی (ويتأملو ادعوة نبيهم)ورد ببنەوە لەبانگەوازی پێغەمبەرەکەیان ﷺ (ويفقهوا دينهم فقها صحيحا) وەبەجوانی لەدینەکەی خوا تێ بگەن (ويقيموه على أساس سليم من عقيدة التوحيد والبراءة من الشرك وأهله) ئەبێ لەسەر ئەو ئەساسە بینایی دینەکەیان بکەن بلێن لەخوا زیاتر کەس ناپەرستین ئەوە عقیدەی تەوحیدە (والبراءة من الشرك وأهله) وە ئێمە بەرین لە شیرك و لە ئەهلی شیرك ، ئەبێ عەداو بەغضاء مان هەبێ لەگەل شیرك و موشریکیندا ئەبێ خۆمانیان لێ دوورە پەرێزبگرین ئەبێ تێکەلاویان نەبین ئەبێ خۆمانیان نەدەینە پالیان نەك هەر خۆمانیان نەدەینە پالیان ئەبێ لێشیان بەریء بین ئەبێ رقیشمان لێیان بێ بەس ئایە ئەمرۆ وایە ! ئەمرۆ موسلمانان ئابەم چەشنەن ! (ولا يكتفوا بمجرد التسمي والانتساب إليه مع البقاء على الرسوم والعادات المخالفة له) نابێ تەنها بەوەندە کۆتایی پێی بهێنن کە ئێمە موسلمانین تەواو وەرەموسلمانی تەحقیقی دینەکەت بکە بزانە موسلمانیت لەکاتێکدا تۆ وا ئەلێت کەچی لەسەر پاشماوەی رابردوان ماویەتەوە لەسەر عادەت وتەقالیدی پێچەوانەی دینەکەی خۆت ئەرۆیی (وترديد عبارات جوفاء لا تسمن ولا تغني من جوع. )چەندەها وشەی بێ ناوەرۆك ئەلێتەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ ئیستفادەیەکت پێ بگەیەنێت نابێ وابیت ئەبێ بزانی حەقیقەتی دینەکەت چیە ئەبێ بچیتە

بنج و بناوانی ئەبێ ببیت بە موسلمان ئەبێ بەرگری لەو دینە بکەی ئەبێ دژایەتی دووژمنانی ئەو دینە بکەیت دۆستایەتی دۆستەکانی بکەیت دووژمنایەتی دووژمنەکانی بکەیت .

(نعمة الله على المؤمن بالتوحيد

توجب الفرح به والخوف من سلبه)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ: (إذا عرفت ما قلت لك معرفة قلب) ئەگەر ئەمەت زانی بەلأم بەدڵ دلت دایە نەك هەر تەنها شتێك بێت بەگوێتا بڕوا یاخود شتێکی سەر زارەکی بێت .

شێخ(صالح) ئەلێ :

(أي إذا عرفت ما ذكرت لك من الفرق بين توحيد الربوبية وتوحيد الألوهية) بۆمان باسکردی کە تەوحیدی ربوبیە و تەوحیدی الالوهیەت چیە ! تەوحیدی ربوبیە ئەوەیە کە تۆ بلێ تەنها خوا دونیایی دروست کردوە تەنها خۆیی بەڕێوەمان ئەبات تەنها خۆیی خاوەن مانە ،تەوحیدی الالوهیە ئەوەیە بلێت هەموو ئیشەکانمان بۆ خوا ئەگەڕێنینەوە بۆ کەسیتری ناگەڕێنینەوە لەنوێژ و ڕۆژوو زەکات و حەج و هەرچی عیبادات هەیە وە هەرچی سەمع و تاعە هەیە هەرچی ملکەچی وخۆ زەلیل کردن هەیە ئەبێ تەنها بۆ خوا بێ لەسەر شەریعەتی ئەو نەبێ نارۆین (وعرفت أن المشركين أقروا بالأول وجحدوا الثاني) وە زانیشت کەوا موشریکەکان ئیعترافیان کردوە بەیەکەم بەلأم ئینکاری دووەمیان کردوە ئینکاری دووەمیش لەبەر ئەوەنا کا ماناکەی نازانن بەڵکو لەبەر ئەوەی عینادیان کردوە یانی ئیمانیان هەبوە بە (الله) کە خوایان بوە کە (الله) ئەوانی دروست کردوە بەلأم نەهاتوون ئیشەکانیان هەمووی بۆ خوا بگەڕێننەوە شەریکی بۆ قەرار نەدەن لەگەڕاندنەوەی عیبادەتەکانیان لەسەمع و تاعەکانیدا (فلم يدخلهم في الإسلام) بۆیە ئەوان ئەو ئیعترافە ئەوانی نەخستە ئیسلامەوە ئەوانی نەکرد بەموسلمان (وقتلوا) بەڵکو کوژران لێدران ملیان پەڕێندرا (واستحلت دماؤهم وأموالهم) پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ماڵ و خوێنی حەلال کردن (إذا عرفت هذه الأمور معرفة قلب) شێخ ئەلێ ئەگەر ئەمەت زانی بەدل (لا معرفة لسان فقط) بەس بەزمان بلێت (لا اله الا الله) نا (كأن يحفظ الإنسان هذا المعنى ويؤديه في الامتحان وينجح فيه ولم يتفقه فيه في

قلبه ويفهمه تماما فهذا لا يكفي) باسی قوتابیٚ ئەکا ئەلیٚ دەرسەکەی لەبەر ئەکات و تیٚ ناگات ئەچیٚ ئیمتحانەکەش ئەکات و دەرئەچیٚ و تەواو ئایا ئەمە تەواو ؟! یانی تەنها ئەوەیە تۆ شتەکە لەبەر کەیت و بیلیٚتەوە نەیزانی ماناکەی چیە ئەمە تەواوە ؟! ئەوهابیٚت خوا ئەمە قبول ناکا لەلای خوا ئەمە دەرناچیٚت ،ئەگەر چی لەدونیادا لە کورسی مەکتەبدا دەر ئەچیٚت بەس لەلای خوا دەرناچیٚت (فهذا لا يكفي ، فالعلم هو علم القلب وعلم البصيرة لا علم اللسان فقط. ) شتەکە پەیوەستە بەدڵەوە پەیوەستە بەبینابییەوە بەبینایی دڵەوە نەك پەیوەست بیٚت بەس بەزمان و تەواو (لا اله الا الله) و تەواو ! نەخیٚر ئەبیٚ بزانیت ماناکەی چیە بۆیە خوای تعالی داوای لەپیٚغەمبەرمان کرد فەرموویی ﷺ (فَٱعۡلَمۡ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱللَّهُ)[1] .

## (الشرك المراد في قوله تعالى

## إن الله لا يغفر أن يشرك به ويغفر ما دون ذلك لمن يشا)

شیٚخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلیٚ : (وعرفت الشرك بالله الذي قال الله فيه) کە ئەمەت زانی شیرك ئەوەیە کە خوا فەرموویەتی : (إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغۡفِرُ أَن يُشۡرَكَ بِهِۦ وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ)[2] خوای تعالی قەد لەو کەسە خۆشنابیٚ شەریکی بۆ پەیدا بکا وە لەغەیری ئەوە خۆش ئەبیٚ ئەم شیرکە تەبعەن کە لەشیرك خۆش نابیٚ ئایا چ شیرکیٚکە !؟ بەتەئەکید شیرکی أكبرە ئەمە هیچ ، بەس ئایە شیرکی أصغریش ئەکەویتە ئەم شیرکەوە !؟ عولەما دوورەئیان هەیە :

ڕەئیی یەکەم : ئەفەرموون بەلیٚ .

ڕەئیی دووەم :نەخیٚر وەکو کبائیر هەژمار ئەکریٚت خوا لیٚی خۆش ئەبیٚت .

بەڵام صەحیح ئەویە نەخیٚر شیرکی أصغریش خوای گەورە لیٚ خۆش نابیٚت إلا ئەبیٚ کابرا تەوبەی لیٚ بکات یان خوای تعالی بەوێنەی ئەوە ئەیسوتیٚنیٚت یان حەسەناتی راجیحەی زاڵە بەسەر ئەو شیرکەدا کە پیٚی کافر نابیٚ شیرکی أصغرمان مەبەستە ئەو کاتە خوای تعالی حەق و حیسابی لەگەل دەکا(وَيَغۡفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ)[3] لەغەیری شیرك خوای گەورە

---

[1] :سورة محمد اية ١٩

[2] :سورة النساء اية :٤٨

[3] :سورة النساء اية :٤٨

لەبەندەکانی خۆش ئەبێت ئەگەر بیەوێت هەیە لێ خۆش نابێ ، با تەفسیری (لِمَن يَشَآءُ)بکەین کابرا (١٠٠)کەسی کوشت خوای گەورە لێی خۆشبوو کە تۆبەی کرد ، ئافرەتێك پشیلەیەکی ئەزیەتدا خوای گەورە لێی خۆش نەبوو ،یان شەخصێك لەبەر خۆپاك نەکردنەوە لەمیز یاخود خۆ دەرخستنی عەورەت خوای تعالی عەزابیدا لەسەر نەمیمەیەك عەزابیدا لەقەبردا سەیریش ئەکەی لەگوناهی گەورە گەورەی تر هەیە خوای گەورە خۆش ئەبێ وە عیقابی نادات ئەموپێویستە بەلێخۆشبونی خواوە (فَيَغۡفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ)[1]بەلاّم بەنیسبەت شیرکەوە لێخۆشبوون نیە ئەبێ ئاگاداربێ .

شێخ(صالح)ئەلێ :

(أي الشرك في العبادة لا الشرك الذي هو اعتقاد أن أحدا يخلق ويرزق ويدبر مع الله)دەلێ کەباسی شیرکی کردوە مەبەستی شیرك لەعیبادەتە نەك شیرك لەربوبیەت خۆیی شیرك لەربوبیەتیشدا هەر شیرکە ئاگاداربن یانی کاتێك ئێمە ئەوشتانە لێرەدا باس ئەکەین مانای ئەوە نیە کەوا شێخ شیرك لەربوبیەتدا بەشیرك دانانێت ! هەر شیرکە بەس ئەلێ ماناکەی بەوە لێك نادرێتەوە بەتەنها یانی کاتێك کەتۆ ئەلێ شیرك ئەبێ بلێت شیرك لە (ربوبیەت ، الالوهیەت ، ئەسماء صیفات) هەرجۆرە شیرکێکت هەبێ لەمجۆرە شیرکانە ئەوە تۆ موشریکی ! بەلاّم زۆربەی زۆری خەڵك لەزەمانی پێغەمبەر تەماشابکەی ﷺ لەپێش پێغەمبەریشدا ئایا شیرکیان لەربوبیەت هەبوە !؟ ئەبینین لەورانگەی ئەوەی کەوا وتویانە (الله) دروستکاری ئێمەیە بەرێوەمان ئەبات خالقمانە لەوەدا موحید بوون ! ئالەو خالەدا بەس لەوجێگایەدا کەوا تەنها ئەبێ عیبادەتەکان بۆ خوای گەورە بگەرێتەوە لەوە دا موشریك بوون بۆ غەیری ئەویشیان گەراندوەتەوە بەس وەرە بۆزەمانی خۆمان ئایا تەنانەت لە ربوبیەتیش شیرك ئەکەن یان نا !؟ بەلێ لەربوبیەتیش شیرك ئەکەن ، یانی (ئەبو جەهل)رەئی وابوو تەصەروف تەنها خوا ئەیکا لەکەوندا کەچی ئەوانەی ئەمرۆ ئەلێ نا (عبدالقادر و بەدەی و فلانیش) ئەیکا ! ئەها شیرکەکە لەربوبیەتیشدا هەیە ! بەس لێرەدا کەباسی شیرك ئەکا ئەبێ ئێمە شیرکەکە تعمیم بکەین بەسەر هەر سێ جۆرە شیرکەکەدا لەربوبیەت لە الالوهیەت لە ئەسماء صیفات نابێ شیرکت هەبێ وە نابێ شیرکی أکبر و

[1] :سورة البقرة اية :٢٨٤

أصغریشت هەبێ بەڵام شیركی أكبرت هەبێ موشریكی شیركی أصغرت هەبێ پێت ناوترێی و ناچیتە ناو موشریكانەوە بەلكو لە أكبركبائیر واتا لەسەرووی كەبیرەوەیە شیركی أصغر لەسەرویی كبائیرەوەیە بەس لەخوار شیركی أكبرەوەیە شیركی أكبر پێی كافر ئەبی پێی موشریك ئەبی ! بەس شیركی أصغر پێی كافر نابی پێی موشریك نابی بەڵام تاوانەكە لە كبائیر گەورە ترە لەزینا و قتل گەورەترە بۆیە پێی ئەوترێی (أكبر الكبائر) (أي الشرك في العبادة لا الشرك الذي هو اعتقاد أن أحدا يخلق ويرزق ويدبر مع الله) ئەوشیركەی كەباس دەكا شێخ مەبەستی شیرك لەعیبادەتدایە نەك لەربوبیەتدا (بل الشرك الذي حذر الله منه هو اعتقاد أن أحدا يستحق العبادة أو شيئا من العبادة مع الله. )ئەو شیركەی كە خوا تحزیری لەئێمە كردوە ئەڵێ ئەو شیركەیە كە تۆ نابێ عیبادەت بۆ غەیری خوا بكەی تەنها عیبادەت شایستەیە بەخوا .

(فالشرك هو دعوة غير الله معه) كەواتە پەرستنی غەیری خوا داوا كردن لەغەیری خوا (أو صرف شيء من أنواع العبادة لغير الله) هەرجۆرێی لەعیبادەتەكان بۆ غەیری خوایی بگەڕێنیتەوە (هذا هو الشرك الذي حرمه الله وحرم على صاحبه الجنة) ئەو شیركەیە كەخوا حەرامی كردوە بەهەشتیشی لەسەر خاوەنەكەی حەرام كردوە (وأخبر أن مأواه النار ، وهو الشرك الذي يحبط جميع الأعمال) وەخاوەنەكەی بۆ ئاگر ئەروات هەتا هەتایی وە هەموو ئیشەكانی لەوچاكانەی كە كردوویەتی خوای گەورە هەمووی لەناو ئەبات نایهێڵێت هەموو حبوط پێی ئەكات واتا ئەجریی هیچی ناداتەوە .( وهو الشرك في الألوهية) ئەوە شیركە لە الالوهیەتدا (وليس الشرك في الربوبية) مەبەستی ئەوە نیە ها تێ نەگەن شێخ بلێ شیرك لەربوبیەتدا بكرێی شیرك نیە نا مەبەستی ئەوە نیە ئەمە ماناكە مەبەستی پێی شیركی الالوهیەتە چونكە ئەوان شیركی ربوبیەتیان نەبوە (وهذا تنبيه من الشيخ – رحمه الله – إلى أنه كما تجب معرفة التوحيد تجب معرفة الشرك. ) ئەم نوقتەیە زۆر گرینگە ئەڵێ ئاگاداری لە شێخ(محمدی كوری عبدالوهاب)بەم ریسالەیە بەخەڵكی ئەڵێت ئاگاداربە پێویستە لەسەر خەڵكی تەوحید بناسن وە شیركیش بناسن ! تەوحید بناسن بۆئەوەی جێ بەجێ بكەن شیرك بناسن بۆ ئەوەی خۆتانی لێ دووربخەنەوە ، یانی نابێ تۆ بلێ تەنها ئەمەوێت چاكە بزانم خراپە نابێ بزانم ئەگەر چاكەت زانی ئەبێ بیكەی ئەبێ خراپەش بزانی بۆ ئەوەی

نەيكەی ،ئەلێ خراپەم زانی نەبۆ ئەوەی بيكەم بەڵكو بۆئەوەی خۆمی لێ بەدوور رابگرم هەتا حوذيفه (رەزای خوای لێ بێت) ئەيفەرموو پێغەمبەری خوا ﷺ خەلمك پرسياری لێ ئەكرد دەربارەی خێر ،منيش پرسيارم لێ ئەكرد دەربارەی شەڕ بۆئەوەی نەكەومە ناويی لەترسی ئەوەی نەكەومە ناويی .جا ئەبێ ئينسان شەڕ بزانی ئەوەی نەكەوێتە ناويی نەك شەڕ بزانێ بۆئەوەی بكەوێتە ناويی خۆئەگەر شەڕ نەزانی ئەوكاتە تۆ چۆن خۆت بەرێ دەكەی لەشەر .

## (دين الله الذي أرسل به الرسل من أولهم إلى آخرهم)

شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) ئەلێ : (وعرفت دين الله الذي أرسل به الرسل من أولهم إلى آخرهم ، الذي لا يقبل الله من أحد دينا سواه. ) ئەمەت زانی كه دينی خوای تعالى ئەوەيه كه پێغەمبەرانی هەمووی پێ ناردوه له ئەوەليان تا ئاخيريان كەوا خوای تعالى لەهيچ كەسێك قبول ناكا غەيری ئەودينی كه ناردوويەتی لەئيسلام زياتر تەبعەن ئاگاداربن دينی هەموو پێغەمبەران ئيسلام بووه هەموويان يەك دينيان هەبووه دينی يەكخوا پەرستيان هەبووه راسته شەريعەتەكانيان جياواز بووه بەس ئيمان و عقيدەيان يەك بووه كه بريتی بوو لەيەكخوا پەرستی .

شێخ (صالح) ئەلێ :

(دين الرسل هو الإسلام) پێغەمبەران هەموويان دينيان (الاسلامه) تەعريفی ئيسلام چيه ؟ ئيسلام : (وهو الاستسلام لله بالتوحيد) دەبێ تۆ تەسليم ببيت بەخوا بۆ ئەوەی تەنها عيبادەت بۆ خوا بكەی تەنها بلێ (الله جل وعلى) پەرستراوی راستەقينەی منه (والانقياد له بالطاعة) وه ئەبێ خۆت بدەيتە دەستی بەزەليلبوون تاعەی بكەی بەقسەی بكەی ئەبێ پەيرەويی لەفەرمانەكانی بكەی ئەبێ زەليلی فەرمانەكانی بی نابێ لوت بەرزبی نابێ موتەكەبير بيت ئيعتراف پێی بكەيت و بەقسەی نەكەيت نابێت ئەمە ئيسلام نيه سێ نوقتەمان بۆ باس ئەكا (الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة والخلوص من الشرك وأهله) ئەبێ تۆ خۆت بەرێ بكەی تەركی شيرك بكەی خۆت پاك رابگريی له شيرك و لەئەهلی شيرك خۆت دوور خەيتەوە لەشيرك و لەئەهلی شيرك هەريەك لەم سێ خاڵەی تێدا

نەبێت تۆ موسلمان نیت !! وە ئەو دینەی تۆشی لەسەر ئەرۆیت ئەوە ئیسلام نیە ئیسلام ئەبێ ئەم نوقتانەی تێدابێت تەسلیم بیت بەخوا بەتەوحید بەیەکخوا پەرستی لەغەیری (الله) زیاتر کەسیتر ناپەرستی وە ئەبێ فەرمانەکانی جێ بەجێ بکەی وە ئەبێ خۆشت بەرێ بکەی لەشیرك و ئەهلی شیرك .

(هذا هو دين الرسل وهذا هو الإسلام) ئەمە دینی پێغەمبەرانە ئەمە دینی ئیسلامە ، کەواتە ئێمە با ئەو مانایانە بکەین بەکوردی بۆئەوەی قەومی کوردمان تێ بگەن بزانن ئایا لەسەر ئیسلام ئەرۆن ؟! یاخود لەسەر ئیسلام نارۆن ! هەر کەس پرسیار لەخۆیی بکا ئایا تەنها تەسلیم بووی بەخوا بەوەی بلێ و بیکەی کە تەنها خوا پەرستراوی راستەقینەی منە ! وە ئایا فەرمانەکانیت جێ بەجێ کرد ! ئەمە بکە ئەمە مەکە ! ئەمە بلێ ئەمە مەلێ ! وە ئایا خۆت بەرێ کرد لەهەرچی لەغەیری خوا ئەپەرسترێی خۆت لێ بەرێ کرد ! لەهەرچی رێو رەسمێك کەوا ئەپەرسترێی لەهەرچی رێبازێك لەهەرچی عیبادەتێك بۆ غەیری خوا خۆت لەوە دوورخست رقت لێ بوو ! خۆتت لێ دوورخستەوە دووژمنایەتی خۆت لەگەل دەرخست بۆنمونە بلێ من دووژمنی هەموو رێبازێکم تەنها ئیسلام نەبێت ! والله وانەلێت ئیسلامت لێ قبول ناکرێی چۆن ئەبێ تۆ لەیەك بلێت من موسلمانم لەلایەك بلێت من دیموکراتیم ! لەلایەك بلێت من موسلمانم لەلایەك بلێت من قەومیم ! لەلایەك بلێ من موسلمانم لەلایەك بلێ من لەگەل عامی خەلکدام ! خەلك چی بلێت من ئەوە ئەلێم چۆن ئەبێ وابێت ! ئەوە ئیسلامەتی نیە ئەوە بزانە تۆ لەسەر ئەساسێکی شیرك و باطلدای !! (وأما الانتساب إلى الإسلام في الظاهر دون الباطن) خۆدانە پالْ ئیسلام لەڕوالەتدا بەبێ ئەوەی لەناوەرۆکی ئیسلام بەریت بەرێوە (أو الانتساب إليه بالتسمي فقط دون التزام لأحكامه) والله بەس ناوەکەمان موسلمان بێ بەس ئەحکامەکانی جێ بەجێ نەکەین (أو الانتساب إليه مع ارتكاب ما يناقضه من الشرك والوثنيات) خۆمان بدەینە پالْ ئیسلام بەلأم لەهەمان کاتدا شتێك بکەین کەوا هەلی دەوەشێنێتەوە ئیسلامەکەمان هەلدەوەشێنیتەوە لەشیرك و لەبت پەرستی و لەوەتەنیات و لەپیاو پەرستی و لەرێباز پەرستی (أو الانتساب إليه مع الجهل بحقيقته)خۆمان ئەدەینە پالْ ئیسلام بەس جاهیلیش بین بەحەقیقەتی ئیسلام ! لێ بپرسە ئیسلام چیە نازانێ لێ بپرسە قورئان باسی چی ئەکات نازانێ قورئان چەند سورەتی تێدایە نازانێ لەحەدیسەکانی

پێغەمبەری لەکوێدایە نازانیٚ ﷺ یان باسی شەریعەتی ئیسلامی بۆ ئەکەیت بەتوند ڕەویی دائەنێت باسی ئیسلامی بۆ ئەکەیت ئەلیٚ ئەوە توند ڕەوییە نازانیٚ ئیسلامەکە چیە (أو الانتساب إليه دون موالاة لأوليائه) یاخود خۆت بدەیتە پاڵ ئیسلام بەڵاَم نەچیت دۆستایەتی دۆستەکانی بکەیت ئەمرۆ زۆربەی زۆری خەڵك دووژمنایەتی دۆستەکانی ئیسلام ئەکات زۆربەی زۆری خەڵك لەگەل دۆستانی ئیسلامدا نییە دژایەتی دۆستانی ئیسلام ئەکات (ومعاداة لأعدائه) ئەچن لەجیاتی بێن دووژمنانی ئەو دین ببوغزێنن وە دژایەتیان بکەن دژایەتی دووژمنانی ئیسلام بکەن بەپێچەوانەوە ئەچن مەوالاتی دووژمنانی ئیسلام ئەکەن ! ئەمە ئیسلامەتی نیە ! تۆ دووژمنی ئیسلامت خۆشبووێی بەڵاَم دۆستی ئیسلامت ڕق لیٚ بێت (فليس هذا هو الإسلام الذي جاءت به رسل الله) پێغەمبەرانی خوا ئەو ئیسلامەی کە هێناویانە ئەوها نەبووە ! کەخەڵك ئەمرۆ لەسەرێی ئەڕوات (وإنما هو إسلام اصطلاحي مصطنع) ئیسلامێکی دروستکراوە ئەمە زاراوەیەکی دروستکراوە لەلای خەڵك ئەمە ئەوە نیە کەخوا ناردوویەتی (لا يغني ولا ينفع عند الله سبحانه وتعالى ، وليس هو دين الرسل. ) ئەمە هیچ سودێکت پێی ناگەیەنێت وانەزانێت تۆ بەمە ئەچیتە بەهەشت و بەهەشت ئەبینی نەوالله بەهەشت نابینی ئائەوها بڕۆیت بەم شێوەیە ئەبیٚ تەوبە بکەیت ئەبیٚ بگەڕێتەوە بلێت یەکخوا ئەپەرستم تەنها (الله)یە وە غەیری (الله) ناپەرستم وە دووژمنی من ئەوکەسانەن کەوا ڕێگەی خوایان نەگرتوە وەخۆمایان لیٚ بەریئ ئەکەم وەمن لەگەل ئەوان نیم بەهیچ شێوەیەك ئەها خوای تعالى لەقورئاندا ئەفەرمووێت : (إِنَّ ٱلشَّيۡطَٰنَ لَكُمۡ عَدُوّٞ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدۡعُواْ حِزۡبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ)[1] چی ئەوێت شەیتان ئەیەوێت عەبدەکانی خوای تعالى بۆلای خۆیی بەرێت بۆلای حیزبەکەی خۆی بەرێت بۆلای ئاگری جەهەنەم بۆلای سەعیر بەرێت ، کەواتە تۆ ئەبیٚ نەلێت من عیلاقەی شەیتانم نیە بلیٚ من عیلاقەم لەپەیرەویی لیکراوانی شەیتان نیە من کەس ناکەم بەدووژمنی خۆم کاکە من عیلاقەی ئەو شتەم نیە ناخێر ئاوها بلێت تۆ موسلمان نیت ! ئەبیٚ بەپیاوانە و بەسەربەرزیی بێیتە پێشەوە بەئازایانە بلێت من خوا پەرستم من دژی شەیتان و شەیتانیەکانم من دژی غەیری ڕێبازی

[1] :سورة فاطر اية :٦

خوای تعالی م دژی ئەو ڕێبازانەم کە ڕێبازی خوانین ئەبێ بەرائەتی خۆت دەرکەی و دەربخەیی ! .

## (جهل غالب الناس بالتوحيد والشرك)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ : (وعرفت ما أصبح غالب الناس فيه من الجهل بهذا .) کەزانیت زۆربەی زۆری خەڵك بێ ئاگان لەمە ! مەبەستی چیە لەمە ! مەبەستی تەوحیدی راستەقینەیە زۆربەی زۆری خەڵك بێ ئاگایە لەتەوحیدی راستەقینە یەکخواپەرستی کە خوای گەورە ناردوویەتی .

شێخ(صالح) ئەلێ :

(وهو الجهل بالتوحيد) یانی (الجهل بهذا) مەبەستی (الجهل بالتوحيد) کابرا بێ ئاگایە لەیەکخوا پەرستی ! (والجهل بالشرك) هەروەها بێ ئاگایە لەشیرك ئەکەوێتە ناویی بەبێ ئەوەی بزانێ کەوتۆتە ناویی (هذا هو الذي أوقع كثيرا من الناس في الضلال) ئائەم نەزانینەیە نەزانین بەتەوحید نەزانین بەشیرك وایی کردوە کە زۆربەی خەڵك بکەوێتە ناو شیرك وضلالەوە (وهو أنهم يجهلون التوحيد الصحيح ويجهلون الشرك) نەئەزانن تەوحیدی راستەقینە چیە یەکخوا پەرستی چیە وە نەئەشزانن شیرك چیە ! سەیرکە دوو کەلیمە ئەلێن خەڵك بەعام ئەلێن کاکە ،ئیسلام ئەوەیە باش بلێ وە خراپ مەلێ باش بکە خراپ مەکە ئەلی ێبەقەدەر مەلایەکی لێ ئەزانم منیش ئەیزانم ئێمە ئەلێنە راستە ئەم مولەخەصە زۆر جوانە بەس وەرە پێم بلێ باش کامەیە لای تۆ! باش دیموکراتیە لای تۆ ئەوە لای خوا خراپە باش ئەوەیە بلێ (یارسول الله) ئەوە لەلای خوا شیرکە! باش ئەوەیە کەتۆ نەزر بۆ غەیری خوا بکەی بەس لای خوا ئەوە شیرکە باش ئەوەیە تۆ بەقسەی بەشەرەکان بکەی ڕێبازەکانیان بەخیتە سەرسەرت وڕێبازی خوا فرێدەی بەس ئەوە خراپە لەلای خوای گەورە ! باش ئەوەیە کە تۆ بەخۆت ئەلێ من چۆن شازبم لەناو خەلکیدا ئەگەر بەقسەی قورئان وحەدیس بکەم کەسێکی شاز دەرئەچم ئەوە باش نیە ئەبێ من لەگەل عام بم ئەمە خراپە ئەمەی کە تۆناوت ناوە باش ئەمە خراپە ! کەواتە ئەبێ بزانین پێناسەی باش و خراپ چیە ! ئاخر کێشەکە لێرەدایە لەلای خوای گەورە باش باسکراوە وە خراپیش باسکراوە لای ئێمەی بەشەر بەعەکسەوە لەلای زۆربەی زۆری خەلکەکان باش خراپە و خراپ باشە یانی

بەخراپەکان ئەڵێن باش ئەڵێن ئەبێ شوێنی بکەویی بەباشەکانیش ئەڵێن خراپ ئەبێ چی بکەیت لێ دوورکەوتیتەوە ئەورۆ دینداری خراپە لەلای خەلك دینداری تۆقاندن و ترساندن و تیرۆرستی و ئەوبابەتانەیە هەرچی شوێن دینداری بکەوێت ریش بێلەرەوە لەلای خەلك ناشرین و پیسیە ! ئەلێ نەخێر ، ئەلێ لەلای پێغەمبەری خوا ﷺ ئەلێ خوا ئەمری پێکردووم بەوە ئەفەرمووێی :ئەبێ خۆتان بە مەجوسی نەشوبهێنن وەرە ریش بەردەنەوە سمێل کورت کەنەوە دەی لەلای زۆربەی زۆری خەڵك ئەمە باشە یان خراپە ! ئەمە خراپە ! ئەوە تیرۆرستیە ئەوە ناشرینیە ئەوە پیسو پۆخلیە بەحیسابی خۆیان ئەوە لەمیزان و لەلای خەڵکی ئاوایە کەواتە میزانەکە تێکچووە پێوەرەکە تێك چووە پێوەر ئەبێ پێوەری خوا بێ ئاگاداربین پێوەری خوا میزانی خوا میزانێکە غەیری میزانی بەشەر میزانی بەشەر میزانێکە زۆربەی زۆری بەضلال و گومرایدا رۆیشتووە چاکەکان خراپن لای بەشەرەکان خراپەکان چاکن بۆیە کورتەی باسەکە کە ئەلێت با چاك بکەین و خراپ نەکەین هەموو موتەفیقین لەسەر ئەمە بەڵام وەرە پێم بلێ کامەی چاکەکانە و کامەی خراپەکانە ! بۆیە ئەلێ (وهو أنهم يجهلون التوحيد الصحيح ويجهلون الشرك ويفسرون كلا منهما بغير تفسيره الصحيح) واتا هەردووکیان بەغەیری تەفسیری راستەقینەی خۆی دەکەن تەفسیری خۆی نادەنێ بۆیە پێویستە شارەزابین بزانین تەوحید و یەکخوا پەرستی کامەیە شیرك و ضلالەت کامەیە تا ئەو دوانەمان ناسی شوێن تەوحید کەوین و پشت کەینە شیرك و بەری بین لەخۆیی و لەئەهلەکەی (هذا هو الذي أوقع كثيرا من الناس في الغلط والكفر والشرك والبدع والمحدثات إلى غير ذلك) ئائەم نەزانینەیە کە خەڵکی خستۆتە ناو هەلە و کوفر و شیرك وبیدعە و موحدەثاتەوە (وذلك بسبب عدم معرفة ما أمر الله به من توحيده وطاعته) بەهۆی ئەوەی کەوا ئەوان نازان

ن کە خوا ئەمری بەچی کردوە خوا چی بەچاك زانیوە (وما نهى عنه من الإشراك به ومعصيته) خوای تعالی نەهی لەچی کردوە لەشیرك وە لەمعصیەتی خۆیی نابێ معصیەتی بکرێت (فالعوام لا يتعلمون) عەوام ناچن خۆیان فێرکەن ئەمرۆ زۆربەی زۆری خەڵك ئامادەنیە بێت دینەکەی فێربێت ! هەتا کە مەکتەب دانراوە بەحیسابی خۆیان ئەو مەکتەبانە ئەو قوتابخانانە کە زۆربەی زۆری ئەو قوتابخانانە ئەبینین باسی دین و ئیمان و تەوحیدی تێدا

ناكرێت چونكە كەسانێك دايان نەناوە كە بەرەو دينداريمان بەرن ئەوان بەسەراحەت ئەلێن بێ دينى ئەوان بەسەراحەت ئەلێن دوور لەدين هەمووشتێك دوور لەدين ئەو عەلمیانیەتیە كەوا هەشتا ساڵە عالەمى ئيسلامى گرتۆتەوە ئێستا ئەو قوتابخانە و مەكتەبانەى لەسەر ئەساسى هەمووشتێك دوور لەدينداری ئەبێ بەكەيفی خۆمان بيكەين ئينجا چۆن لەوێی فێرئەبن ! باشە ئەلێ مندالەكەت بنێرە مەكتەب بۆئەوەی فێر بێت زانيمان لەوێی دين فێرنابێت ئەلف و بێ يەك فێر ئەبێت بەس ئايە ئەلف وبێ يەكە بۆ قورئان فێر ئەبێت بۆ حەديس فێر ئەبێت بۆئەوە فێر ئەبێت كەوا قورئانى پێى بخوێنرێتەوە يان هەتا تەخەروجيش ئەكا خەتمێكی قورئانيش ناكات ! يان بەس بۆ پارەيە ! ئەساسەكە پارەيە .
كاكە بخوێنە با موستەقبەلێكت هەبێ با معاشێكت هەبێ ! هەر ئەوەندەيە هيچی ترنيە خوێندن بۆ خوێندن نيە جارێی يەكەم خوێندن نيە ئەوە خوێندن نيە عيلم ئەوەيە كەخوا ناردوويەتی ئەوە ئەوشی تێدا ناخوێندرێی كەخوای گەورە ناردوويەتی ، ئەمە يەك .
دووەميش بۆچی ؟ بۆ پارەيە بۆ مەعاشە بۆئەوەيە كابرا خۆيی پێی بژيەنێت ! لەبەر ئەوەيە بەلايەوە زۆر ئاساييە غەش ئەكات هەتا كەوا ئەو كەمە عيلمەش هەيە عيلمی دونيايدا ئەويش بەرێك و پێكی نابات بەرێوە بەغەش و بەساختە ئەيبات بەرێوە بەواستە و واستەكاری بۆيە ئەوەی ئەمرۆ ئەيبنين ئاوهايە لەناو واعيقی موسلمانان ، پاشان ئەلێ ئەمە عەوامەكە ئەی عولەماكان (وغالب العلماء مكبون على علم الكلام والمنطق) زۆربەی زۆری عولەماكانيش بەناوی ئيسلامەوە يانی لەسەر عيلمی كەلام و مەنطيق ئەرۆن (الذي بنوا عليه عقيد تهم وهو لا يحق حقا ولا يبطل باطلا) ئەم عيلمەيان بەحەق بەحەق دائەنێ نەباطيل بە باطل دا ئەنێت ! واتا نەتەوحيد بەتەوحيدی راستەقينە ئەناسێنێت وە نەشيركيش بەخەڵكە كە ئەناسێنێت ! (بل هو كما قال بعض العلماء " : لا ينفع العلم به ولا يضر الجهل به" )[1] ئائەمە هيچ ئيستفادەيەكت پێی ناگەيەنێت ئەگەر بيزانيت وە ئەگەر نەشيزانی زەرەرت لێ ناكەوێت ! ئەو عيلمەی كە ئەوان پێی ئەلێن عيلمی كەلام .

[1] : انظر كتاب الرد على المنطقيين لشيخ الإسلام ابن تيمية ص ٣ ( بنحوه )

## (الفائدة الأولى  الفرح بفضل الله)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلی : (أفادك فائدتين) ئەمانەی کەوتم کە زانیت تێی گەیشتیت دوو ئیستفادە دوو سود بەتۆ ئەگەیەنێت :

یەکەمیان : (الأولى : الفرح بفضل الله ورحمته كما قال تعالى) واتا خۆش حالبوون بەختەوەری بەفضلی خوای تعاب بەرەحمەتی خوای تعالی کە بریتیە لەوەی کە خوای تعالی فەرموویەتی : (كما قال تعالى : ﴿قُلْ بِفَضْلِ ٱللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾)[1]

واتە : ئەی پێغەمبەری خوا ﷺ بەوان باێ با بەچی دلێ خۆشبن بەفضلی خوا و رەحمەت ، فە ضلی خوا ئیسلامە و رەحمەتەکەشی قورئانە با بە ئیسلام و قورئان بەتەوحید و یەکخوا پەرستی دلخۆشبن  کە کەسێك دلخۆشبێ بەدنیا دلخۆشبوون دلخۆشی نیە چونکە دونیا ئەبرێتەوە وئەرەوێتەوە نامێنی کەواتە بەچی دلخۆش بێ ؟ بەتەوحید و بەو یەکخوا پەرستیە بەو ئیسلامە چونکە ئەمە ئەیگەیەنێ بەژیانێکی هەتا هەتایی لەقیامەتدا کە بەهەشتێکی نەبراوەی هەیە نەمردنی تێدایە نەپیری تێدایە نە لەناوچوونی تێدایە نەهیچ شتێکی تێدا نیە کەواتە ئیسنان گەر دلخۆش بێ حەقە بەمە دلخۆش بێ (﴿فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُواْ هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ﴾)[2] ئەمە باشترێکە لەودونیایەی کەکۆی ئەکەنەوە دلیان پێ خۆشە .

(وأفادك أيضا الخوف العظيم) هەروها ئیستفادەی دووەم چیە ؟ ئەوەیە کەوا تۆ ئەبێ زۆر زۆر بترسی لەوەی نەکەویتە ناو شیرك ، چونکە هەر کاتێ بەکویتە ناو شیرك ئەمەت لەدەست دەر ئەچێ ئەم لێخۆشبوونی خوا بەفضلی خۆیی کە تەوحیدی پێ بەخشیوی لێت خۆشببێ ئەگەر ئەمەت لەدەست دەرچێت و بکەویتە شیرکەوە لەدەستت دەرئەچێت وە خوا لێت خۆش نابێت ئەبێ زۆر زۆریش لەوە بترسی کەواتە خۆشحالبی بەتەوحید زۆر وریابی لەشیرك زۆر بترسی لەوەی کەبکەویتە ناو شیرکەوە .

شێخ (صالح) ئەلێ :

(أي العلم بهذه الحقائق يفيدك فائدتين: )ئەوەی کە باسمان کرد تا ئێستا دوو سود بەتۆ ئەبەخشێت :

[1] :سورة يونس اية ٥٨
[2] :سورة يونس اية ٥٨

یەکەمیان (الفائدة الأولى):

(أنك تفرح بفضل الله حيث من عليك بمعرفة الحق من الباطل) خۆشەویستانم با پێتان بلێم هەموو نارەحەتیەکانی دونیا بخەرە لایەکەوە بەس خۆشحالبوون بەتەوحید پێویستە والەتۆ بکات دائیمەن بکرێتەوە هەردەم لەو پەری خۆشیدا بیت دنیا هیچ نیە فەقیربی نەخۆشبی هەتا بەهەر شێوەیەك ژیان بەریتە سەر هەر تەواو ئەبێ کۆتایی پێدیت ، دەولەمەند بیت لەش ساغ بیت بووبی نەبووبی بەڵام ئەگەر بێت و تەوحیدت هەبوو ئەوە حەقی ئەوەیە کە تۆ دڵتی پێ خۆش کەی ئائەوە لەهەموو شتێك گەورەترێکە کەواتە هەرکاتێك ئەگەر غەم خەفەتێکت هەبوو تەماشای تەوحید و ((لا اله الا الله) بکەی یەکسەر دلت ئەکرێتەوە ! کە الحمدلله من موشريك نيم الحمدلله من هاوبەشی پەیداکەرنیم بۆ خوای تعالی چ لەعیبادەتدا چ لەحوکمرانیەتدا یەکخوا پەرستم ، تەنها سەر بۆ ئەو دائەنوێنم ان شاء الله هەر نارەحەتێکیشم بەسەر هات رۆژێك لەرۆژان کۆتایی پێ دێت جا ئەگەر ژیانم کۆتایی پێ بێت و بمرم یاخود لەو نارەحەتیانە بکەومە ناو خۆشیەوە وەکو ئەلێ (إما النصر وإما الشهادة) کەواتە ئینسانی موسلمان نابێ دل داخراو بێت ئەبێ زۆر خۆشحالبین بەتەوحید هەر کاتێك هەر موصیبەتێکت بەسەرهات سەیری تەوحید و (لا اله الا الله) بکە بلێ سوپاس بۆ خوا بەس نیە یەهودی نیم نەصرانی نیم بوذی نیم الحمدلله کە لەسەر ئەو تەوحیدە خوا منی خلق کرد گەورەترین نیعمەتە کە تۆ دڵی پێ خۆش کەی، وانەزانی شتی نەداوە بەتۆ (خيرا مما يجمع) ئەگەر هەمو دونیات هەبێ هیچ نیە بەرامبەر بەو تەوحیدە جا ئەلێ (أنك تفرح بفضل الله حيث من عليك بمعرفة الحق من الباطل) خوا منەتی کردوە بەسەرتدا ئەبێ بەوە خۆشحالبی کەوا زانیاری ئەوەی پێ داویت کەوا ئەمە تەوحیدە وە باطلی بۆ ناساندویت کەتۆ خۆتت لێ دوور خستۆتەوە (فإنها نعمة عظيمة ، حرم منها الكثير من الخلق) زۆرەبی زۆری خەڵك لەم نیعمەتە بێ بەشن با بزانن خوا فەرموویەتی لەقورئانی پیرۆزدا (وَمَا يُؤْمِنُ أَكْثَرُهُم بِاللَّهِ إِلَّا وَهُم مُّشْرِكُونَ)[1] کەواتە سوپاسی خوا بکە کە تۆ موحیدی (قال تعالى : قُلْ بِفَضْلِ اللَّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذَٰلِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِّمَّا يَجْمَعُونَ)[2] شێخ ئەلێ : (وفضل الله هو الإسلام) فضلی

[1] :سورة يوسف اية:١٠٦

[2] :سورة يونس اية :٥٨

خوا ئیسلامه (ورحمته هي القرآن) رەحمەتەکەشی قورئانە کەواتە تۆ بلێ بەئیسلام و بەقورئان ئێوە خۆشحالبن ئەمە باشترێکە لەوەی کەوا ئێوە سەیری دونیا و مال وسەروەت و سامانی دونیا بکەن ئەمرۆ خەڵك وایە ؟ نەخێر هەرچی ئەیبینی دینی و ئیمانی خستۆتە ئەولاوە هەموو غەم وپەژایەیەکی بۆ دونیاکەیەتی خۆشالح ئەبێ هەیبێ نارەحەتیش ئەبێ کەنەیبێ ئەوە کاکە بۆ نارەحەتی ؟ والله چی کەم بەخوا وەزح وگوزەرانم باش نیە ! ئەی لایەنی تەوحید و ئیمان ئەوە هەر باسی ناکات (فليفرحوا فرح شكر واعتراف بالنعمة) خۆشحالبوون یانی خۆشحالی شوکر واتا ئەدای واجباتەکانیان بکەن کە خوا پێ داون وە ئیعتراف بکەن بەنیعمەتەکەی خوا خوایە ئێمە ئیعتراف ئەکەین بەو ئیسلامەیە ئێمە زۆر زۆر سوپاست ئەکەین باقی بێت هەتا ئەگەینەوە بەتۆ ( اللهم يا ولي الإسلام و أهله مسكني الإسلام حتى ألقاك عليه)[1] خوایە بەو ئیسلامەوە پەیوەستمان کەیتەوە هەتا ئەگەینەوە بەتۆ ، (والفرح بفضل الله مشروع) خۆشحالبوون فرح خۆشحالبونە مەشروعە یان نا ؟ بەلی بەفضلی خوا مەشروعە (لأنه شكر لله سبحانه وتعالى على نعمة التوحيد ومعرفة الشرك) لەسەر نیعمەتی تەوحید کە پیادەی ئەکەین وە شیرکمان زانی وە خۆمانی لێ دوورئەخەینەوە (وهذه نعمة إذا وفقت لها فإنه قد جمع لك الخير كله) ئەگەر تۆ مەوفەقبی بەراستی بەمە ئەوە هەموو خێرێکی بۆ کۆکردویتەوە بەهۆی ئەمە ! (الفرح بالنعمة مشروع) کەواتە خۆشحالبوون بەنیعمەتەکانی خوا کە لەسەروویی هەموویانەوە ئیمانە تەوحیدە ئەمە مەشروعە بەڵکو ئەمرمان پێکراوە کە خۆشحالبین (أما الفرح المنهي عنه فهو الفرح بالدنيا) بەس ئەو فەرەحەی کەوا ئێمە نەهی مان لێکراوە خۆشحالبوونە بەدونیا چونکە دونیا ئەڕوات (كما قال تعالى: وَفَرِحُوا۟ بِٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَمَا ٱلْحَيَوٰةُ ٱلدُّنْيَا فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ إِلَّا مَتَٰعٌ)[2] خۆشحالبن بەحەیاتی دونیا بەس بشزانن حەیاتی دونیا بەرامبەر بەئاخیرەت چیە یانی رابواردنێکی کەمە و ئەڕوات و لەناو ئەچێت ! (فالفرح بالدنيا وحطامها مذموم) خۆشالحبوون بەسەروەت و مالی دونیا مذمومە زەمکراوە نابێ ئێمە خۆشحالبین (أما الفرح بالدين والفرح بالعلم النافع فهذا مشروع لأن الله أمر به. ) بەلاّم فەرح خۆشحالبوون بەوعیلمە

[1] : قال الألباني في " السلسلة الصحيحة " ٣ / ٤٦٢
[2] :سورة الرعد اية :٢٦

بەوقورئانە بەو سونەتە بەوتەوحیدە بەو یەكخوا پەرستیە ئەمە خوای تعالی ئەمری پێكردوون جالێرەدا خالێك باس ئەكەین ئەویش ئەوەیەی بەداخەوە ئەوەی ئەمرۆ دەست بداتە ئەم عیلمە خەڵكێكی زۆر ئەتوقێت و دوورئەكەوێتەوە ئەلێ كاكە بەخوا تۆ سەرم ئەكەیت بەقوردا بۆچی چونكە تۆ رازی نابیت بەهیچ كەسێك كەرازی نەبووی بەهیچ كەسێك دووژمنەت زۆر ئەبێ والله منیش تاقەتی دووژمنایەتیم نیە لەجیاتی خۆشحالبێ پێ لێ ئەترسێ و لێ ئەتوقێت بۆیە ناویان ناوە والله ئەمانە تیرۆرستانەن و ئەمانە فلانن ئەمانە فلانن تۆ ئەبێ خۆشحالبی بەمە نەك لێ بترسی و لێ بتۆقی یان خەڵكی لێ دووربخەیتەوە ئەلێ كاكە والله گەر لەسەر ئەمە برۆیت والله ئەتگرن وا وات لێ ئەكەن وەكو ئەوە وایە كەوا پێغەمبەران هاتوون خەلكەكە هەمووی رێحانە و گولیان بۆ داناوە بەعكسەوە پێغەمبەران كە هاتوون یەكسەر خوا پێی وتوون ئێمە دووژمنامان بۆ دروستكردوون ئاگاداری خۆتان بن بۆ هەموو پێغەمبەرێك دووژمنام دروستكردوە نەك هەر لەئیسنان لە شەیتانەكانیش شەیتانی ئینس و جن وە رێكیش كەوتن لەنێوانی خۆیاندا قسە ئەهێنن و ئەبەن بۆئەوەی كە پێغەمبەران و شوێنكەوتانی پێغەمبەران تووشی ئەزەیت و ئازار و دەر دەسەری و نارەحەتی دونیا بكەن ئەمەی پێی وتووین خوای گەورە ئێمە ئەزانین رێگەكەمان زۆر زۆر قورسە بەس زۆر عەجائیبم لەوانە دێت خۆیان بەیەكخوا پەرست و موحید ئەزانن نایەن خۆیان بەرێ بكەن لەتاغوتان و لەموشریكان پێت ئەلێ نا بترسە لەتاغوت كاكە والله بگیرێت وات لێ دەكات ! بەداخەوە یانی زۆر بەداخەوە .

## (الفائدة الثانية)

## ( الخوف من الوقوع في مخالفة التوحيد)

دووەمیان (والفائدة الثانية): (أنك إذا عرفت التوحيد الصحيح وعرفت الشرك القبيح) ئەگەر تۆ تەوحیدی راستەقینەت زانی وە شیركی قەبیح و هەتا بلێ خراپ كە خوای تعالی بەو پەری قەباحەتەوە باسی شیركی كردوە كەوتویەتی گەورەترین زولمە ئەوەت زانی (فإن ذلك يفيدك الخوف أن تقع فيما وقع فيه كثير من الناس بالمخالفة لهذا الأصل) ئەمە سود و ئیستفادەی ئەوە بەتۆ ئەگەیەنێت كەبترسی و نەكەویتە ناویەوە خۆتی لێ دوورخەیتەوە زۆربەی خەڵك

كەوتونەتە ناویی ! بەهۆی موخالەفەی ئەمەیان كردوە موخالەفەی تەوحیدیان كردوە (والوقوع في الشرك وأنت لا تدري) ئەكەویتە ناوشیركەوە بەبیٚ ئەوەی بەخۆت بزانی (فلا تأمن على نفسك من الفتنة فلا تغتر بعملك أو بفهمك) بەوە مەخلەتیٚ بلیٚ من وائەكەم و وائەكەم ! یان واتیٚ گەیشتووم واتیٚ گەیشتووم ! لەهەر لەحەزیەكدا بیت تیٚ ئەكەویت هەتا جاری واهەیە تیٚ ئەكەویت بەخۆشت نازانیت ، كابرا خۆی ئەكەوێتە ناو شیرك بەخۆشی نازانێت ! ئەبیٚ بەموشریك بەخۆیی نازانیٚ (ولكن قل لا حول ولا قوة إلا بالله) (لا حول ولا قوة إلا بالله) واتا ناوتوانین خۆمان لەهیچ شیرك و بیدعە و معصیەتێك بپارێزین إلا ئەبێت خوا یارمەتیمان بدا قوەتیشمان نیە بۆ هیچ تەوحید و سوننە و تاعەتێك إلا بەخوا نەبیٚ ! (واسأل الله الثبات) داوا لەخوا بكە ثەباتت پیٚ ببەخشێت جێگیرت بكات لەسەر ئەوتەوحیدە (فإن إبراهيم الخليل الذي أعطاه الله من العلم واليقين ما لم يعط غيره إلا نبيا يقول) ئەو (إبراهیمە)خەلیلەی كە خوای تبارك وتعالى ئەو هەموو عیلم و یەقینەی پیٚ بەخشیبوو كە بەكەسێكی نەدابوو تەنها بەپێغەمبەرێك نەبیٚ ئەلێت (وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ ۝٣٥ رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ)[1] داوا لەخوا ئەكات ئەلیٚ خوایە خۆم ئەولادەكانم دوورخەیتەوە لەعیبادەتی صەنەمەكان (رَبِّ إِنَّهُنَّ أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ)[2] خوایە خەڵكانێكی زۆریان بەرەو گومرایی بردوە ، هەر بەوە بزانە بەس (إبراهیم)پێغەمبەرﷺ لەگەل خێزانەكانی لەگەل لوط لەزەمانی ئەوەدا موحید و یەكخوا پەرست بوون هەمووی موشریك بوو سەرئەرز هەمووی موشریك بوو كەواتە (أَضۡلَلۡنَ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ) ئەمرۆش وایە خۆشەویستانم دەعوەی شیرك زۆربەی زۆری خەڵك كەوتۆتە ناویی پەنا ئەگرین بەخوای تعالى (فإبراهيم لم يأمن على نفسه الفتنة مع علمه ويقينه) (إبراهیم) بەو پێغەمبەرایەتی خۆیی ئەپارایەوە ئەیوت خوایە وەچەندیش خۆیی دوورە پەرێزیش گرتبوو ! چەند خۆیی لەشیرك و موشریكین دوورە پەرێز گرتبوو چەندێك تەحداشی ئەكردن لەگەلیاندا قسەی ئەكرد بەرامبەریان رادەوەستایەوە كە ئێستا زۆربەی زۆری ماموٚستایانی ئاینی بەروبعی روبعی روبعی ئەو غیرەتیان نیە بەرامبەر بەتاغوتان رابوەستنەوە بلێن لەخوا بترسن و

[1] :سورة ابراهيم اية : ٣٥-٣٦
[2] :سورة ابراهيم اية : ٣٥-٣٦

بەقسەی خوا بكەن بەڵكو ئەچن پاساوییان بۆ ئەهێنەوە بەداخەوە ئەو (إبراهیم)ە لەبەر دەمی ئەو نەمرووده تاغیە راوەستا پێی ئەوت من بەریم لەتۆ ! من دووژمنی تۆم ! من رقم لەتۆیە ! هەتا ئیمان نەهێنی بەخوای تعالی ! (وهو الذي كسر الأصنام بیده) لەكاتێكیشدا بەدەستی خۆیی صەنەمەكانی شكاند لاتان معلومە (وألقي في النار بسبب ذلك) خرایە ناو ئاگریشەوە ! عقوبەش درا باشە ئاگر گەورەترین عقوبە نیە ! لەدونیاش و لەئاخیرەتدا ! خوای گەورە بۆ لەئاخیرەتدا ئاگری داناوە ! ئاگر گەورەترین عقوبەیە كە خوا دیناوە خراپە ناو گەورەترین عقوبەشەوە ! كەچی بەهیچ شێوەیەك پاشگەزنەبوویەوە نەیوت مەمخەنە ناو ئاگرەكەوە قەینا من پەشیمان ئەبمەوە ! عەزیمەتی وەرگرت ئەوە رێگەی ئێمەیە رێگەی ئێمە بەرەو ئاگری دونیایە ئاگادار بن یانی موسلمانی راستەقینەی موحید نابێ چاوەری ئەوە بكات بەگول و رێحانە خەڵك بەخێرهاتنی بكات ! ئەبێ چاوەری ئەوە بكات حەقیقەت بلێ و خەڵكیش بلێت ئەوە مان ناوێت ! چونكە خەڵك زۆربەی زۆری وایە ئەگەر باشبوونایە ئەوە وامان لێ نەدەهات كە ئێستا زەلیل و بێ دەسەلاتین لەبەر دەستی دووژمنانی ئەم ئیمانە ، (فإبراهیم لم یأمن على نفسه الفتنة مع علمه ویقینه وهو الذي كسر الأصنام بیده وألقي في النار بسبب ذلك ومع هذا یخاف على نفسه من الفتنة) ئینجا لەگەل ئەوەشدا ئەترسێ ئەی ئێمە نابێ بترسین ! ئەبێ شەو ورۆژ بپارێنەوە بلێن خوایە گیان لەسەر ئەو دینەی خۆت ثەباتمان پێ ببەخشە هەتا ئەگەینەوە بەتۆ (فلا تغتر بعلمك وتأمن على نفسك من الفتنة) هیچ كاتێك بەعیلمی خۆت مەنازە وە ئەمین مەبە كە ناكەویتەوە ناو فیتنەوە ! فیتنە لێرەدا ئەوە نیە كە بگیرێت لەسەر حەق و عەزاب بدرێت فیتنە ئەوەیە كەتۆ بكەوێتە ناو شیرك وضلالەتەوە مل بدەیت بۆ شیرك وضلالەت (ولكن كن دائما على حذر من الفتنة بأن لا تزل بك القدم) پێتان نەخلیسكێ تووشی شیرك وضلالەت ببیت (وتغتر بشيء یكون سببا لهلاكك وضلالك) ئەمرۆ هەلاك و ضلال ئەوەندە زۆرە رێگاكانیان ، وەرە پالێ من فلان شتت بۆ ئەكەم وەرە پالێ من راتبت ئەدەمێ ، وەرە دەنگ بۆمن بدە ئەوەت بۆ ئەكەم ! ئەمە ئەهەمووی ئەو پێ هەلخلیسكانانەیە كەتۆ تیای ئەكەویتە شیرك و ضلالەت و بەخۆشت نازانی وەزۆربەی ئەلێ بۆدونیایە ، یاخود قسە لەگەل زاناكانیان بكەی یاخود خۆیان بەداعی و یەكخوا پەرست ئەزانن ئەلێ كاكە خۆمن بەدلێ نەمكردوە ئەوشتە ! ئایا خوای تعالی

لەئێمە رازی ئەبێ بلێ والله بەدڵ نەمكردوە ئەو ئیشە ! ئەبێ بەریی بیت و لەدلەوە رقت لێیان بێت وە بەظاهیریش عەداوە بەغضایان بكەی چۆن ئەبێت بچیتە پالیان ئێمە ئەوەندە بۆ ئەوكەسانە باس ئەكەین ئەلێن ئەگەر (ئەبو جهل و ئەبو لهب) لەزەمانی ئەواندابوویتایە ئەچوویتە پالّیان پارەی لێ وەربگریی دژی پێغەمبەر ﷺ بلێ والله بەدڵ لەگەیاندا نیم قبولە ؟! قبول نیە ، كەواتە ئەبێ بەرائەتی دوور و نزیكیان لێ بكەیت لەناوەرۆكەو لە ظاهیرەوە ئەبێ هەموو موسلمانێك خۆیی لە ضلال و ئەهلی ضلال دووربخاتەوە تەنها رێگە راستەكەی خوا نەبێ كە ئیسلامە . (فإن بعض المغرورين اليوم يقول إن الناس تجاوزوا مرحلة الجهل) هەندێك لەو كەسانەی كە هەلخەلەتاون ئەلێن ئەلێن خەڵكی ئەمرۆ مەرحلە و قۆناغی نەزانینی تێپەركردووە ! (والبدائية وصاروا مثقفين واعين) والله كاكە بۆتە شارەزا و موسەقەفە ولێزانە (لا يتصور أن يعودوا للوثنية) جارێكیتر ئێمە ناگەرێنەوە بۆ ئەوە (للوثنية) چیە ؟ئەوەیە كە بۆ (لات ومەنات) سەر دابنوێنین بۆ بتەكان سەر دابنەوێنین ! ئەی بۆ زیندووەكان كە ئەمرۆ سەردائەنوێنیت و خۆتی بۆ كرونش ئەكەیتەوە بەقسەی ئەكەیت و قسەی خوا لەولا فرێی ئەدەیت و قسەی ئەو ئەخیتە سەرسەرت ! (أو نحوا من هذا الكلام الفارغ ، ولم يفطن لعبادة الأضرحة التي تنتشر في كثير من البلاد الإسلامية ، ولم ينظر فيما وصل إليه كثير من الناس من الجهل بالتوحيد. ) ئایا لەناو ئەمرۆیی ئێمەدا لەهەموو ولات و شارۆچكەكان سەیربكە لەهەردوو روانگەكەوە چ لەروانگەی عیبادەت كردن بۆ قەبر و بۆئەوانەی كەمردوون ! وە چ لەروانگەی سەمع و تاعە بۆ ئەو زیندووانەی كەوا منهەجی خوایان پێ خوار كردووینەتەوە بەسەر مەنهەجە ضالەكەی ئەواندا ئەرۆیی هەردووكی مەوجودە یان نا !؟ زۆربەی خەڵكیش لەسەری ئەڕوات یاخود نا !؟ كەواتە بزانن رێگەی راست تەنها ئەوەیە بلێت (لا اله الا الله ، لا معبود بالحق الا الله ) شوێن هیچ كەسێك ناكەوێن وە بەرییبیت لەشیرك و موشركین بەهەر ناوێكەوە هەبێت بەناوی (لات و مەنات و عوزا)بێ بەناوی پەرستنی (ود وسواع و نصر) بێ بەناوی ئەنضیمە و یاسا و رێساكانی ئەمرۆ بێ بەناوی هەرشتێكەوە بێ ئەمڕۆ خەڵكی رێگەی لێ لێل كراوە تەنها لەخوا دوورخراوەتەوە شوێن هەموو شتەكانیتر خراوە .

**(فإنك إذا عرفت أن الإنسان يكفر بكلمة يخرجها من لسانه وقد يقولها وهو جاهل فلا يعذر بالجهل.)**

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێت **(فإنك إذا عرفت أن الإنسان يكفر بكلمة يخرجها من لسانه وقد يقولها وهو جاهل فلا يعذر بالجهل)** ئەم مقطعه لە عیبارەتی شێخ هەتا بلێ مقطعیکی گەورەیە تێ گەیشتنی وە تێگەیشتی لەسەر زۆر کەس هەتا بلێ صعب و نارەحەت و گرانە بۆیە پێویستە ئاگەداربین لەشەرح کردنی کەلامی شێخدا بگەرێنەوە بۆ للای شێخ خۆی لەکتێب و رسلئیلەکانیدا وە چی لەو بارەیەوە وتوە وەپاشان شەرح کردنی ئەم عیبارەتە لەلای ئەولاد و ئەعفادی شێخەوە وە لەلای علمایان دەعوەی نجدیەوە چونکە بەراستی ئەم مەسئەلەیە مەسەئەلەیەکی زۆر قورسە !

ئایا ئینسان ئەگەر نەزانبێ بە ئوموری شیرك و توحید ئایە هیچ عوزرێکی هەیە یان نیەتی ؟

ئایا ئەو کەسەی بکەوێتە ناوشیرکەوە ئەبێ بەموشریك یان نابێ بەموشریك ؟

ئەمە لەئەمرۆی ئێمەدا بەراستی مەسئەلەیەکی زۆر گەورەیە خەلك تیابۆتە چەند فیرقەیەکەوە هەریەك بەشێوەیەك لەم مەسئلەیە قسەئەکا بەلام پێویستە ئینسان بەعیلم نەبێ قسەی لێ نەکا بگەرێتەوە بۆلای علماء بۆشەرح کردنی ئەم جۆرە بابەتانە بەتایبەتی ئەم عیبارەتانە کەدێاە پێشەوە جاری وا هەیە تەماشا ئەکەی شاریحی (کشف شبهات) ئەوکەسانەی کەشەرحی ئەکەن بەگوێی ئەو بۆچوونەی کە هەیەتی بابەتەکەی شێخ شەرح دەکاو ئەیگەرێنێتەوە لەبەر ئەوە پێویستە لەسەرمان وەکو وتمان بگەرێنەوە بۆلای کەمی شێخ لەکتوب و ریسائیلەکانیدا کە إن شاء الله کە بەدرێژی باسی ئەکەین لەسەر ئەم بابەتە إن شاء الله بەتێر وتەسەلی باسی ئەکەین چونکە ئەم مەسئەلەیە تێگەیشتنی ئەوێی چونکە مسئەلەیەکە زۆرکەم کەس پێی هەزم ئەکرێی ئایا ئەگەر کەسێك جاهیل بێ بە(لا اله الا الله) بەشیرك و توحید بەئوموری ئیمان ئایە ئەو کەسە کەبەرجەهالەتە ئەکەوێی ئەکەوێتە ناوشیرکەوە ئایە موشریك ئەبێ ئەبێ پێ

بوترێت موشریك یاخود بێ ناوترێی موشریك موشریکیش لەسەر چەند بەشە واتا ئایە موشریکێك لەهەمان کاتدا خوا تعزیبی ئەدا بەسەر موشریکەکە کەوتۆتە ناویەوە کەنایزانی یان تعزیبی نادا هەتاوەکو پێی نەوترێی یانی لێرە ئەتوانین قەزیەکە بەم شێوەیە زۆر

بەئاسانی شەرح بكەين بلێن بۆچوونی شێخ وایە كە لەدینی ئیسلام تێ گەیشتوە لەئایەتەكان لەحەدیسەكان لەكەلامی علماء شەرحی توحید وئیمانمانن ئەوها بۆ ئەكا ئەگەر كەسێك بكەوێتە ئوموری شیركەوە بۆ نمونە بلێ(یا رسول الله) والعیاذ بالله ﷺ یاخود نەزرێك بۆ جگە لەخوای تعالی بكەی یاخود هەر جۆرە عیبادەتێك لەعیبادەتەكان بكا بۆ غەیری خوای تعالی شەریك قەرار بدا ئایە موجرەدی ئەوئیشەی ئەوكابرایە ئەبێت بەموشریك یان نابێت بەموشریك ئەمە نوقتەیەك وە كە بوو بەموشریكیش ئایا ئەو كەسە لەسەر ئەوشیركە لەلای خوا تعزیب ئەدرێی ئەگەرچی پێشی نەوترابێ یا تەعزیب نادرێی كەواتە بابیكەین بەدووبەشەوە :

*یەكەمیان : بەلی ئەو كەسە ئەبێ بەموشریك چونكە ئینسان لەدوو كەس زیاتر نییە یان موحیدە یاخود موشریكە كەسێك ئەگەر بێتوو موحید نەبوو موشریكە ئەگەر موشریك نەبوو موحیدە ئەگەر كەسێك وتی (یارسوالله) ئەتوانی پێی بلێن ئەو كەسە موحیدە ؟ ئەگەر كەسێك نەرزی كرد بۆ غەیری خوا ئەتوانی پێ بلێن موحیدە ؟ ئیشەكەی كیتاب و سوونە دەلالەت ئەدا كە ئەوئیشە بكا ؟نەخێر .ناتوانی كەواتە لەرێزی موحیدین نییە لەریزی موسلیمین نییە هاتە ریزی موشریكین(أشرك بربهم) ئایە ئەم حالەتەدا ئەم شەخصە خوای تبارك وتعالی هیچ عوزرێكی بۆ دائەنێ كەوا عەزابی نەدا لەسەر ئەم شیركەدا كە ئەی كەی بەلێ ئایەتمان هەیە خوای تعالی ئەفەرمووی(وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[1] ئایەتەكە ئەلێ من تەعزیبی هیچ كەسێك نادەم هەتاوەكو پێغەمبەری بۆ نەنێرین و تێ بگەیەنێت كە تێ گەیشت و عینادی كرد ئەوكاتە تەعزیب ئەدرێی بەلام ئایە ناوی موشریكی لێ ئەكرێتەوە نەخێر ناوی موشریكی لێ نابێتەوە ئەو كەسە موشریكە بەلام تەعزیب نادرێ هەتاوەكو دەعوەی حەقی پێ نەگا ئەی ئەگەر مرد ودەعوەی حەقی پێ نەگەیشت ؟ ئەلێن لەرۆژی قیامەتدا خوا ئیمتحانی ئەكا لە ضمنی ئەهلی فترە حیسابی ئەكا كە ئوانە حەپیان پێ نەگەیشتوە كەواتە قەزیەكە ئێستا یەلابویەوە كە بەم شێوەیە كەباسمان كرد ئەو كابرایەی بكەوێتە ناوشریكەوە ئەبێ بەموشریك ئەگەر پێی وترا ئەمە شیركە و هەرلەسەری بەردەوام بوو ئەوە إقامە حوجەشی لەسەر كراوە ئەو كابرایە معزەبیش ئەبێ لەدوینا و لەوقیامەت

---

[1] :سورة الإسراء ایة ١٥:

لەسەری بەلام ئەگەر پێ نەوتر نەیزانی لەجێگەیەك بوو كە نەیزانی بۆ نمونە ئێستا ئەو ئەفریقایانەی كە لە ئەفریقادا ئەژین لەجنوبی ئەفریقا ئەین ئەوانە نەئاگایان لەقورئان نە لەئیسلام نەلەحەدیس هەتا عەرەبی نازانن ئەوانە دار ئەپەستن بەرد ئەپەرستن بەروت و قوتی ئەیان بینی دارێك ئەپەرستی ئایە ئەم شەخصە موسلیمە یاخود موشریكە ؟ ئەمە موشریكە گومانی تێدا نیە موشریكە بەس ئایا عەزاب ئەدرێی ئەم شەخصە هەتا پێ نەوترێ خوای تعالی لەقورئاندا فەرموویەتی (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا)[1] كەواتە ئایەتەكە باجوان تێ بگەین لێرە خەلەلێكی زۆر هەیە لەتێگەیشتن لەو ئایەتە ئایەتەكە نالێ ئێمە خەلك بەكافر دانانێن هەتا پێفەمبەرتان بۆ نەنێرین ئەلێ تەعزیبیان نایەن هەتا پێغەمبەر نەنێرین كەواتە ئەو كەسەی كەشیرك ئەكا ئەوە موشریكە ئینجا ئەگەر پێی گەیشت بەقسەی نەكرد ئەوە تەعزیب ئەدرێی لەسەری ئەوە إقامە حوجە كراوە لەسەری ئەمە بەنیسبەت ئەسلی مەسەلەكەوە .

شێخ(صالح) ئەلێ:

(**فإنك إذا عرفت أن الإنسان يكفر بكلمة يخرجها من لسانه**)ئەگەر تۆ ئەوەت زانی ئینسان بەیەك كەلیمە كە لەزمانی دێتە دەرەوە پێی كافر ئەبێ (**وقد يقولها وهو جاهل فلا يعذر بالجهل**) جاری وا ئەم قسەیە ئەكا جاهیلە بەمانای قسەكەی خۆی نازانێ كەچی لەهەمانكاتیشدا هیچ عوزرێكی نییە جەهل نابێ بەعوزر بۆ ئەوەی پێ بلێ واللە كاكە ئەمە جاهیلە كە ئەو قسەی كردووە نەیزانیوە حوكمەكەی بەسەردا تطبيق ئەبێ یانی (ومن وقع في الشرك وقع عليه)شێخ فەوزان ئەلێ (**قد يقول الإنسان كلمة من الكفر تحبط عمله كله**)جاری وایە ئینسان كەلیمەیەك ئەلێ لە كوفر هەموو عەمەلەكەی خوای گەورە لەناوی ئەبات و هیچ ئەجر و پاداشتی ناداتی و وە ئەو كەسە ئەبێ بەكافر (**كالرجل الذي قال : واالله لا يغفر االله لفلان**)[2] ئەو حەدیسەیە كە كابرایەكی متەقی لەگەل كابرایەكی تاوانبار تاوانبارەكە هەر تاوانی ئەكرد كابرا موتەقیەكە موسلمانەكە كە لەپێش دیارە پێغەمبەرەوە پێش ئومەتی ئێمەوە بووە ﷺ ئەلێ بەكابرای هەرئەوت مەكە مەكە هەتا ڕۆژێك لێ تورە بووتی واللە خوا

[1] :سورة الإسراء اية :١٥
[2] : مسلم البر والصلة والآداب (٢٦٢١)

لێت خۆش نابێ (**فقال الله جل وعلا : من ذا الذي يتألى علي أن لا أغفر لفلان ، إني قد غفرت له وأحبطت عملك**)[1] ئەوە کێ یە سوێند دەخوا کەمن لەفلان کەس خۆش نابم والله من لەو خۆشبووم بەس عەمەلی تۆم هەموو پوچەل کردەوە یالا بۆ ئاگری جەهەنم . ئەم کابرایە کە ئەم قسەی کرد لەکاتێکدا قسەی کرد یانی ناپرسێ لەقسەکەی خۆی قسەکە زۆر گەورەیە بەهۆی قسەیەکەوە کە گوێی پێ نەدا چی بەسەرهات تووشی ئەو حبوتی عەمەلە بوو ئەمە نمونەیەك .شێخ ئەلێ (**كلمة واحدة تجرأ فيها على الله وأراد أن يمنع الله أن يغفر لهذا المذنب**) کەلیمەیەك بوو جورئەتی کرد کە بیلێ کە خوا لەفلان کەس خۆش نابێ ئەوەبوو خوای تعالی چی لێکرد (**فالله جل وعلا أحبط عمله وغضب عليه**) خوای گەورە حبوتی عەمەلی کرد و وەلێ تورەبوو.

(**والإنسان قد يتكلم بمثل هذه الكلمة ونحوها**) یانی ئێستا تەماشا کە ئەمە باسی نمونەیەك بوو نمونەیەکی ترمان بۆ ئەهێنی ئەلێ ئینسان جاری وایە (**قد يتكلم بمثل هذه الكلمة ونحوها فيخرج من دين الإسلام**) جاری وایە کەلیمەیەك ئەلێ یان بەهەمان شێوە ئەهێنی ئەو کەلیمانە تەماشا ئەکەی بەهۆیەوە لەدینی ئیسلام ئەچێتە دەرەوە بەکەلیمەیەك ، نمونە ئەهێنێتەوە ،شێخ (صالح) ئەلێ(**فالذين مع النبي ﷺ لما قالوا : ما رأينا مثل قرائنا هؤلاء أرغب بطونا وأكذب ألسنا وأجبن عند اللقاء ! يزعمون أهنم قالوها من باب المزح ويقطعون هبا الطريق بزعمهم قال الله فيهم** : ﴿قُلۡ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمۡ تَسۡتَهۡزِءُونَ ٦٥ لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ﴾)[2] باسی هاتنەوەی صەحابەمان لەگەل پێغەمبەرا بۆ دەکا ﷺ کاتێك کە لەجیهاد گەرانەوە ئەوە بوو مەجموعەیەك لەوان لەرێگایە کەوتبونە سوبعەت کردن و وتیان وێنەی پێغەمبەر و صەحابەکانمان وا دێتە پێش چاو کە کەسانێکن هەر سکی خۆیان زل دەکەن هەر درۆئەکەن و وە زۆر زۆر درۆزن و کەسانێکی لەکاتی شەرا لەبەرامبەرەکانیاندا ترسنۆکن ئەمجۆرە قسانەیان کرد ! ئەشیان وت ئەمە لەحالەتی سوبعەت و پێکەنینا ئەم قسانەمان کردوە خۆ بەراستیمان نەبووە مەخسەدمان نەبوە لەدلەوە نەهاتۆتەدەر بەس کەلیمەیەك بووە یانی ئەم قسانەیان ئاراستەی پێغەمبەر و صەحابە کرد ﷺ خوای تعالی

[1] : مسلم البر والصلة والآداب (٢٦٢١)
[2] :سورة التوبة اية :٦٥-٦٦

ئايەتى ناردە خوارەوە فەرمووى (قُلْ أَبِٱللَّهِ وَءَايَٰتِهِۦ وَرَسُولِهِۦ كُنتُمْ تَسْتَهْزِءُونَ )[1] تۆ بلىٚ بەخوا و بەئايەتەكانى و بەپێغەمبەرەى خوا ئێوە گالتە و گەمە ئەكەن ئێوە قەشمەرى ئەكەن و سوبعەت ئەكەن ؟(لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ)[2] ئێوە هيچ عوزر مەهێننەوە تازە كافربوون لەدواى ئيمانەكەتان شێخ ئەلێ (**دل على أهنم مؤمنون في الأول**)ئەمە دەلالەتە لەئايەتەكەدا كە ئەلێ (لَا تَعْتَذِرُوا۟ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَٰنِكُمْ) كە موئمين بوە لەدوايدا بەهۆى ئەمەوە كافربوون (**فلما قالوا هذه الكلمة كفروا – والعياذ بالله** )كە كەليمەكەيان وت پێى كافربوون وەكو ئەمرۆ ئەبينى زۆر كەس پەنا ئەگرين بەخوا كوفر ئەكا هەتا بەكەيفى خۆى پىٚ ئەكەنى گوێى ناداتىٚ قەشمەرى ئەكا بەدين قەشمەرى ئەكا بەنوێژ و بەرۆژوو بەبەشەكانى دين  و بەگەورە و بچوكى دين كەيەكێك لەنواقضەكان ئەوەيە هەركەسێك شتێكى پىٚ ناخۆش بىٚ كە پێغەمبەر هێنابێتى ﷺ يان إستفزاى پىٚ بكا يان يان ئەوكەسە پێى كافر ئەبىٚ ئەگەر خۆشى ئەنجامى بدا و بيكا ، جالێرەدا ئەلێ ئەوانە كەليمەيەكيان وت كەليمەكە بەهۆيەوە پێى كافربوون (**مع أهنم يقولوهنا من باب المزح واللعب.** ) نەيان وت ئێمە بەئەنقەست كردوومانە نەيان وت ئێمە لەدلەوە وتومانە و كردوومانە بەڵكو لەپێكەنين و سوبعەت وريٚگەمان بريوە بەهۆى ئەمە قسانەوە حەزمان كردوە قسە و قەشمەريات بكەين لەرێگا بەلاٚم خواى تعالى ئەمەى لێ قبول نەكردن و كافرى كردن بۆيە ئە نمونانەى هێنايەوە شێخ لەسەر ئەوە ئێمە ئەگەر نمونە بێنينەوە لەسەر مەسئەلەكە لەپێشدا باسمان كرد بەتايبەتى ئوموری ئيمانى ئەوشتانەى كە ظاهرن هەركەسێك ئەگەر بێتو قسە بەنوێژ و رۆژوو و زەكات و حەج ئەمانە شتێكى ديارن هيچ كەسێك نييە لەموسلمان ئەمانەى لا شاراوە بێت  كەئەمانە دێنن هەركەسێك قسە بەمانە بلێ بەمجرد قسە پێ وتنى پێى كافر ئەبێ چ جا قسە بەخوا و بەپێغەمبەرەكەى و بەدينەكەى  وەكو ئێستا ئەيبيستين زۆربەى زۆرى ئەوانەى بەناوى سەلەفيەتەوە قسەئەكەن ئەلێن كابرا جاهيلە جوێنى بەخوا دا ئەلێن نا جاهيلە جوێنى بەپێغەمبەردا جاهيلە ئايا لەلاى خوا ئەمە ئەخوات باشە تۆ ئەلێ ئێمە كەسێك كافر ناكەين مەگەر خوا و پێغەمبەرى خوا كافرى كردبن خۆ خوا و پێغەمبەرى خوا ئەوانەى كافر كردووە خواى تعالى لەقورئان

---

[1] : سورة التوبة اية :٦٥

[2] : سورة التوبة اية :٦٦

فەرمووی ( لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ)[1] بەلاَم تۆ چیت هەتا بلیَ ئەوان کافر نابن بەعکسەوە علماء ئەفەرموون ئەگەر تۆ کافری نەکەی ئەو کەسەی جویَن بەپیَغەمبەر ئەدا ﷺ تۆ کافری نەکەی خۆت کافری خۆت یانی ئەگەر تۆ کەسیَك کافر نەکەی کە جویَنی بەخوا و بەپیَغەمبەری خوا داوە تۆ خۆت کافر ئەبیَ (الناقض الثالث من نواقض الإسلام : من لم يكفر المشركين أوشك في كفرهم أو صحح مذهبخم فقد كفر )ئیجماعی ئەهلی عیلم لەسەر ئەوەیە کە هەرکەسیَك موشریك وکافر کافر نەکا بۆخی کافر ئەبیَ جا ئەبیَ ئاگا داربین ترساندنمان بەتکفیر بەکافرکردن نابیَ لەو بابەدا بیَ کە کوفری کافرە ئەبیَ لەبابی کوفری موسلماناندا بیَ موسلمان کافرکردن کابرایەك موسلمانە کە ئەکەویَتە ناو فاحیشەیەکەوە گوناهیکەوە دزیەك زینایەکەوە درۆیەکەوە تۆبلیَ کافربووی لەوە بترسە ئەو کافر نابیَ ئەوە معصیەتی کرد بەس کاتیَك کوفریَك ئەکا شیرك ئەکا لەقورئان ئەدا یان لەحەدیس ئەدا لەدین ئەدا نەقد لەخوا ئەگری والعياذ بالله ئەمە لەقورئانیشدا دەلیلمان هەیە لەحەدیسیشا دەلیلمان هەیە ئیجماعی قەولی ئەهلی علمیشملن هەیە بەکافربوونی ئەو کەسانە بەلکو ئەگەر ئەوەی ئەگەر کافریشی نەکا کافر ئەبیَ ،سەیرکەن

(وقد يقولها وهو يظن أنها تقربه إلى الله تعالى كما كان يظن المشركون)

جاری وایە قسەیەك ئەکا وائەزانیَ لەخوای نزیك ئەکاتەوە کەچی پیَی کافر ئەبیَ هەروەکو موشریکەکان لەکاتی خۆیدا ئەیان وت (مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ)[2] لیَرەدا مەبەستیان چی بوو ؟ ئایەتەکە ئەلیَ (وَهُمۡ يَحۡسَبُونَ أَنَّهُمۡ يُحۡسِنُونَ صُنۡعًا)[3] خۆ ئەوان قصدی کوفریان نەبوە ! کەچی پیَشی کافر بوون ئاگاداری ئەم خالَە بن زۆر گرینگە یانی کابرا ئەیەویَی داوا لە (لات و منات و عوزا )بکا ، لە (يعوق و نصر وصواع) بکا لەمەلائیکە بکات لە عیسا بکا لەبەر ئەمەوەی بە بەحیسابی خۆی ئەمانە صالحن لەبەر ئەوەی بەحیسابی ئەو ئەوانە شەفاعەتیان لەلای خوادا ئەروات بۆیە ئەیەویَت دوعا بکا ئەمە هەستەکەیەتی کەچی پیَی کافر ئەبیَ خوای گەورە کافری کردن وە بەهەمان شیَوە لەئومەتی ئیَمەدا کەهاواری

[1] :سورة التوبة اية :٦٦
[2] : سورة الزمر اية :٣
[3] : سورة الكهف اية :١٠٤

صالحینی ئومەتی ئێمە بكەی چ فەرقی هەیە بلێ (یا یعوغ و نصر صواع)لەگەل ئەوەی بلێ (یا عبدالقادر، یاعمر )چ فەرقی هەیە ؟ چ فەرقی هەیە بلێ (یا عیسا) پێی كافربی بلێ (یا محمد)پێی كافر نابی ؟ نەخێر بەهەمووی كافر ئەبێ جالێرەدا كابرا واهەست ئەكا پێی نزیك ئەبێتەوە لەخوا ئەلێ (كما كان یظن المشركون).

شێخ(فوزان) ئەلێ :

(أي يقول كلمة الكفر وهو يظن أنها تقربه إلى مثل ما يقول المشركون) كەلیمەیەك ئەلێ لەكەلیمەی كوفر وائەزانێ نزیكی ئەكاتەوە هەروەكو موشریكەكان ئەیانوت (مَا نَعۡبُدُهُمۡ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَآ إِلَى ٱللَّهِ زُلۡفَىٰٓ)[1] ئێمە نایانپەرستین بەڵكو لەخوامان نزیك ئەكەنەوە ئێمە ئەیان كەین بەوەسیلەی خۆمان (هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ)[2] ئەمانە تكاكارمانن لەلای خوای تعالی .

**(خصوصا إن ألهمك الله ما قص عن قوم موسى مع صلاحهم وعلمهم ، أنهم أتوه قائلين : (ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞ)[3] فحينئذ يعظم حرصك وخوفك على ما يخلصك من هذا وأمثاله. )**

شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) فەرمووی : بەتایبەتی ئەلێ كاتێك كە خوا ئەمەت فێر ئەكا ئیلهامی ئەم عیلمەت ئەكا كە خوا بۆ سەر قەومی موسا ئەمەی بۆئێمە گێرایەوە لەكاتێكدا كە چەندێك صالح و بەعیلم بوون هاتن بەپێغەمبەرەكەی خوایان وت چی وە ئەمە لەكەیدا بوو ؟ كاتێك كە لەدەستی فیرعەون رزگاریان بوو لەبەحر چوونە ئەوبەرەوە قەومێكیان بینی بتیان ئەپەرست ئەصنامیان دانابوو ئەیان پەرست ئەوانیش ئەمەیان پێی جوان بوو پێی باشبوو ئاگاداربە كە ئەوان داوایان كرد وتیان (ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا) مەبەستیان ئەوە نەبوو كەئائەوە وەكو بۆمان دروست كە ئەوە خوای ئێمەیە ئێمە تەنها ئەوە ئەپەرستین ئەمە نا ئەمە ئەیان كرد بەچی ؟ ئەیان وت راستە خوا ئێمەی دروست كردوە ئەبێ عیبادەتیش بۆ ئەو بكەین بەس لەسەر رێو رێچەی ئەوانە شتێكمان بۆ دروست كە بۆئەوەی ئێمەش وەكو ئەوان عیبادەت بكەین ! نەك ئەوەیان بەلاوە بتەكانیان بەلاوە خالق و رازق و متدبیر بێ نا

[1] : سورة الزمر اية :٣
[2] : سورة يونس اية : ١٨
[3] :سورة الأعراف اية : ١٣٨

یان بتەکانیان بەلاوە إلاله حەق بێ ئەیان وت نزیکمان ئەکاتەوە لەخوا ! بەموجەرەدی ئەوە ئایەتەکە ئەلێ (ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا)[1] .

یەکەم : ناوی برد بە إلاله .

دووەم : پێغەمبەر موسا چی وت لەکاتێکدا ئەوان ئەوەیان کرد پێغەمبەر موسا ڕەدی دانەوە لەوەی کەوا ئەوەی ئێوە ئەیلێن لەگەل گەورەی خوادا ناگونجی بەراستی ئێوە قەومێکن جەهالەتان هەیە بەرامبەر بە گەورەی خوای گەورە خوای تعالی لە پەرستنیدا نابێت هیچ شتێك بکەی بەواسطە لەهاتنی شەریعەت پێغەمبەر واسطە لەهاتنی شەریعەت پێغەمبەرەکە واسطە پێغەمبەرەکە نوێنەرە لەنێوان ئێمە خوادا پێغەمبەرە پەیام هێنەرە ئەو ئەمان داتێ بەس لەگەرانەوەی عەمەلی ئێمە بۆلای خوای تعالی نابێ هیچ شتێك لەنێوانمان دا هەبێ نە صەنم نە بت نە ئاراء و بۆچوونی ریجال نە ئەحکامی بەشەریی و دروستکراو نابێ هیچ شتێك هەبێ ئەبێ تەنها بەشەریعەتەکەی خوای گەورە وە بەتەنهاش بۆ خوای گەورەیی بگەرێنینەوە .

(فحينئذ يعظم حرصك وخوفك على ما يخلصك من هذا وأمثاله) ئەگەر تۆ ئەمە تێ گەیشتی ئەو کاتە بەراستی رزگار ئەبی وەترسێکی زۆرت لێ ئەنیشێت لەوەی کەوا رزگارت ئەکا بەهۆی ئەوترسەوە رزگار ئەبی لەوێنەی ئەو جۆرە شیرك لەوێنەی ئەو جۆرە بت پەرستی و ئەو جۆرە واسطە دانانە بۆخوای تعالی

شێخ (فوزان ) ئەلی :

(قوم موسى هم بنو إسرائيل) هەمووتان ئەزانن کەوا قەومی موسا (بەنی ئیسرائل÷)بوو واتا ئەولادەکانی (يعقوب )بوون (الذين آمنوا بموسى)کە ئیمانیان بەموسا هێنا (خرجوا معه من مصر حيث أمره الله أن يخرج بهم فرارا من فرعون) ئەمری کرد لەدەستی فیرعون دەرچن میسر بەجێبێلن (فخفي عليهم هذا الأمر مع أنهم علماء) ئەم شتەیان لێ شارایەوە مەسئەلەی (ٱجۡعَل لَّنَآ إِلَٰهٗا كَمَا لَهُمۡ ءَالِهَةٞۚ)[2] بەشێوەیەك لەشێوەکان تەماشایان ئەکرد کە شتێکی غەریب و قورس نەبوو بەلایانەوە هەروا بە سەلیقەیەك وتیان تۆ شتێکی ئاوامان بۆ دروست

[1] :سورة الأعراف اية : ١٣٨
[2] : سورة الأعراف اية : ١٣٨

کە باخوا بەم شێوەیە بپەرستین یانی ئاوا لەخوا نزیك ببیەنەوە ! لەکاتێکدا عولەماشیان تێدابووە (وفيهم صلاح وتقوى ، وخرجوا مع موسى مقاطعين لفرعون وقومه) ئەوە فیرعەونیان بەجێ هێشت ئەوان ئەو تاغوتەیان بەجێهێشت ئەلێن ئێمە بەس ئیمانمان بە إلاله ی موسا هەیە کەچی لەولاشەوە ئەبینی ئەکەونە ناوشتێکی ئەوهاوە ! (فلما أتوا على قوم يعكفون على أصنام لهم) کەهاتن بۆ ئەوبەری و ئەوقەومەیان بینی کەوا چەند صەنەمێکیان داتاشی بوو و ئەیان پەرست بەهۆی ئەوانەی عیبادەتیان بۆ خوا ئەکرد یانی ئەوانیان کردبوو بە واسطە لەنێوان خۆیان و خوادا ئەلێ (أرادوا تقليدهم في ذلك) ویستیان لاسای ئەمان بکەنەوە (وطلبوا من موسى) تەلەبیان لەموسا کرد کەچی بێ کەچیان بۆ بکا ؟ تەلەبیان لەموسا کرد (فقالوا : ٱجْعَل لَّنَآ إِلَٰهًا كَمَا لَهُمْ ءَالِهَةٌ)[1] سەیرکە کەلیمەی (الاله)ئەو الاله ئەبێ وریابین یانی (الاله معبود)یانی پەرستراو یانی ئەوەی تۆ عیبادەتی بۆ ئەکەی خوای تعالی کە ئەوەی ناوناوە بە (الاله) لەوێی ئەوان داوای ئەو (الاله)یان کردوە بلفعل تۆ هەرشتێك بکەی بە واسطە لەنێوان خۆت و خوا ناوی (الاله)بەسەردا جێ بەجێ ئەبێ ئینجا تۆ مەبەستت بێ یان مەبەستت نەبێ (فأنكر عليهم موسى هذه المقالة ، وأخبرهم أن عمل هؤلاء القوم شرك عز وجل) پێغەمبەر موسا ئینکاری لێ کردن وتی ئەمە شیرکە ئەمە نابێ (فانظر كيف خفي عليهم هذا الأمر مما يدل على خطورة الجهل بالتوحيد) ئائەمە لەگەل موسادا بوون لەگەل پێغەمبەرەکەیدا بوون ئەوشتەیان لێ شارایەوە بێ ئاگابوون لێ ئەمە دەلالەت ئەکا لەسەر ئەوەی ئینسان کە جاهیل بێ بەحەقیقەتی تەوحید زۆر خەتەرە بەراستی ! (وعدم معرفة حقيقة الشرك مما يسبب أن الإنسان قد يقول الكلمة التي تقتضي الكفر والخروج من الدين وهو لا يدري. )کەواتە ئەوە ئەگەیەنێت تۆ شتێك ئەلێت کەشیرکە بەخۆشت نازانی کەوتیتە ناوشیرکەکەوە !.

(ولا يخلصك من هذا وأمثاله إلا العلم النافع)ئا ئەم شتە تۆ رزگار ناکا إلا ئەبێ عیلمی نافعبێ[2] (الذي به تعرف التوحيد من الشرك ، وتحذر به من القول أو الفعل اللذين يوقعانك في الشرك من

[1] : سورة الأعراف اية : ١٣٨

[2] :بریتیە لە کیتاب و سوننە

حيث لا تدري) تەوحيد لەشيرك بەهۆی عيلمەوە جيا ئبێتەوە وە خۆت بپارێزی لەو قەول و فعلەی كە ئەبێتە هۆی تۆ بخەنە ناوشيرك بەبێ ئەوەی بەخۆت بزانێ ! هەر قەول و فعلێك :

قەول : وەكو (يارسول الله ، ياعبدالقادر ،،،،،)

فعليش : وەكو (نزركردن و سەبرين بۆ غەيری خوای تباك وتعالی )

(وهذا يدل على بطلان قول من يقول)ئەمە دەلالەت لەسەر ئەوە ئەكا ئەو قسەيە بەتاڵە ئەوەی كە ئەلێت ئەم قسەيە زۆر ئەكرێتەوە ئاگاداربن هەتا موحيدەكان و بەناو سەلەفيەكانيش ئەم قسەيە ئەكەن ئاگاداربە (إن من قال كلمة الكفر أو عمل الكفر لا يكفر حتى يعتقد بقلبه ما يقول ويفعل)ئەوەی كوفرێك بلێ يا كوفرێك بكا كافر نابێ هەتا بەدڵ ئيعتقادی ئەو كوفرەی نەبێ ئەبێ ئعتقادی ئەو قەولەی هەبێ ئينجا كافر ئەبێ !! واتا قەزيەكە گەڕايەوە بۆ دل ! ئەمە وانيە چونكە كوفر چۆن ئيمان بريتيە لە ئيعتقادی قەول وعەمەل كوفريش بريتيە لە ئعتقادی قەول و عەمەل يانی بە ئيعتقاد كافر ئەبی ئەگەر موخالف بێ بۆ ئيعتقادی صەحيح هەروەها بەقول هەروەها بە فعليش ! هەريەك لەمانە كوفری سەربەخۆن جا شێخ ئيشرات بۆ ئەم خاڵە ئەدا ئەلێ ئەو قسەيە بەتاڵە ئەوانەی ئەم قسەيە ئەكەن ! جا زۆر وريابن زۆر بەناوی دين صەحيحەوە بەناوی سەلەفيەتەوە بەناوی موحيدينەوە بەناوی تەوحيدەوە ئەم قسانەمان بۆ ئەكەن ! بەحسابی خۆيان رائەكەن لەوەی كەوا والله ئێمە ئەترسين خەڵك كافر كەين خۆ ئەم كافركردنە تۆ نەت كردوە ئەوە خوا كردويەتی بە قەولێك كە ئەو كۆمەلەی كە لەگەل پێغەمبەربوون كافری كردن ﷺ لەكاتيكدا ئەيان وت والله لەدلماندا نەهاتۆتە دەرەوە ! عوزرەكەيان قبول نەكرا هەتا ئايەتەكە روونە زۆر ئەلێ (لَا تَعۡتَذِرُواْ)[1] بۆچی (لَا تَعۡتَذِرُواْ) چونكە ئيعتزاريان ئەكرد ئەيان وت بەدڵ نەمان وتوە ! كەواتە بەموجەرەدی وتنەكە تۆ كەوتيتە ناو كوفرەكە بەموجەرەدی وتنەكە ! ئەبێ وريا بی ،ياخود شتێكی ترمان بۆ باس ئەكا كە ئەمە خالێكی زۆر گرينگە كە شێخ بۆمان باس ئەكا كە بريتيە لەوەی كە ئێمە تقديسی شيوخ نەكەين عولەمايانمان رێز لێ ئەگرين بەلأم خوا نين بيان پەرستين بلێن قەولەكەيان هەمووی صوابە معصوم لەهەلە ئەمرۆ زۆر لەخەلكەكان كەونە ئەو شتەوە لەگەل ئەلێ فلان عالم بۆ نمونە لەگەل رێز و حورمەتم بۆيی

[1] :سورة التوبة اية :٦٦

ئەو هەلەی كردوە قولەكەی راست نیە ! قەولەكەی موخالیفی صەوابە رأسەن هێرش ئەكاتە سەرت تۆ تكفیریت تۆ فلان نیت ،، بزانین شێخ ئەلێ چی (ومن يقول)ئەوەی خوێندمان باتل بوونی قسەكانی ئەوانمان بۆ دەرئەخات (إن الجاهل يعذر مطلقا) جاهیل بە مطلەقی عوزری ئەدرێتێ ئەمە كافر ناكرێی بە مطلەقی (ولو كان بإمكانه أن يسأل ويتعلم) ئەگەر چی بشتوانی پرسیار بكا و خۆیی فێربكا ئەلێن نا ! هەربتوانی و پرسیاریش بكا مادەم جاهیل بوو عوزری هەیە ، نەخێر ئەمە لای عولەمای ئەهلی سوننە مادەم نەزانی معوزر نیە مادەم پرسیار نەكا و إعراض دەكا لەعیلم ئەوە مەعزور نیە لەلای خوای تعالی كەسێك مەعزورە كە هیچی نەبیستبێ هەولی داوە گەراوە بەلآم شتی دەست نەكەوتوە بەس كابرا لەبەر دەمیدا بێت و هەولی بۆ نەداوە بۆ دینار و مادەكەی ئەچێ هەموو شتێك ئەگەرێت بەلام بۆ دینەكەی هەر گوێی پێی نادا لەكاتێكدا عیلم لەبەر دەمیدایە ئەم كەسە مەعزور نیە ! ئەبێ ئاگادار بین جا ئەلێ (وهي مقالة ظهرت ممن ينتسبون إلى العلم والحديث في هذا الزمان. )ئەوە مەقالەی ئەو كەسانەیە قەولی ئەو كەسانەیە كەوا دراونەتە پاڵ عیلم و خۆیان ئەدەنە پاڵ عیلم و حەدیس یانی عولەمای عیلم و عولەمای حەدیس و ئەوانەن لەم زەمانەدا هەیە لەو جۆرە كەسانە شارەزایە بەعیلمی حەدیس شارەزاییە بەعیلم كەچی لەهەمان كاتدا لەمەسەلە ئعتقادییەكاندا بە عەوزر لەجهلدا لەكوفر و لەئیمان لەمەسەلەی تاریك صلاتدا لەمەسەلەی حوكم بەغەیری خوا كەوتۆتە هەلەوە ئەم هەلانە نابێ ئینسانی موسلمان لەسەریاندا بڕوات و تقلیدیان بكاتەوە ئەگەرچی عالمێكیش لەو عولەمایانە وتبێتێ ، ئێمە لێرەدا با سەیری هەزار و سێ سەت ساڵ پێش ئێستا بكەین لەوكاتەوە تائێستا(١٣٠٠) یانی لەدروست بوونی ئەشعەریەتەوە هەتاوەكو ئێستا ! چەند لە عولەمای فقە وحەدیس وەكو علما ئەلێن (إن خدع بهم) كەوتونەتە ژێر ركێفی ئەشعەریەت و ماتروودیەتەوە ! عولەمای گەورە گەورە بە عولەمای فقە وحەدیس كەتونەتە ناو ئەشعەریەت و ماتروودیەتەوە ! ئەبێ ئێمە لەسەر رێچكە و رێبازیان بڕۆین لەبەر ئەوەی وەالله ئەوە عالمی فقە و ئەوە عالمی حەدیسە ! نەخێر ، جا لێرەدا ئەبێ تۆ صەواب و هەلە لێك جیابكەیتەوە ! نەك لەبەر ئەوەی فلان كەس وەالله عالمێكی حەدیسی گەورەیە ، عالمێكی حەدیسی گەورەیە خۆ ( شبابەی كوری صواری مەداین ) عالمێكی حەدیسی گەورە بوو شێخی (ئیمام ئەحمەد )بوو كەوتە ناویەوە

جا (ئیمامی ئەحمەد) تەرکی کرد هەر ریوایەتیشی لیّ وەرنەگرت ! ئەوە ئەبو حەنیفە سەیری بکەن ئەوە بوخارییە پێی ئەلیّ (مرجيئه سكت عنه) ئەوە ئیمامی مالکە پیّ ئەلیّ (الادال عوضال) ئەوە ئیمامی ئەحمەدە پێی ئەلیّ (رأى ضعيف وحديث ضعيف) سەیرکە ئەهلی عیلم ئەوها ئەلێن بەرامبەر بە کەسێك کە ڕێگەکەی خوار کردبێتەوە ! باناوەکەشی چەندێك گەورە بیّ با ناوەکەشی لەناو خەلیکدا چەندێك گەورە بیّ مادەم هەلەی کرد هەلەی کرد شوێنی هەلەی هیچ کەسێك ناکەوین ئیمامی مالك قاعیدەیەکی جوانی بۆ موسلمانان دارشتوە ئەفەرمووێی : هەموو کەسێك لەقسەی وەرئەگیری و رەد ئەکرێتەوە إلا خاوەنی ئەو قەبرە نەبیّ ﷺ بەس ئایا ئەمانە جیّ بەجیّ ئەکەن بەسەر خەڵکەکاندا ! نەء بەداخەوە قەولەکە وەرئەگرین بەس لەهەمانکاتدا کە وتمان فلان کەس هەلەی کرد ئەوە پێچەوانەی ئەو ئایەتەیە ئەوە پێچەوانەی ئەو حەدیسەیە پێچەوانەی إجماعی ئەهلی عیلم ئەلێن بابە تۆ چۆن قسە بەو عالمە ئەلیّ ! ئایا دەست نیشان کردنی هەلەی عالم و بلێن ئەوە هەلەکەیەتی ئەمە قسە پیّ وتنیەتی ؟ نەخێر قسە پێی وتن نیە ، بەڵکو لەشوێنی خۆ سەیرکردنیەتی کە تۆ غلوت تیا نەکردوە والله هەرچیەکی وت ئەوە صەوابە هەرچیەکی وت ئەوە تەواوە جا شێخ بزانە چۆن ئیشارەت ئەدا ئەلیّ (ومن يقول : إن الجاهل يعذر مطلقا ولو كان بإمكانه أن يسأل ويتعلم ، وهي مقالة ظهرت ممن ينتسبون إلى العلم والحديث في هذا الزمان. ) ئەزانن مەبەستەکە کیّ یە مەبەستەکە روونە و ئاشکرایە ئەوەی کەوا قوتابی عیلم بیّ ئەزانی مەبەستەکە کیّ یە ! جالەبەر ئەوە ئەبێت وریا بین مەسئەلەی عوذربالجهل ئایا کابرا لە قەزایە ظاهیرەکاندا لەمەسەلە دیاردەکاندا وەکو ئیمان و کوفر ئایا موعزورە !؟ ئایا لەهەندێك مەسائیلدا هەتا قەزایەیی ئیعتقادیش نەبیّ قەزایەی فەرعی بیّ وەکو قتل بۆ نمونە ئایا قتل شتێکە تۆ بلیّ کابرا مەعزورە !؟کە قتل بکا بلیّ هیشتان إقامە حوجەی لەسەر نەکراوە ئەها زینا لیواط ها إقامە حوجەی دەوێی بەخەلك بلیّ زینا و قتل و لیواط مەکەن چۆن گوناهبار ئەبن ئەگەر ئەوە بکەن فتر ئەزانیّ ئەوە گوناهە فیترە هەموو فیترەیەك ئەزانی ئەوە گوناهە لەبەر ئەوەی ئەو مەسائیلانە ئەوەی دەلیلی شەرع و فیترە لەسەری هاتبێی کە جەهل تێدا قبول نیە عوزربالجهل تیدا قبول نیە نابیّ قبول بکرێی بەلأم شت هەیە بە پێچەوانەوە تێدا قبول ئەکرێی تفاصیلی شەریعە نازانی چۆن تەیەمووم بکا نازانی دەست

نوێژ بگرێی نازانی ئەدای نوێژەکەی چۆن بکا هەتا کۆتایی ...ئەم بابەتانە فێر ئەکرێی دوای فێرکردن ئەو کاتە مەسئول ئەبێ بەس پێش فێرکردن ئەو جاهیلیەتیە ئەبێ بە عوزر بۆیی مادەم کابرایەك نەبێ موقصیربێ لەحەقی خوادا ! دائیمەن ئینسانی موقصیر معزور نیە کابرایەك بەهیچ شێوەیەك نەگەرێی بەدوای عیلمدا نەگەرێی بەدوایی زانستدا !ئاخر ئەمە کەی معزورە ئەمە إعراضی کردوە کابرایەك ئەگەرێی و لەوەزیاتر نازانێ ئەویش لەمەسائیلەکاندا کە عوزر تێدا مقبولە نەك بە مطلەقی ئەما (یارسول الله ﷺ)نەزرکردن بۆ غەیری خوا و تحکیم کردنی شەریعەتی غەیری خوا و پشتکردنە دینی خوا وەکو ئەوانەی ئەم زەمانە والله ئەوانەی خوا و پێغەمبەر وتویتانە بۆ رۆژگارێك بوە بۆ ئەم زەمانە نیە ! ئەوە قەت قبول نیە لەهیچ کەسێك کەی ئەوە قبولە ﴿وَلَا يُشْرِكُ فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا﴾[1]

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) وتی (فإنك إذا عرفت أن الإنسان يكفر بكلمة يخرجها من لسانه وقد يقولها وهو جاهل فلا يعذر بالجهل. ) باسمان کرد وتمان ئەیّ کە ئینسان کەلیمەیەك لەدەمی دێتە دەرەوە بەنەزانین وە پێ ئەبێ بە موشریك وە کافر ئەبێ پێی ئەو شەخصە ئەو جهلەی ئەو نەزانینەی نابێ بەعوزر بۆی وتمان لێرەدا کەسانێك کە هاتون شەرحی ئەم کەلیمەی شێخیان کردوە بەداخەوە زۆر بەیان لێیان تێك چووە ئایا شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب ) مەسئەلەی عوزر بلجهل چۆن سەیر ئەکا ئاوەهایان بردوە کە گوایە بەلێ ئەگەر جاهیل بێت و نەزان بێ ئەم کەسە موشریك نابێ کەلامی شێخیش بەتەئکید وانیە بەڵکو لە کتبوب و رسائیلەکانی کەشتدا وانیە هەندێ شت هەیە ئەوان کە ئەمانەیان پێ شەرح کردوە کە بەئاقارێکی غەلەتیان دا بردوە لێیان تێك چوە توشی شوبهە بوون بۆیە ئەم مەوزوعە روون دەکەینەوە (جهل بلعذر)لەمەسئەلەی توحید و لەومەسئەلانەی کە پێیان دەوترێی (السائل ضاهرة ياما علمه بدين بضرورة)ئەوەی کەوا پێویشتە هەموو کەسێك بیزانێت وە عامی و عالم نابێ فەرقی بکەین لە بەینیاندا لە نەزانینیاندا وەك ئوموری توحید وەك ئوموری شیرك ئەوشتانەی کەوا لەناو خەڵکی زانراوە لە واجبێتی نوێژو رۆژو و زەکات و حەج و حەرامیەتی زینا و قتل و الواطە و ئەو بابەتانە چونکە ئەم بابەتانە خوای تعالی ئەگەر شەریعەتیشی پێ نەناردبێت شەریعەیش نەنێردرێت پێی ئەمانە لەناو فیترەتی

[1] : سورة الكهف اية :٢٦

ئینساندا شتێکی مذمن شتێکی ممدوح نین یانی هیچ کەسێك نیە ئەگەر شەریعەتیشی پێی نەگا نەزانی کە زینا شتێکی خراپە نەزانی کەوا الواط یاخود قتل یاخود هەریەکی لەو زولم و زۆلەی کە لەعالەم ئەکرێی ئەمانە شتێکی خراپن و شتێکی ناجائیزن بۆیە لە فیترەدا خوای تعالی هەر إقامە جوجە لەسەر ئینان ئەکا و داناوە لەسەرەوی هەموویانەوە مەسئەلەی توحید یەکخوا پەرستی جا ئەو مەوزوعە لێرەدا ئێستا دێن لە پێشدا بە موقەدیمەیەك باسی ئەکەین ئەلێن ئەو کەسانەی کەوا پێیان ئەوترێی ئەهلی فیترە کێن وە علماء چیان وتوە دەر حەقیاندا ؟

ئەهلی فیترە : ئەوکەسانەن کەوا علماء ئەیان کا بەدوو بەشەوە ئەوانەی کەوا دەعوەی پێغەمبەریان پیێ نەگەیشتوە (علیهم الصلاة والسلام)با لەدوای هاتنی پێغەمبەریش بن (علیهم الصلاة والسلام)بۆ نمونە بلێن بەپێغەمبەری محمدﷺ لەپێش پێغەمبەر محمد دا ﷺ ئەو کەسانەی کەوا مردوون ئەو کەسانەی کەوا پێش هاتنی پێغەمبەر(علیهم الصلاة والسلام) نەماون حالیان چۆن بووە ئەوانەیان موحیدبوون حنفاء بوون لەسەردینی باوکە (إبراهیم) رۆیشتوون شیرکیان قەرار نەداوە بە موسلمانیەتی رۆیشتوون ئەوانە موسلمان بوون ئەوانەشی کەوا کەوتونەتە ناو شیرکەوە ئەو جۆرە کەسانەیان پێیان وتراوە ئەوە شیرکە و کردویانە یان ئاگایان لیێ نەبوە بەجاهیلی تیێ کەوتوون هەردووکیان موشریکن هەردوو ئەم گۆریە موشریکن ئەم دووانە بەلام ئەوەی پێی وترابیێ بەلام پاشان گوێی پیێ نەدا بیێ ئەوە موعەزەبیش ئەبیێ واتا خوای تبارك وتعالی تعزیبی ئەدات لەرۆژی قیامەتدا وە ئیمتحان و إختباری ناکا ، لەدونیاش ناوی کافر و موشریکی موعەزەب ئەبیێ ئەوەشی کەوا پێی نەگەیشتوە دەعوەی پێی نەگەیشتوە پێش پێغەمبەرەکە (علیهم الصلاة والسلام)ئەویش هەر موشریکە و کافرە بەس ئەو پێی ئەوترێی موشریکێك و کافرێکی غیر موعەزب واتا تەعزیب نادرێی هەتاکو إقامە حوجەی لەسەر نەکرێی کەلەسەریشی نەکراوە خوای تعالی جیێ ئەهێلی بۆ رۆژی قیامەت ئەم خاڵە زۆر گرینگە ئێمە لیێ تیێ بگەین واتا فەرق لەنێوان دوو جۆرە کافر دوو جۆرە موشریکدا کافرێك کە موعەزەبە لەسەر کوفرەکەی وە کافرێك کە موعەزەب نییە لەسەر کوفرەکەی ئەوەی کە موعەزەبە ئەوەیە کە حەقیقەتەکەی پێی گەیشتوە پاشان لەسەری نەرۆیشتوە ئەوەی کەوا موعەزەب نیە ئەوەیە کەپێی نەگەیشتوە

ئەمە لەپێش ئیسلامدا ، لەدوای ئیسلامیش بەهەمان شێوە هەرکەسێك بکەوێتە ئوموری شیرکیەوە خەلکەکان عەینن ئەبن بە چەن بەشەوە ؟ ئەبن بەسێ بەشەوە :

یەکەمیان : ئەوانەن کەوا إستجابەیان بۆ پێغەمبەرکرد ﷺ وەتعریفی ئیسلامیان لەخۆیان تطبیق کرد کە بریتیە لە (هو الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة والبرأة من الشرك وأهله)[١] دێنە ناو دائیرەی ئیسلام بەبێ ئەمە نائێنە ناو دائیرەی ئیسلام واتا ئەو کەسانەی کەوا إستجابە ئەکەن بۆ پێغەمبەری خوا (عليهم الصلاة والسلام) وەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان فەرمووی ﷺ ( أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إله إلا الله ، وأن محمدا رسول الله ، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة ، فإذا فعلوا ذلك ، عصموا مني دماءهم وأموالهم ، إلا بحق الإسلام ، وحسابهم على الله تعالى)[٢] . کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ کەهاتوە بەرە و رووی هەموو خەلك ئەبێتەوە بەقیتال بەوەی کەوا ئەوانە هەمووی کافر و موشریکن ئەم کافر و موشریکانە إلا ئەوانە رزگاریان ئەبێ لەدەستی پێغەمبەر ﷺ کە إستجابە ئەکا بەو شێوەیەی کە باسمان کرد (لا اله الا الله محمد رسول الله ،ﷺ ) نوێژ ئەکەن زەکات ئەدەن ئەمانە نەکەن رزگاریان نابێ کەواتە ئەمە إستجابەیان کرد ئەوەی بەمەوە وەسف نەکرابێ موسلیم و موحید نیە ئەما ئەوەی کەوا نەبێ ئەوە ئەبێ بەدوو بەشەوە:

یەکەم :ئەوەی کەوا دەعوەکەی پێ گەیشتوە .

دووەم : ئەو بەشەی کەوا دەعوەکەی پێ نەگەیشتوە .

یەکەم : ئەوەی کە دەعوکەی پێ گەیشتبێت ئەوە چیە : کافرێك و موشریکێکی موعەزەبە پێغەمبەرﷺ قیتالی کردوە لەدونیادا ئەگەر بەر پێغەمبەری خواش نەگەیشتبێت ﷺ بەدەستی ئەوەیش نەکەوی قیتالی بکا بمری لەسەر ئەوشیرکە لە رۆژی قیامەتدا رأسەن بۆ جهەنەم خوای تعالی ئەیخاتە ناو عەزابەوە چونکە ئەفەرموویێ(وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[٣] ئەوە رسولە کەی ناردوە پێی راگەیاندی ﷺ تۆإستجابەت بۆی نەکرد جا ئایە بەدەستی روسلەکە یان شوێن کەوتوانی رسولەکە قیتال ئەکرێی و ئەکوژرێی (إلى جهنم وبئس المصير) یان ئەوەتا بەر دەست ئەو ناکەوی بتکوژێ بەڵکو ئەمری لەسەر کوفر و

---

[١] : ئەمە ئەوتعریف و پێناسەی ئیسلامەکە ئیجماعی ئەهلی عیلم و ئەهلی سوننە وجماعەی لەسەرە .

[٢] :رواه البخاري و المسلم

[٣] :سورة الإسراء اية :١٥

شيرك كەواتە تۆ إقامە حوجەشت لەسەر كراوە لەرۆژی قيامەت رأسەن بۆ جەهەنم بەبیٚ ئيختبار و ئيمتحانات رأسەن بۆ جەهەنم.

دووەم : ئەوانەی كەوا پیٚيان نەگەيشتيبیٚ دەعوەيان پیٚ نەگەيشتوە ئەم نوقتەيە زۆر موهيمە ئەبیٚ زۆر ئاگاداری بين ئەوەی كە دەعوايان پیٚی نەگەيشتوە پیٚ نالیٚن موسلمان پیٚی ئەلیٚن موشرك وكافر بەس (غير معذب عليه)لەسەر ئەو كوفر وشيركە تەعزيب مادریٚن چونكە پیٚی نەگەيشتوە ئەمە وەكو هەر يەوديەك هەر نەصرانيەك هەر بوذييەك هەر ئەفريقيەك هەر ئوستراليەك هەر كەسیٚك كە لەملای دونيا بیٚت دينی ئيسلامی پیٚ نەگەيشتوە هيچ لەدينەكە نازانیٚ ئەمە پیٚناوتریٚی موسلمان ئەمە كافرە بەس تەعزيب نادریٚی لەسەری هەتا إقامە حوجە نەكریٚی ، لەسەر مەوزوعی إقامە حوجە بۆ ئەوە نيە پیٚ بوتریٚ كافر بۆ ئەوەيە تعزيب بدریٚی لەسەری ئاگاداربە جا ئەوە لە مەسائيلە ظاهيريەكانە بۆ ئەوە نيە كە پیٚ بوتریٚی ولا إقامە حوجەم لەسەر كرد ئينجا موشريكە بۆ نمونە ئیٚستا يەهودييەك حوكمی چيە ؟ موشريكە . نەصرانيەك حوكمی چييە ؟ كافرە با ئەم شەخصە هيچ دينی ئيسلامی پیٚ نەگەيشتبیٚ پیٚنالیٚن موحيدە پیٚ نالیٚن موسليم ئەمە موشريكە ئەمە كافرە بەس مادەم دينی پیٚی نەگەيشتوە ئەم كەسە حوكمەكەی چيە ؟ حوكمەكەی ئەوەيە معذورە لە عەزاب نەك معذورە لەوەی پیٚ بوتریٚ چی ؟ موشريك يا كافر ئەمە زۆر موهيمە تیٚ بگەين ئەگەر هات هەركەسیٚك لەوان دينی ئيسلامی بەر گویٚی كەوت پیٚغەمبەر ئەفەرمووی ﷺ ( هەر يەهودی و نەصرانيەك منی بەر گویٚی بكەویٚی ئيمانم پیٚ نەهیٚنی بۆ ئاگر . يانی ئەو كاتە هيچ عوزری لەسەر تەعزيب نامیٚنيتەوە نەك هەر يەهوديەك و نەصرانيەك منی پیٚ نەگا من نەبيستی و دەعوەی منی پیٚ نەگا پیٚ ناوتریٚ موشريك و كافر ! موشريك و كافرە چۆن موشريك و كافر نييە هەر كەسیٚك ئينقياد نەكا بەدينی خوا هەركەسیٚك تسليم نەبیٚ بە توحيد هەر كەسیٚك براءة لە كوفر و شيرك نەكا كافرە موشريكە ئينجا ئەمەمەش جۆری دووەم كەواتە لەپیٚش ئيسلام و دوای ئيسلام خەلك بوون بەچەند بەشەوە خەلك بوون بەدوو بەشەوە:

يەكەم :يان موسلمانن و تەسليم بوون بە توحيد .

دووەم : يان كافرن و موشريكن ئەم كافر و موشريكەيش دوو جۆرەن :

جۆری یەكەم : ئان ئەوەتا عوزری هەیە بەوەی كەوا دەعوەی حەقی پیٚ نەگەیشتوە بەلام عەزر نەك لەبەر ئەوەی موشریك و كافر نیە تەعزیب نادریٚی.

جۆری دووەم : ئەوەیە كەوا ئەو عوزرەشی نیە واتا موشریكە كافرە وە (معذب علیە)ئەوە شێخ الأسلام لە مجموع الفتاوی دا ئەم بابەتانەی زۆر بەجوانی روون كردۆتەوە وەداوا دەكەم لەهەمو كەسێك لەم بوارەدا شت باس ئەكا بگەرێتەوە بۆ ئەو كەلامەی شێخ الأسلام (إبن تیمیە و إبن القیم) هەروەها كەلامی شێخ(محمدی كوری عبدالوهاب)ئەولاد و ئەحافادەكانی هەتا ئەگاتە شێخ (بن باز)[1] رەحمەتی خوایان لیٚ بیٚ سەبارەت بەم مەوزوعە زۆر بەتفسیلی و جوانی باس كراوە چونكە ئەم مەوزوعە شێوێنراوە لەلای خەلك ئەم مەوزوعە بەمجرد بەوەی كە ئەلیٚ وەلا كاكە إقامە حوجەی لەسەر نەكراوە نابیٚ پێبوترێی موشریك و كافر یاكافر نیە موشریك نیە ! ئەمە غەلەتە ئەم قسەیە جت ئەم جۆرە كەسانە لەهەردوو حالتەكەدا لەپێش ئیسلام و لەدوای ئیسلام ئەبن بە سیٚ بەشەوە !

جا ئەوە سەبارەت بەوە موشریكانەش كەباسمان كرد دێن ئێستا تفسیلێك ئەدەین بەو كەسانەی كەوا لەزەماندا ئەژین چونكە مەسئەلەی زەمان كەئەلێن فەرقی هەیە لەزەمانێك بۆ زەمانێكی تر بزانین لەچ لایەنێكەوە فەرقی هەیە :

لەولایەنەوە فەرقی هەیە زەمانێك عیلم تێدا بێت و زەمانێك عیلمی تێدا نەبێت ئەو زەمانەی كە عیلمی تێدا بێت ئایا ئەو كەسەی كە ئەلێن معذور ئایا لەوزەمانەی كە عیلمی تێدایە معذور؟ ئەمە خالێكی زۆر گرینگە ئاگاداری ئەم خالە بن یانی جاری واهەیە زەمەنێك پرە لەعیلم و زانیاری بلاوكردنەوەو عیلم و توحید ئالیات پەیوەندی ئالەم بیئەیەدا خەلك معذور نیە هەتا بەجهلەكەی بلێم وەلا دەعوەی پیٚ نەگەیشتوە چونكە دەعوە منتشیرە ئەو بۆخۆی إعراضی لەدەعوە كردوە ئاگاداری ئەو نوقتەیەش بن یانی بۆ نمونە : ئێستا موشریك كاتێك كە موشریكە وتمان ئەوەی كەوا یادەعوەی پیٚ نەگەیشتوە یان ئەوەی دەعوەی پیٚ گەیشتوە ئەوەی دەعوەی پیٚ نەگەیشتبیٚ ئەوە ئەبیٚ چۆن باسبكریٚ ئەوە ئەوە بۆ نمونە ئەلێن ئەوكەسانەی كەوا دوور لەموسلمانان ئەژین بۆ نمونە دوور لەموسلمانان ئەژین یاخود لەناو ولاتی كوفرا ئەژین إقامە حوجەیان لەسەر نەكراوە ئائەم جۆرە كەسانە لەمەسەلەی

[1] :تێتبینی زۆرمان لەسەر هەیە بەلام قسەكانی ماموٚستاوەك خی نقل ئەكەین !.

تەعزیبەکەدا معذور نەك مەسئەلەی چیدا ؟ مەسئەلەی کافربوونەکەدا خۆ ئەگەر لەوە بیئەیەکدا بێ کە تێدابێ نەء نەلەوێش و نەلەناولێنانەکەش لەهیچیان معذورنابێ یانی موعەزەبیشن و کافریشن بۆ ؟ چونکە خۆیان هەلنەساون بەدوای قەزیەکەدا معریزن لەوە وە جگەلەوە بەموشریکی بمرێ متمکن لەعیلم یان متمکن نییە لەعیلم یانی توانیویەتی عیلم بەدەست بهێنی یان نەیتوانیوە عیلم بەدەست بهێنی ئەوەی توانیویەتی عیلم بەدەست بهێنی إعراضی کردوە تەقصیری هەیە و إفراطی هەیە ئەم جۆرەکەسانە موعەزەبن و معذوریش نین ئەمەانە بشمرن لەسەر ئەم حالەتە ئەوە نییە بلێن وەلا کاکە مردون دەعوەیان پێ نەگەیشتوە دەعوە بەرگوێیان کەوتوە بۆ خۆیان نەهاتون گوێی لێ بگرن بەلاّم هەیە متمکن نییە لەعیلم ئەمەش ئەبێتە بەدوو بەشەوە :

إبن القیم :ئەلێ کەسانێك هەن لەوانەی کە علمیان چەنگ نەکەوتوە ئەوانیش ئەبن بەدوو بەشەوە ئەلێ هەتا ئەمانیش بەدووشەوە بەشێکیان هەر بۆخۆی عادەتی وایە إعراضی تیایە یانی ئەگەر علمیشی دەست کەوتابایە وەری نەدەگرت ئەم جۆرەکەسە ئەلێ ئەمانەش هەر موعەزەبن ئەوانەی کەوا مقبیلن لەسەر عیلم بەلاّم دەستیان نەکەوتوە ئەوانەن کە ڕۆژی قیامەت چی ئەکرێ ئیختبار ئەکرێن لەڕۆژی قیامەت [1] ئەمە کورتەی باسەکە بوو ئەم باسە ئەم کورتەیە زۆر زۆر گرینگە بۆئەوەی لێ تێ بگەین جا لەسەر ڕۆشنایی ئەم باسە ئێستا دێنە سەر کەلامی شێخ الآسلام(ابن القیم و محمدی کوری عبدالوهاب )و هەریەك لەو عولەمایانەی کەوا باسی (عذر بلجهل)یان کردوە مەسەلەن ئەلێ چی : کاتێك ئەلێ من بەعموم خەلك کافر ناکەم ئەمە لەکەلامی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەبینرێی لەکتێبەکانیدا و لەرسائیلەکیدا وە خەلکانێکیش ئەمە ئەکەن بەدەلیل لەسەر ئەوەی کاکە مەوزوعی بەکافرکردن خۆ هەروا ئاسان نیە خەلك کەوتە شیرکەوە تۆ کافری بکەی ئەوەتا شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ من بەعموم خەلك کافر ناکەم مانای وایە لەتعین کردنی خەلك ئەبێ إقامە حوجە هەبێ ئەبێ ئەوەبێ ئەوە بێ! !

ئەوەی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەبێ بەم شێوە بێ لێ تێ بگەین لە کتێبەکانیدا تەماشاکەین کاتێك دەعوەی کرد لەناو نجد پاشان بلاوی کردەوە لەحیجاز و لەئەرضی

[1] :لە کیتابی طریق الهجرتین طبقی ١٧

جزیره و هەموو ئەرضی جزیرەی فەتح کرد و هەموو موشریکینی لەناو برد و داویی إقامه حوجەی دولەتی ئیسلامی کرد فەرمووی ئەوەی کە ئێوە بانگی ئەکەن لەغەیری خوا شیرکە بزانیٚ یان نەزانی ئەمە شیرکە ئەمە کوفرە بەلام نایەم قیتالت لەگەل بکەم ئەگەر نەتبیستبیٚ نایەم من حوکمی کافرینی کەوا (معذب علی هذا الکفر)ئەوەت لەگەلدا بکەم نا هەتا پێت نەکا من ئەو مامەلەت لەگەل ناکەم جا ئەم کەلامەی شێخ لەخەلك تێکچوە ئەیلێنەوە شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) رەحمەتی خوای لیٚ بیٚ لەکاتی دەعوەی خۆیا کە کردوویەتی بەخەلی بلاوی کردۆتەوە دەعوەکەی ئەو کەسانەی کە کتوب ورسائیلی بۆ ناردوون و تویەتی بێنە سەر ئەم دەعوە موبارەکە دەعوی توحید (لا الله الا الله) دوورکەونەوە لەشیرك و لەهاوار کردنی غەیری خوا و ئەوبابەتانەی نەزرکردن بۆ غەیری خوا یلن توکل بەستن لەسەر غەیری خوا فەروویەتی ئەمانە هەمووی کوفرە وشیرکە بەس من کەسێك کافر ناکەم مەبەستی ئەوەیە ئەو کافرەی کە تەعزیب ئەدرێی نەك کافر ناکەم کە موشریك نیە ئاگادار بن جا هەندێك هەن لە علماء فەرق ئەکەن لەنێوان کوفر و شیرکدا ئەلێن کوفر و شیرك دووشتی جیاوازە هەندێکیش ئەلێن نەخێر هیچ جیاواز نیە بلفعل بۆخۆی ئەگەر ئینسان واقیعە تەماشای بکا کوفر وشیرکە وشیرك کوفرە هەردووکی چیە ؟ هەردووکی هەر خروجە لە میلەتی ئیسلام بەلام هەندێك ئاوای لیٌ بەکارهێناوە یانی ئەو کەلیماتانەی وا بەکار هێناوە کەسەکە موشریکە بەس کافر نیە بەچی ئیعبارێك بەو ئیعتبارەی کە قیتالی ناکەین جا ئێمە بەشێوەی کەبلێن باشترە ئەلێن ئەو کەسەی کەوا غەیری خوای گەورە بپەرسای موشریکەیشە وکافریشە بەس تەعزیبی لەسەر نادری هەتا إقامە حوجەی لەسەر نەکرێی واضحە !! یانی هەتا إقامە حوجەی پیٚ نەوتریٚ کیتاب و رسائیلی بۆ ئەنێردرێی ئاگاداری ئەکرێتەوە و پیٚ رائەگەێنریٚ ئەگەر لەسەر ئەوە هەر موسیر بوو ئەوکاتەی دوای زانین حوکم بەچیش ئەدرێی ؟ حوکم بە کوشتنیشی ئەدرێی بەقیتالیشی ئەدرێی کەواتە لەپێشدا موشریکە کافرە لەدوایشدا قیتالی لەگەل ئەکرێی ئەگەر موسیربوو لەسەر ئەوە کەواتە جهلی شەخصەکە بەشیرك و بەکوفرەکە نەبوو بەعوزرێك پیٚ بلێن جاهیل پیٚ بلێن موشریك و کافر موشریکیشە و کافریشە بەلام قیتالی لەگەل ناکرێی ئەمانەیە کەلامی شێخ (محمدی کوری عبدالوها) ئێستا بۆ نمونە کەلامێکی ئەخوێنینەوە ئەلیٚ (سؤل شیخ محمد بن عبدالوهاب في

من مان قبل هذه دعوة ولم لم يدكه الإسلام؟) ئەلێ پرسیار لە شێخ( محمدی کوری عبدالوهاب) کراوە لە بارەی ئەو کەسانەی کە پێش دەعوەی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) دەعوەی توحید و یەکخوا پەرستی پێش ئەوەی پێی بگا چونکە باسی زەمانی خۆی ئەکا لەزەمانی ئەودا پێش ئەوەی ئەو دەعوە بلاو بێتەوە خەلکی بەزۆربەی لەسەر شیرك و ضلالەت رۆیشاوون ئەلێ ئایا ئەوەی کە لەپێش ئەم دەعوەیە مردوە دەعوەی شێخ حوکمی ئەمانەی ئەپرسێی جوابەکەی ئەداتەوە (محمدی کوری عبدالوهاب) کە توحیدە مردوە باسی ئەکا و ئەلێ (من مات من أهله شركِ)سەیرکە ناوی لێ ئەنێ ئەهلی شیرك ناوەکەی لێ نفی ناکا لەسەر ئەوەی مردوون (قبل بلوغه هذه دعوة فلذی يحكم عليه انه إذا كان معروفه بفعل شركِ)چۆن حوکم ئەدا بەسەریاندا ئەگەر ناسروبێ بەوەی کە هاواری کردۆتەو غەیری خوا نەزری بۆ غەیری خوا کردوە تا کۆتای لەوشتانەی تر کەوا شیرك و ضلالەتە (ويدين به ومات على ذلك)ئەوەی کردوە بەدین و وەلەسەری مردوە (فهذا ظاهرة انه مات على الكفر)ئەوەی لەسەرچی مردووە ؟ لەسەر کوفر مردوە (ولا يدعا له ولايضحا له ولا يتصدقَ له ) نە أضحیەی بۆ ئەکرێی نەصەدەقەی بۆ ئەکرێی نە دوعای بۆ ئەکرێی ئەوە لەسەر شیرك رۆیشتوە )[1]ئەوە ئەو کەسانەی کەوا ناسروان بە فعلی شرك . ئەوانە ناسرون بەفعلی شیرك یەکسەر مطقا چی لێ کردن ؟ هەمووی إالحاء کردن بەناوی موشریکین ئەوەی ناسراوبێ بەوەی هاواری کردۆتە غەیری خوای تبارك وتعالى نەزری بۆ غەیری خوای تعالى کردوە لەپێش ئەوەی دەعوەی (محمدی کوری عبدالوهاب)ی پێ بگا ئەوانە لەناو أصناف موشریکینانە وە ئەمە دوعایان بۆ ناکرێی وەناپارێتەوە لەخوا رەحمەیان پێ بکا ئینجا ئەمجۆرە کەسانە ئەگەر سەرنجی ئەم جوابەی شێخ بدەن بۆیان دەر ئەکەوێی کەشێخ هەموو کەسێك بە موشریك دائەنێ کەوا چی بێ ؟ کەوا داوای غەیری خوای گەورەی کردبێت ئیتر ئەم شەخصە زانیبێتی یان نەیزانیبێ . ئاگاداربن زانیبێتی یان نەیزانی بێ ! چونکە دووحالەتە یان ئەوەتە زانیویەتی یان نەیزانیوە ئەگەر زانیبێتی ئەوە تەواو ئەوە موعەزەبیشە لەقیامەتیشدا خوا ئیختباری ناکا ئەگەر نەیزانیبێ هەر کافرە هەر موشریکە ئێمە ناتوانین دوعای بۆ بکەین رۆژی پیامەت خوا جل وعلاء چی بۆئەکا ئیمتحانی ئەکا

[1] :لە کیتابي :عاۆيض الجهل لاپەرە ٥٩١

كەواتە لەهەردوو حالەتەكە ئێمە دوعایان بۆ ناكەین ئەگەر موعەزب بێ یان موعەزەب نەبێ چونكە لەسەر ئەسلی ئیسلام نەمردوە.

هەروەها فتاوی شێخ(حوسێن وە عبدالله)[1] باس ئەكا ئەلێ (من مات قبل دعوته تقم حوجه) ئەو كەسەی مردبێت پێش ئەم دەعوەیە دەعوەی توحید ویەكخوا پەرستی وەكەسێك نەبووبی كە حەقیقەتی ئەم دەعوەیەی پێ وتبێتو إقامە حوجەی لەسەر كردبێ ئەلێ (فی من مات قبل هذه دعوة ولم یدكه الإسلام وهذه أفعال التي یفعله الناس یوم ولم تقوم علیه حوجة مل حوكم فیه؟ وهل یلعن أویسب أو یكف عنه وهل یجوز الإبنه دعاء له مل فرق بین مالم یدرك هذه دعوة بین من لم أدركها ومات موعدیا لة هذا دینه؟) ئەمە پرسیارەكەیە ئەو كەسەی كەوا پێش ئەم دەعوەیە مردبێت وەئیسلامی راستەقینەی نەبیستبێت وە ئەم أفعالانەی كە ئەمرۆ خەلك ئەیكەن سەیركە ئەلێ كە ئەوەی ئەمرۆ! لەزەمانی شێخ (حوسێن وعبدالله ی كوری محمدی كوری عبدالوهاب) ئەلی وە إقامە حوجەی لەسەر نەكرابێ یانی پێ نەوترابێ ئەمە هەلەیە وەدینی خوای گەورە پێچەوانەی ئەوەیە حوكمی ئەو كەسە چیە وە ئایا لعنەتی لێ ئەكرێ ئایا جوێنی پێ ئەدرێ یان بێ دەنگ ئەبین لەئاستی وە ئایا كورەكەی بۆی ئەتوانی دوعا بكا وە فەرق چیە لە نێوان ئەوەی ئەم دەعوەیەی بینی بی و بەرگوێی كەوتبێ و زانیبێتی یان ئەوەی نەیزانیبی ئەو كەسەی موعاددی بوو واتا دژایەتی ئەو دەعوەی كردبێت ؟ لەجوابەكەیدا ئەلێ (من مات من أهل شرك قبل بلغه هذه دعوة فلذی یحكم علیه أنه إذا كان معروفه بفعل شرك)هەمان وەلامی باوكیان !ئەلێ ئەوەی كەوا لە ئەهلی شیرك مردبێت وە ئەم دەعوەی پێ نەگەیشتبێ وە حوكم ئەدرێ بەسەریدا ئەوەیە كەوا ئەگەر ناسرابێ بەوەی فعلی شیركی كردبێ واتا هاواری غەیری خوای گەورەی كردبێت نەزری بۆ غەیری خوا كردبێ توكلی لەسەر غەیری خوا بەستبێ ئەمەی بەدینی خۆی زانیبی وە لەسەر ئەمە مردبێت(فهذا ظاهرة أنه مات علی الكفر )بۆ ئەلێ(ظاهرة)؟ لەبەر ئەوەی ئێمە نازانین پێ گەیشتوە كاتی خۆی یان پێ نەگەیشتوە بەلام لەهەردوو حالەتەكەدا چییە ؟ كافرە موشریكە . ئەلێ ئەمە دوعای بۆ ناكرێ (أضحها له)أضحیەی بۆ ناكرێ (ولا یصدق عنه) صەدەقەی بۆ ناكرێ (وأما حقیقة أمري فی لله تعالی) كە ئەلێ (فی لله) مەبەستی چیە ؟

[1] :كوڕەكانی شێخ :محمدی كوری عبدالوهابن .

یانی خوا لەڕۆژی قیامەتدا ئەم شەخصە چییە؟ ئەگەر ئیمتحان بكرێی ڕزگاری ئەبێ یان نا یاخود لەكاتی خۆیدا إقامە حوجەی لەسەر كراوە پێ وتراوە وە ئەسلەن هەر ئیختبار ناكرێ ڕأسەن بۆ جەهەنم ئەڕوا، (فإن كات قد قامت عليه الحوجة قي هذا لحياته معانده )ئەگەر هاتوو إقامە حوجەی لەسەر كرابێ(فهذا كافرا فی الظاهرة والباطن)یانی چی (فی الظاهرة والباطن؟) یانی ئەم كەسە ئەمە لەدەرەوە و لەناوەوە لەهەردوو حالەتەكەدا ئەم شەخصە پێ ئەوترێی موشریك وەعەزابیش ئەدرێی لەسەری (إن كان لم تكن حوجة فأمر الي الله تعالي )ئەگەر إقامە حوجەی لەسەر نەكرابێ نازینین بەڵام لەهەمان كاتدا پێ نالێن موسلیم چونكە ئەمە موسلیم نیە كەواتە لێرەدا ئەگەر سەیری كەین كەسانێك هەن بلفعل موحیدن كەسانێك هەن موشریكن بەڵام چیە إقامە حوجەیان لەسەر نەكراوە كەسانێك هەن موشریكن إقامە حوجەیان لەسەر كراوە كەواتە لەهەردوو حالەتی موشریكەكەدا پێ ناوترێی موسلمان (وأما سبه ولعنه فلا يوجز )بەڵام سب و لعن جائیز نیە (بل لايجوز سب الأماوة مطلقا)ئەڵێ نابێ مطلقی هەروا بەرەها بەو شێوەیە تۆ جوێن بە مردوان بەدی بەعام یانی (عن عائشة رضي الله عنها قالت قال النبي ﷺ لا تسبوا الأموات)[1] جوێن بەمردوان مەدەن (فإنهم قد أفضوا إلى ماقدموا)ئەوەی كەوا كردوویانە ڕۆیشتن ئیشی خۆیان و كاری خۆیان (إلا إن كان أحدا من أُمتِ الكفر) مەگەر لەئیمەی كوفر بێ لەسەركردەكانی كوفر بێ مەسەلەن ئەوە (ئەبو لەهەب)تۆ هەموو جار لەقورئنەكدا فێری كردووین كە بلێن (تَبَّتۡ يَدَآ أَبِي لَهَبٖ وَتَبَّ ۝١)[2] ئەها قسەی یَ ئەلبێن (وقد يغتر الناس به فلابأس في سبه إذا كان فی مصلحة دينه)ئەم جۆرە كەسانە كە ئەئیمەی كوفرن قەیناكا جوێنیان پێ بوترێی لەیەر ئەوەی مەصلەحەی دینی تێدایە كەواتە ئێستا لەم دووفتوایە چی تێدایە و چیمان بەردەست كەوت زۆر بەئاسانی ئەوەمان دەست كەوت لە مەسئلە ظاهیریەكاندا لەمەسئەلەكانی كە واضحە بەتایبەتی مەسئەلەی ئوموری توحید و شیرك عوزر نیە بۆ هیچ كەسێك كە پێ بوترێ جاهیل چونكە ئەم مەوزوعە پێش ریسالەش بێ پێش ئەوەی پێغەمبەریش بنێرێ ﷺ یانی خوای تعالی پێش ئەوەی پێغەمبەرانیش بنێری ئەو قەومە بەچی لەقەلەم دراون بەموشریك ئێستا

---

[1] :صحیح البخاري .
[2] :سورة المسد اية :١

تۆ تەماشای بلقیسە کە بلقیس پێش ئەوەی سولێمان کاغەزی بۆ بنوسێ کەشەمسیان ئەپەرست ئەمانە موحید بوون یان موشریکبوون؟ موشریك بوون هەتا نصی ئایەتەکە ئەلێ لەقومی کافرین بوون بەس کاتێك کەریسالەیان بۆ ئەروا ئەم ریسالەیە بۆ چیە ؟ إقامە حوجە .

إقامە حوجە بۆچیە ؟ بۆ عەزابە ئەوە بوو وتی ئەگەر ئێوە إستحابە نەکەن جەیشێك ئئەنێرم هەر نەتوانن دەسەلاتان هەبێ بەرامبەری سولێمان نایەت بلێ وەلا موشریك نین جاری ناتوانم پێیان بلێم تعینیشی کردن وابوو یان نا ؟ کەواتە ئەمانە موشریکن کافرن قەومی پێغەمبەر ﷺ کە پێغەمبەربۆیان هات موشریك بوون یان موشریك نەبوون ئەوەبوو باشمان کرد زۆر زۆری تیابوو خاسەتەن موحیدی تیابوو بەلاّم موشریك بەهەردوو بەشەکەیشی تیابوو ئەوەی کە إقامە حوجە لەسەر نەکراوە ئەوەشی کەإقامە حوجەی لەسەر کراوە کەواتە ئەم مەوزوعە زۆر گرینگە ئەبێ تەماشای فتاوی علماء بەم شێوازە بکەین کاتێك کە ئەلێ من کافری ناکەم کافری ناکەم لەزۆری کەلامەکانی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) مەبەستی پێ تەعزیب دانیەتی ها . کافری تەعزیب دراو نەك ئەو کافرەی کە کافرە و پێ نالێ کافرە پێ دەلێ کافر وە هەروەها کەلامی تر لەم بارەیەوە ئە ئەئیمەی دەعوەوە زۆرە کەوا سەبارەت بەو کەسانەی کەوا لەدەعوەی توحید تێ نەگەیشتون بەجاهیلی مردوون ئەمانە موشریکن لەوانە فتاوی شێخ(محمد بن ناصر بن معمر)[1] باسمان بۆ ئەکا لەم کتێبەدا ئەلێ پرسیاری لێ کرایە (عن قول فقها من أن المرتدة لایرث ولا یرث لە فکفراَ أهل زمانە هلم مرتدن أم حکمهم حکم عبدة أوثانە وأنهم مشریکون) پرسیار لێکراو لەقەولی فقها کاتێك ئەلێ مرتد نەمیرات وەرئەکرێ نەمیراتیشی لێ وەر ئەگیری کابرایەك کە کافربێ بمری موسلمانەکانی نەوەی میراتی لێ نابەن یاخود ئەگەر کەسێك موسلمان بێ نەوەکەی کافر بێ کافرەکە میرات لەباوکە موسلمانەکەی نابا ئەلێ ئایە ئێمە تەماشای کوفاری زەمانی خۆمان کەین (فکفراَ أهل زمانە هلم مرتدن) ئایا ئەوان مرتدن؟ مەبەستی لەکوفاری ئەهلی زەمان [2] (أم حکمهم حکم عبدة أوثانە وأنهم مشریکون) تەماشاکە ئایا حوکمی موشریکیان ئەدەنێ موشریکی

[1]: یەکێك لە زاناکانی ئەهلی نجد .

[2]: مەبەستی ئەوانەیە هاوار ئەکەن غەیری خوای تبارك وتعالی یاخود نەزر ئەکەن بۆ غەیری خوای تعالی .

ئەصلی یان مرتدیان ئەدەنێ ئەویش لەجوابەكەدا ئەلێ (أما من دخل فی دینه الإسلام ثم ردتَه) ئەلێ هەر كەسێك بێتە ناو دینی ئیسلام دوای هەر گەرێتەوە ئەوە پێ ئەوترێ مرتد (فهؤلاء مرتدون وأمرهم عندك واضح) ئەلێ دیارە حوكمی ئەم شەخصە دیارە و چیە حوكمەكەی دیارە ئەو كەسە ئەبێ چی لێ بكرێ . إستتابە ئەكرێ یاخود هەندێ لە ئەهلی عیلم إستجابەشی لێ قبول ناكا ئەلێ ئەكوژرێی ئەمانە إستتابە ئەكرێن وەرە تەوبە بكە لەو ریدەیە ئەگینا ئەت كوژین ئەم توبەكردنە بۆ ئەوە نییە تاپێ بوترێ كافر بۆ ئەوەیە كە لەسەر كوفرەكەی تەعزیب بدرێی مرتد بوە كافر بووە ئەهێنرێ بۆ محكەمە لێرە چی لێ ئەكرێ إستتابە ئەكرێ كەواتە كەسەكە معینە وەكافریش كراوە وەهێنرایە بەردەم محكەمە ئەمە مرتد ئەلێ ئەمە خۆت ئەزانی واضحە ئەمرەكەی (وأما لم یدخل فی دین الإسلام ) ئەما هەر لەبیدایەتەوە نەچۆتە ناودینی ئیسلام یانی لەسەرەتاوە لەم قسەیە وردبینەوە (بل أدركة دعوة الإسلامیة وعلی كفرة) ئەم دەعوە ئیسلامیە توحیدییە جوانەی پێ گەیشت بەلاَم ئەو لەسەر شیرك وضلالەتی خۆی بوو یانی یەكێك دایك و باوكی ئەیوت (یارسول الله )والعیاذبالله یان (یاعبدالقادر) نەزریان ئەكرد بۆ غەیری خوا بانوێژ و رۆژو عیبادەتیش بكەن چونكە ئەمانە وتمان موشریكین قوریش حەجیان ئەكرد و رۆژوویان ئەگرت صەدەقەشیان ئەدا عیباداتیان هەبوویان نا ؟ هەیان بوو وەشیركیان تێكەلاو بەئیشەكەیان كردبوو ئەمانە پێیان ئەوترێ كوفاری ئەصلی[1] جا ئەلێ گەر كەسانێك ئاوابن و دایك و باوكیان موشریك بێ ئەولادەكانیشیان إلحاق ئەكرێن بەخوێیانەوە هەر موشریكن (وأما لم یدخل فی الآسلام)ئەلی ئەوەی كە نەهاتبێتە ناو دینی ئیسلام لە ئەساسەدا مەبەستی بەوەیە با نوێژ و رۆژوو عیبادەتیش بكەن بەلاَم شیركیان كردوە (بل أدركة دعوة الإسلامیة وعلی كفره) دەعوەی ئیسلامی پێ گەیشت یانی دەعوەی (لا اله الا الله محمد رسول الله ) ﷺ لەسەرئەوەی كەوا نابێ ئێمە شەریك بكەین نابێ ئیچمە هاوبەش بۆ خوای تعالی پەیدا بكەین لەعیبادەتدا ئەم لەسەر ئەو شیركە بوو (كعبدة الأوثان)وەك عەبەدی ئەوثانی زەمانی پێغەمبەرﷺ (فحكمه حكم الكفار الأصل)ئەلێ حوكمی ئەمە حوكمی كافری ئەصلیە .

---

[1] : ئەوەیە كەوا هەر لەبنەرەتەوە لەسەر كوفر و شیرك هاتبێ .

ئینجا مورتەد لەگەل کافری ئەصلی حوکمەکەی هەندێك جیاوازیان هەیە (لي أنا لا نقولوا الأصل إصلامهم) ئێمە نالێن ئەصلەکەی ئیسلامە لەناو ئەمانەدا یانی ئەگەر بنەمالەیەکت بینی ئێسنا بنەمالەی شێخ و مشایخ و دەورێشەکان هەر بەشیرك وضلالەت هاتوون ئێمە نالێن ئەصلەکەیان ئیسلامە ئەلێن لەسەر شیرك هاتوون (والکفر تاو عنه)نالێن شیرك تاو لەسەریان ئەمانە بوون بەکافر ئەمانە هەر لەسەر کوفر وشیرك هاتوون (بل نقول الذبن نشؤ بين الكفار وأدرك أبائهم على شرك بالله) ئەلێن ئەوانەی لەسەر شیرك و کوفر پەروەردەبوون باوباپیریان لەسەر کوفر وشیرك ئەوانیان راهێناوە (هك كئابائهم) وەکو کێ وان وەکو ئابائو ئەژدادیان وان (كما دل على حديث صحيح فى قوله :فأبواه يهودانه أوينصرانه أويمجسانه)[1] ئەچنە ضمنی ئەوانەی کە کاتێك مولود لەدایك ئەبێ حوکمی حوکمی دایك و باوکە (فإن كان دين أبائهم الشرك بالله) ئەگەر دینی دایك و باوکیان شیرك پەیدا کردن بوو بۆ خوای تعالی یانی داتیك و باوکێك هاواریان ئەکرد (یارسول الله یا عبدالقادر) جا هەموو یا ئەکانیتر ، بۆ مردوان ئەمانە موشریکن ئەولادەکانیسشیان چین ؟

ئەولادەکانیشیان حوکمی دایك و باوکیان هەیە و موشریکن کوفاری ئەصلی.

(فشأ هائولائى وستمر عليه فلا نقول الأسلا الإسلام والكفر تارء )نالێن ئەصلەکەیان ئیسلامە کوفر بەسەریان داهوتوە وەکو کێ ؟

وەکو مورتەدەکەی کە موسلمانە دوای مورتەد ئەبێتەوە نەء ئەمە ئەوە نیە.

(بل نقول هم الكفار الأصلى)ئەمانە کافری ئەصلین (لايلزمون على هذا تكفير من مات في الجاهيلة قبل ظهور دين )ئەلێ ئەمە ئەوە ناگەینی کە ئێمە ئەوکەسانە سەیرکە ئەم عیبارەتە زۆر دەقیقە ئەبێ وریا بین ئەلێت (لايلزمون على هذا تكفير من مات في الجاهيلة قبل ظهور دين فإن لانكفر الناس بعموم كما أنا لانكفر اليوم بالعموم بل نقول من كان أهي جاهيلة عاملا بلإسلام تارك الشرك فهو مسلم)ئەلێ ئەمە ئەوە ناگەینی بەوە کەپێش ئەم دەعوەیە بەخەلکی بێن والله هەمووی خەلك کافرە نا هەبووە لەسەر تەوحیدی رۆیشتوە ئەوە چیە ئەوە موسلمانە ، هەشبووە لەسەر شیرك بوە لەسەر (یارسول الله) بوە پێی نەوتراوە ئەمە چیە ! موشریك وکافرە بەس موعەزەب علیە نیە هەشبوە پێ وتراوە پێ راگەنراوە ئەمە ئەو

[1] : رواه البخاري والمسلم ، ئەبو هرەیرە گێراویەتەوە .

کافر وموشریکەیە کە تەعزیب ئەدرێی لەسەری تەعزیب ئەدرێی لەسەر ئەو کوفر وشیرکەی کە کردوویەتی جالێرەدا کە ئەلێ ئێمە بەعموم تکفیر ناکەین مەبەستی چیە ؟

مەبەستی لەو تکفیرییە ئەوەیە کە تەعزیب نادرێی نالێ تەعزیب ئەدرێی نالێ إلا ئەو شەخصە کافرە و تەعزیب ئەدرێی نەء کافرێکە تەعزیب نادرێی یان کافرێکە تەعزیب ئەدرێی یان موسلمانێکە لەسەر ئیسلامەکەی ڕۆیشتووە ئەو سێ بەشە دائیمەن بهێنە بەرچاوی خۆتان .!

(وأما كان يعبدوا الأوثاني ومات على ذلك قبل ظهور هذا دين) ئەما ئەو کەسەی کەوا خۆی مەشغول کردوە بەعیبادەتی غەیری خواوە وە پێش ئەوەی ئەم دینەی بۆ دەربکەوێی یانی ئەو دەعوەی (محمدی کوری عبدالوهاب) رەحمەتی خوای لێ بێ (فهذا ظاهرالكفار) ئەمە ظاهیرەیەکەی کوفرە ،(فإن كان يحتميل أنه لم تقم حوجة على الرسالية)ئیحتمالیشە کەوا حوجەی ریسالی لەسەرنەکرابێ إقامە نەکرابێ یانی پێی نەوترابێ .ئایا ئەم إقامە نەکردنی حوجە دەری ئەکا پێی بوترێ کافر؟

لەوە دەری ناکا پێبوترێی کافر ، ئەمە چی زیاد ئەکا تەعزیبی بۆ زیاد ئەکا ئەگەر بێتو إقامە حوجەی لەسەر کرا لەسەر کافرکردنی لەسەر موشریك کردنی تەعزیبدانیشی بۆ زیاد ئەکا ،ئەلێ (ليجهله وعدم من يبنبئه) کابرا کە نەیزانیوە یان کەس نەبوە پێی بلێ (لنا نحكم ظاهر وأمل حكم على الباطل فذلك الى الله)حوکمی لەسەر ظاهیری دەدەین باطنیەکەی بۆلای خوا ئێمە نازانین ئەو کەسە إقامە حوجەی لەسەر کراوە یان نا (والله تعالي لايعذب أحدا إلا بعد قيام الحجة عليه) ئائەمە موهیمە خوای تعالی کەس عەزاب نادا إلا أُقامە حوجەی ئەبێ لەسەر بکرێ ئینجا ئەمە ئاگاداربن بۆیە هەر تأكیدی ئەکەمەوە إقامە حوجە بۆ ئەوە نیە پێبوترێی کافر وموشریك ئەمە پێی وتراوە کافر لێرەدا إقامە حوجە بۆ چیە ؟

بۆ تەعزیب دانیەتی ئایەتەکە نصن ئەلێ (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[1] ئێمە تەعزیبی کەس نادەین هەتا دەعوەی پێغەمبەری پێنەگا ﷺ (وأما من مات منهم مجهول حال) ئەو کەسانەی کەوا نازانین کەوا حالیان چۆنە (فهذا لا نتعرض له ولانحكم بكفره ولا بالٱسلامه)ئاگادار بە لەوانەیە کەسانێك بێن ئەوە بخوێنەوە داوی بێن قطعی بکەن زۆر کەس

[1] :سورةالإسراء اية ١٥:

هەیە ئەچێ عیباراتەكانی شێخ الآسلام(إبن التیمیه و إن القیم و محمدی كوری عبدالوهاب) ئەولادەكانی ئەحفادەكانی چەن لەناوەراستدا قطع ئەكەن ئاخیرەكەی ناهێنن ئا ئەوە موشكیلەكەمانە وەرە هەموو قەولەكەی بێنە ئەلێت (ولانحكم بكفره ولا بالآسلامه) یانی چی ئەم قسەیە نە ئەلێن كافرە نە ئەلێن موسلمانە ئەی باشە لەكافر و موسلمان زیاتر هەیە !؟ مەبەستی لێرەدا (ولانحكم بكفره)یانی (كفرا معذبا علیه)یانی بلێن والله إلا ئەوە تەعزیب ئەدرێی نازانین چوزانین لەوانەیە كوفرێك بێ تەعزیب نەدرێی لەسەری خوا لەرۆژی قیامەتدا چێ لێ ئەكا إختباری ئەكا (ولا بالآسلامه)ناشلێ موسلمانە چونكە یەكێك بلێ (یارسول الله یان یاعبدالقادر) چۆن موسلمانە ! موسلمان نیە موسلیم نیە موحید نیە موشریكە عیبارەتەكە زۆر دەقیقە ئەبێ وردبین (ولانحكم بكفره ولا بالآسلامه)لەوانیە یەكێك بلێ بلێ باشە مەرتەبەی سێیەم هەیە لەدوای كوفر و ئیسلام؟

ئەلێن تۆ تێ ناگەی لەعیبارەتەكە عیبارەتەكە ئەوەیە ئێمە حوكم نادەین بەسەریدا بلێن كافرە بەچی بەكوفرێكی موعەزەب علیه وەهەروەها (ولا بالآسلامه)ناشلێن موسلمانە كەواتە چی مایەوە كوفر غەیری موعەزەب علیه وابوو یان ناسێ بەشەكە.

(ولیس ذلك بما كلفنا أوكلفنا له)یانی ئێمە تكلیفی ئەوەمان لێنەكراوە كە بێن بەدوای ئەوجۆرەكەسانەدا بگرێن بزانین إقامه حوجەی لەسەر كراوە یان نەكراوە پەیوەندیمان چیە ئەوانە چوونەتەوەبۆلای خوای تعالى بەلآم گرینگترین ئەوەیە دوعایان بۆ ئەكرێی ؟

نەخێر لەهەدروو حالتەكە دوعایان بۆ ناكرێی ئەگەر إقامه حوجەیان لەسەر كرابێ ،یانی تۆ ئەیخەیتە ریزی ئەوانەی كەموشریكن ئیتر موعەزەبن یان موعەزەب نەبن .(تِلۡكَ أُمَّةٞ قَدۡ خَلَتۡۖ لَهَا مَا كَسَبَتۡ وَلَكُم مَّا كَسَبۡتُمۡۖ وَلَا تُسۡـَٔلُونَ عَمَّا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ)[1] ئەوانە رۆیشتن ئێمە پرسیارمان لێناكرێی چیان كردوە چیان نەكرد كەواتە (فمن كانت منهم مسلما أدخل الله الجنه) ئەوەی موسلمان بێ وە ئیسلامەتی جێ بەجێ كردبێ ئەو سێ مەرجەی لەتەعریقی ئیسلام باسمان كرد (هور الإساسلام لله بالتوحید والانقیاد له بالطاعة والبراءة من الشرك وأهله)[2] ئەمەیان جێ بەجێ كرد بێ (إلى الجنه) بەئیزنی خوای تعالى بەمەشیئەتی خوای

[1] :سورة البقرة اية :١٣٤

[2] :پێناسەی ئیسلام لای ئەهلی سوننە و جەماعە

پێناسەی عیبادەتمان بۆ بکە ، بۆیە ئاگادارین لەکاتی موناقەشەکردن لەگەل خەلکیدا بۆ نمونە ئەوە شیرکە یا شیرك نیە ئەوە کوفرە یان کوفر نیە ئەوە بیدعەیە یان بیدعە نیە تۆ وەرەوە سەر ئەصلەکە جاری تەعریفی بیدعەم بۆ بکە تەعریفی عیبادەم بۆ بکە تەعریفی شیرکم بۆ بکە بەبەرامبەرکەت بلێ جا یان ئەوەتا ئەیزانێ یاخود نایزانێ ئەگەر زانی تەبعەن ئەمەش زۆر دوورە ئەگەر بزانێ واناکات ئەگەر ناشیزانێ پێی ئەلێن تۆ چۆن شتێك نازانێ تفاصیلی ئەوشتە موفرەداتی ئەوشتە وەردەکاری بەهەلتدا تەفسیرئەکەی یان ئەوەتا بەهەلە بۆت تەفسیر ئەکا وەکو زۆربەی زۆری ئەمرۆ بەهەلە ئەوەشتانەمان بەهەلە بۆ تەفسیرئەکەن بەم شیوەیە وەلامی ئەدەیتەوە (فإنك تقول له : الالتجاء إلى الله عبادة) ئاخر تۆ (الالتجاء )بەعیبادەت نازانێ (الالتجاء ) عیبادەتە تۆ بەمە بەو پەناگرتنە بە صالحین کافر ئەبێ تۆ موشریك ئەبێ (والالتجاء إلى غير الله فيما لا يقدر عليه إلا الله شرك) پەناگرتنیش بەغەیری خوای تبارك وتعالى خۆدانەپالی غەیری خوای تعالى کەوا لەشتێکدا نەتوانێ بۆیە ئەلێ (لا يقدر عليه) شیرکە ، بەلأم لەو شتەی کەوا ئەتوانێ شیرك نیە (لأن من التجأ إلى غير الله في الشدائد فقد أشرك مع الله فيما لا يقدر عليه إلا الله سبحانه وتعالى) لەبەر ئەوە الالتجاء بۆغەیری خوای تبارك وتعالى لەنارەحەتیەکاندا ئەو کەسە شیرکی پەیاکردوە (أشرك مع الله فيما لا يقدر عليه إلا الله سبحانه وتعالى) خوا نەبێ کەس دەسەلاتی بەسەردا نیە ئەگەر تۆ داوا لەغەیری خوای تبارك وتعالى بکەی پەنا بگری بەغەیری خوای تعالى لەوشتانەی إلا خوا دەسەلاتی بەسەردا هەیە ئەوە شیرکە (لأنه هو الذي يجيب المضطر إذا دعاه) کەسێك کەوا المضطر وناچاربێ کەهاوار ئەکا کێ دوعاکەی قبول ئەکا کێ وەلامی ئەداتەوە إلا خوا (ويكشف السوء) نارەحەتیەکان لائەبا (وهو الملجأ سبحانه) خوای تعالى یە کە ئەبێت بیکەینە پەناگەی خۆمان (ولذا لجأ إليه النبي ﷺ حيث يقول :)سەیری ئەم عیبارەتە بکەن کە لەحەدیسی پێغەمبەری خوا ﷺ دا هاتووە فەرموویەتی : (لا ملجأ ولامنجا منك إلا إليك)[1] خوایە پەناگە نیە رزگار بوو نیە نەجات بوون نیە لەتۆ إلا ئەبێ بێنەوە لای تۆ ، ئەگەر بمانەوێت لەعەزابێ تۆ رزگارمان بێ ئەبێ بێنەوە لای تۆ ئەگەرنا کەسیتر ناتوانێ رزگارمان

[1] : البخاري الدعوات ( ٥٩٥٢ ) ، مسلم الذكر والدعاء والتوبة والاستغفار ( ٢٧١٠ ) ،

بكا (قُلۡ إِنِّي لَن يُجِيرَنِي مِنَ ٱللَّهِ أَحَدٌ)[١] خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێ : تۆ پێیان بلێ كەس رزگارم ناكا لەدەستی خوای تعالی كەس رزگارم ناكا لەعەزابی خوای تعالی (وقوله تعالی : وَهُوَ يُجِيرُ وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ)[٢] خوایە تەنها ئەتوانی پەنابات لەخەڵكی كەرزگاریان بكات لەنارەحەتیەكان وەهیچ كەسێك ناتوانێ پەنابات بەخەڵكی كە خوای تعالی بیەوێت كەوا عەزابی بدا (وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ) واتا ئەگەر تۆ بتەوێت رزگار بی لەعەزابی خوا بچیت خۆت بدەیتە پاڵ كەسێك ئەكەسە بتپارێزی ئەو كەسە ناتوانێ بتپارێزی (وَلَا يُجَارُ عَلَيۡهِ) لەبەر ئەوەی پەنا تەنها پەنای خوایە كەس پەنای نیە .

شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) ئەلێ :

(فقل له)تۆ پێی بلێ (أنت تقر أن الله افترض عليك إخلاص العبادة لله وهو حقه عليك) ئایا تۆ إقرار ئەكەی بەوەی كەوا پوختە كردنی عیبادەتەكان كەئەبێ بۆخوای پوختەی بكەیەوە نابێ بۆكەسیتری ڕوانە بكەی تۆ إقرار ئەكەی كە ئەمە فەرزی خوایە و حەقی خوایە لەسەر تۆ ، تەبعەن ئەگەڕینەوە بۆ حەدیسەكە ئەوەی موعاذ كاتێك پێغەمبەرﷺ لێ ئەپرسێ ئەلێ ئەزانی حەقی خوا چیە لەسەرت وحەقی عەبدەكەی چیە لەسەر خوا : حەقی خوای گەورە ئەوەیە كە بپەرسترێی إخلاصی عەمەلی بۆ بكرێی شیركی بۆ پەیدا نەكرێی ، وە حەقی عەبدەكانیش ئەوەەیە كەوا خوا خۆیی دیناوە ئەو حەقە كەوا شیركیان نەكرد بیانخاتە بەهەشتەوە وە عەزابیان نەدا . كەواتە پرسیاری لێ ئەكەین سەیری ئەم عیوارەی شێخ(محمدی كوری عبدالوهاب) بكەن لەم ریسالەیەدا لەگەل بەرامبەرەكەت بەهێمنی و لەسەرخۆیی قسەی لەگەلدا ئەكەی ئایا تۆ دان ئەنێ بەوەی كەوا خوا فەرزی كردوە لەسەرت كەوا هەموو عیبادەیەك بۆ خوای تعالی پوختە بكەیتەوە نابێ بەشی كەسی لێ بدەیت وە ئەوە حەقی خوایە لەسەر تۆ (فإذا قال : نعم. )ئەگەر بەرامبەر وتی بەلێ من إقرار بەوە ئەكەم (فقل له : بين لي هذا الذي فرض عليك وهو إخلاص العبادة لله وحده وهو حقه عليك) پێ بلێ : ئادەی بۆم بەیان بكە ئەو پوختە كردنەوەی عیبادەتانە چیە بۆم بەیان بكە كەخوا

---
[١] :سورة الجن اية :٢٢
[٢] : سورة المؤمنون اية :٨٨

فەرزی کردوە لەسەرتۆ کە حەقی خوایە لەسەر تۆ (فإن كان لا يعرف العبادة ولا أنواعها) نایزانێ ئەگەر نەیزانێ (فبينها له بقولك)بۆی باسبکە (لاأدری) وەلامی نازانم ئاسانە ئەوە من بۆت باس ئەکەم ئەوەتا یەك بەیەك عیبادەتەکانی بۆ باس ئەکەی ئەلێ دوعا عیبادەیە نەزەر عیبادەیە داوا کردنی شەفاعەت عیبادەیە سەمع وتاعە عیبادەیە ،چۆن تۆ ئێستا نوێژو ڕۆژوو بەعیبادەت ئەزانێ بۆ غەیری خوای ناکەی بەهەمان شێوە نابێ ئەوانیتریش بۆ غەیری خوا بکە نابێ بەشێکی بۆ خوا بێ و بەشێکی بۆ غەیری خوا بێ ئەبێ هەموو عیبادەتەکان سەرجەمی هەمووی بۆ خوای تعالی بێ (فبينها له بقولك : قال الله تعالي)بۆی بەیان بکە و ئایەتی بۆ بهێنەرەوە (ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ)[1] (ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةً) (إدعوا )ئاگادارین لێرەدا هەمووجارێکیش باسمان کردوە کەوا وتمان کەلیمەی دوعا لەقورئاندا بەمانای دوعای مەسئەلە دێ بەمانای عیبادەش دێ یانی داوا لەخوا بکەن یان عیبادەت بۆ خوا بکەن با بەهەردوو ماناکەی بیلێن ئێستا !

مانای یەکەم : (ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ) داوا لەخوا بکەن داوا لەکەسیتر مەکەن داوا لەخوا بکەن بەو شێوەیەی (تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ) بەملکەچی و بەزەلیلی وە بەسریی ئاگادارین (خُفيه ،خِفية) جیاوازیان هەیە هەردووکی لەقورئاندا هاتووە (وَخُفۡيَةً) واتا بەنهێنی (خِفية) واتا بەترسەوە لێرەدا ئەلێ بەمەلکەچی و بەنهێنی یانی ریا و سومعەی تێدا مەکە بۆیە لەئایەتەکەدا ئەلێ (إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ ) خوای گەورە ئەوکەسانەی خۆش ناوێی کە تەعەدا لەدوعا ئەکەن دەنگ بەرز ئەکەنەوە و هاوار ئەکەن وریا ئەکەن لەبەر چاوی خەك ئەوبابەتانە .

مانای دووەم : عیبادەت بکەن بۆ خوا بەملکەچی و بەنهێنی واتا عیبادەتەکانتان هەتا بۆتان ئەکرێی إلا ئەو عیبادەتانە نەبێ کە بەدەر ئەکەوێی ئەگەر نا دەری مەخە ریا و سومعە مەکە ! وە بترسە کەوا خوای تعالی لێت قبول بکا یان نا یانی ئەبێ تۆ عیبادەتەکە وابکەی نەك تۆ سینگ دەرپەڕێنیتی و شانازی بکەیت منەتی پێ بکەی بەسەرخوای گەورە ئەترسم کەوا خوای گەورە لیم قبول نەکا .

[1] سورة الأعراف اية :٥٥

(فإذا أعلمته بهذا) ئەگەر تۆ ئەمەت پێ ڕاگەیاند(فقل له : هل علمت أن هذا عبادة لله ؟) كەزانیت ئەمە عیبادەتە بۆ خوا (فلا بد أن يقول : نعم. والدعاء مخ العبادة) گەر بلێ بەلێ من ئەزانم وەدوعاش ئەمە موخی عیبادەیە تەبعەن حەدیسمان هەیە لەمبارەیەوە (الدعاْء هوالعبادة أو الدعاء مخ العبادة) هەندێك لەعولەما ئەفەرموون لەفضی موخی عیبادە ضعیفە بەلام (الدعاء هوالعبادة) ئەوە صحیحە (فقل له : إذا أقررت أنه عبادة لله) كەمادام تۆ دان ئەنێ و إقرار ئەكەی كەوا ئەوە عیبادەتە بۆخوای تعالی (ودعوت الله ليلا ونهارا خوفا وطمعا ، ثم دعوت في تلك الحاجة نبيا أو غيره هل أشركت في عبادة الله غيره ؟) بلێ مادەم عیبادەت بۆ خوا بێ با بەبەردەوامیش داوا لەخوا بكەی بەس ڕۆژێك لەڕۆژان و جارێك لەجاران وتت (یارسول الله) یاخود (یاعبدالقادر) ئایا شەریكت پەیدا كرد لەوعیبادەتە بۆخوای تعالی یان نا ؟! ئایا پێغەمبەرت ﷺ كرد بەشەریك بۆ خوا یان نا ؟! یان ئەو تابیعی و ئەو صەحابەیە یان ئەو پیاوچاكەت كرد بەشەریك یان نا (فلا بد أن يقول : نعم. ) بێگومان دەبێ بلێ بەلێ و ئەوەشەریكم پەیا كرد وە لەوحالەتەدا بویت بەموشریك .

شێخ(صالح) ئەلێ :

(أي تسأله عن معنى العبادة وما الفرق بينهما وبين الالتجاء. )لێ بپرسە بلێ مانای عیبادە چیە عیبادەم بۆ بەیان بكە ؟! وەكو وتمان یان ئەیزانێ یان نایزانێ یاخود بەهەلە تەفسیری ئەكا ئەگەر زانی بلێ ئەوەشیركە تۆ ئەیكەیت ئەگەر نایزانێ بلێ عەیب نیە تۆ شتێك كە نەیزانی ئەلی وانیە و ئینكاری ئەكەیت یانی كاتێك ئەو الالجتاء بەعیبادە نەزانێ بلێ من نەمزانیوە كەوا شیركە بۆنمونە یان بلێ نەخێر ئەوە شیرك نیە بامانای عیبادەش نەزانێ بلێ الالجتاء شیرك نیە مانای عیبادەش نازانێ بلێ ئاخر چۆن ئەبێ تۆ مانای عیبادەش نازانی كەچی ئینكاری لەوە ئەكەیت كەوا الالجتاء كە عیبادەت نەبێ بۆ خوای تعالی ئەبی بەیانی مانا و جیاوازی لەنێوان دوعا و الالجتاء ی بۆ بكەی عیبادە و الالتجاء ی بكەی ،

(وقل له : هل العبادة واجبة أو مستحبة ؟ )پێ بلێ ئایە عیبادەت كردن بۆ خوای گەورە واجبە یان موستەحەبە ؟! بێگومان هەموومان ئەزانین كەوا واجبە (فلا بد أن يعترف أن العبادة أمر واجب وحتم على العباد) ئەبێ ئیعتراف بەوە بكات كە عیبادەت كردن و ملكەچی

و سەمع و تاعەی خوا واجبە لەسەر عەبدەکان (وأنها حق الله على العباد) ئەوە حەقی خوایە لەسەر بەندەکان (فإذا اعترف بهذا فقل له) ئەگەر ئیعترافی بەمە کرد پێی بڵێ (فسر لي العبادة ما معناها وبين لي ما أنواعها) دەی تەفسیری عیبادەم بۆ بکە و جۆرەکانیم بۆ باس بکە (ما دمت أنك اعترفت أن العبادة لله) مادەم الحمدلله ڕێك کەوتین لەسەر ئەوەی کەوا عیبادەت هەر بۆخوا ئەکرێی بۆ غەیری خوا ناکرێی (وإنها واجبة على العبد) واجبە لەسەر عەبدەکان (فإنه يجب عليك أن تعرف معناها) دەباشە وەرە ماناکەشی بزانە (وأن تعرف أنواعها) جۆرەکانی عیبادەتیش تەعریف بکە چونکە عیبادەت جۆری زۆرە (وإلا فكيف يوجب الله عليك شيئا وأنت تجهله ولا تعرفه) چۆن ئەبێ خوای تعالی شتێکت لەسەر واجب بکات تۆ نەزانیت ئەو شتە چیە وە جۆرەکانی چیە ! (فإنه لا يعرف العبادة ولا يعرف أنواعها ، وهذه آفة الجهل) ئەو کابرایە دیارە نەیزانیوە پێناسەی عیبادەت چیە وە جۆرەکانی نەناسیوە وە ئەمە موسیبەت و ئافاتی نەزانین و جەهالەتە وە جەهالەت ئەوەمان تووش ئەکات کەوا نازانین (ومن هنا يتعين على العباد أن يتعلموا ما أوجب الله عليهم) پێویستە لەسەر عەبدەکان بچن خۆیان فێر بکەن بزانن کەوا خوا واجبیان کردوە لەسەریان (وما فرضه الله عليهم حتى يؤدوه على وجهه الصحيح) بۆیە فەرزی کردوە بە فەرزێکی چاك و ڕێك و پێك و ڕاست ئەدای بکەن (ويتجنبوا ما يخل به وما يبطله) دووربکەونەوە لەوشتانەی کەوا خەلەلێك لەو عیبادەتە دروست ئەکا یاخود بەتالی ئەکاتەوە (أما أن تعبد الله على جهل) تۆ عیبادەت بکەی بۆ خوا بەجەهالەت و نەزانین (فإن هذه طريقة النصارى الضالين) ئەمە ڕێگەی ئەو نەصرانیە ضالانەیە کەوا عیبادەت بۆ خوا ئەکەن بەلاّم نازانن چۆن بیکەن بە ڕێگەی هەلە ئەیکەن (يعبدون الله على جهل وضلال) عیبادەت ئەکەن بۆخوا بەنەزانین و بەگومرایی (والله أمرك أن تسأله أن يجنبك طريقهم) خوای تعالی وای لەئێمە کردوە تاکە بەتاکە نوێژەکان فەرزی عەیبنە لەسەر پیاو ژنمان لەسەر کور و کچمان لەنوێژەکانمان بڵێن چی (ٱهۡدِنَا ٱلصِّرَٰطَ ٱلۡمُسۡتَقِيمَ ۝٦ صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ )[1] خوایە هیدایەتمان بدە بۆ ڕێگەی ڕاستی ئیسلام و قورئان ڕێگەی پێغەمبەرمحمد

[1] :سورة الفاتحة اية :٦–٧

ﷺ ڕێگەی هەموو پێغەمبەران (صِرَٰطَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمۡتَ عَلَيۡهِمۡ)ڕێگەی ئەوانەی كە نیعمەتت ڕۆیشتووە بەسەریان لەئەنبیاء و لەرسول لە شهداء ولەصدیقین بەلاًم (غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ) ڕێگەی (ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ) نا كە یەهودە ڕێگەی (ٱلضَّآلِّينَ)نیش نا كەنەصارایە ، تۆ خوا داوای ئەمەی لێ كردووی جالێرەدا باشتێكی زۆر گرینگ باس بكەین بەداخەوە زۆربەی زۆری خەڵكی كاتێك كە ئەم نوێژە ئەكەن و ئەم ئایەتانە ئەخوێنەوە بەداخەوە ڕاوەستاون بەپێوە لەبەر دەمی خوای گەورە داوای لێ ئەكەن خوایە داوای ڕێگەی ڕاستت لێ ئەكەم داوای ئەوەت لێ ئەكەم كە لەڕێگەی (غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ) بمپارێزی كەچی بەداخەوە ئەوەی بەناوی ئیسلامەوە داوا ئەكا لەسەر ڕێگەی یەهود و نەصارا ئەڕوات ! دیموكراتیەت لیبرالیەت ئینتخابات پەرلەمان ئەمە هەمووی ڕێگەی كێ یە !؟ خوا لەقورئان باسی كردوە یان ڕێگەی یەهود و نەصارایە بەداخەوە لەنوێژەكە ئەڵێ خوایە بمپارێزی لەڕێگەی پەرلەمان كەچی ئەچێت بۆ پەرلەمان ئەڵێ ئەوەشی نەچێت موسلمان نیە ! پەنا ئەگرین بەخوا ، خوایە بمپارێزی لە دیموكراتیەت ئەوەتا لەئایەتەكە ئەڵێن خوایە بەس ڕێگەی پێغەمبەرم نیشاندا ﷺ ڕێگەی (غَيۡرِ ٱلۡمَغۡضُوبِ عَلَيۡهِمۡ وَلَا ٱلضَّآلِّينَ) بۆمان نەهێنی ئادەی پرسیار ئەكەین علمانیەت لە فەرەنسا نەهات ! عەلمیانیەتی تازە لەفەرنسا نەهات ، وەلە و عەلمانیەت كۆنە تۆ سەیربكەی لەقورئاندا خوای گەورە ئەفەرموی (فَأَعۡرِضۡ عَن مَّن تَوَلَّىٰ عَن ذِكۡرِنَا وَلَمۡ يُرِدۡ إِلَّا ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا)[1] ئێ ئەوە پێناسەی عەلمانیەتە (الدنیاویە) (الأخر ویة) خوای گەورە ئەڵێ پشتكەرە ئەوان كەچی ئەمڕۆ تەماشا ئەكەی باوەشیان پێدا ئەكەن بەرەو ڕوویان ئەڕۆن هەتا ئەڵێت چارەسەرمان بەوە ئەكرێت ئەوە موشكیلەیەكەیە ئەڵێ چارەسەرمان بە عەلمیانیەت ئەكرێی چارەسەری كێشەكانمان بەپەرلەمان ئەكرێی چارەسەری كێشەكانمان بەگەڕانەوە بۆ ڕەئی شەعب ئەكرێی تۆ كە گەڕایتەوە بۆ ڕەئی شەعب بزانە ئەوەت پێی دەڵێ كە خوا پێت ئەڵێ ئەمڕۆ زۆر گوێمان لەشتی سەیر سەیرئەبێ بەداخەوە ئەم باسی عەلمانی ناكەم ئەوە عەلمانی ڕێگەی عەلمانیەتی گرتووە و كابرا خۆیی إعلان كردوە كافری ناكەم و خۆیی خۆی كافر ئەكا ئەڵێ من علمانیم و من دونیاویم من أخرەویی نیم من ئەڵێم برۆ كەیفی خۆتە هەی كافر

[1] : سورة النجم اية :٢٩

ی موشريك خوای گەورە ئەفەرمووی (فَمِنَ ٱلنَّاسِ مَن يَقُولُ رَبَّنَآ ءَاتِنَا فِى ٱلدُّنْيَا وَمَا لَهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنْ خَلَٰقٍ)[1] تۆ هيچ نەسيبێك و شتێكت نيە لەئاخيرەتدا برۆ تۆ دونياى خۆت بۆخۆت بەس كاكەی ئيسلامی تۆ دێتە پێشەوە تۆ ئەڵێ والله چارەسەری من ئەوەيە كەوا گەڕانەيەوە بۆ ڕەئی گەل !! ئادەی كام گەل ! ئەو گەلە جاهيلەی كە لەشيرك و گومراييدايە ئاگای لەخۆ نيە ئەو خەلكەی كە لەشيركی عەلمانيەتدايە زۆربەی زۆری هەمووی إلتحاقی كردوە بە عەلمانيەت ئەگەڕێتەوە بۆ ڕەئی ئەوان يان ئەگەڕێتەوە بۆ ڕەئی صۆفی و دەروێشەكان كە دەڵێن (ياعبدالقادر ) حای حوی بۆ ئەكەن ! ئەگەڕئێتەوە بۆ ڕەئی مبتديعەكان ئادەی كێ هەيە لەناو موجتەمەعی ئێمەدا تەوحيدی خالص ببات بەڕێوە إلا كەمترين كەس نەبێ ! تۆ ئەگەر بگەڕێتەوە بۆ ڕەئی زۆرينە ئەدۆڕێت ! دەی باشە گەر تۆ دێت پيادەی ئەوە ئەكەی كەوا ڕەئی زۆرينەی هەلبژێری بۆ كێشەت هەيە لەگەل عەلمانيەكاندا كەئەوان لەپەرلەماندان و زۆينەن قەرار ئەدەن ئەڵێ بەزۆرينە برديان تۆخۆت وتوتە زۆرينە ! بۆخۆت ڕازی بووی بەوە بۆخۆت چويتە ناو ئەو هۆلە بەزۆرينە بێ بەس تۆ بێ عەقلی تۆ گەمژەی و ئاگات لەقورئانەكەتدا نيە كە خوای تعالی ئەفەرمووێت : ئەگەر تۆ إطاعەی زۆرينەی خەلكی بكەی لەڕێگەی خوا سەرت لێ ئەشێوێنن (وَإِن تُطِعْ أَكْثَرَ مَن فِى ٱلْأَرْضِ يُضِلُّوكَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ)[2] تۆچۆن ئەبێ بەزۆرينە بيكەی ئەمە ڕێگەی يەهود ونەصارايە تۆ ئەبێت بەحەق بيكەی بلێ لەگەل حەقدام ئەگەر كەسيشی لەگەلدا نەبێ بزانە چۆن سەريان لەخەلكەكە شێواندوە ، والله با بگەڕێنەوە بۆلای گەل نەخێر ئەبێت بگەڕێتەوە بۆلای خوای خەلك نەك بۆلای خەلك ئەوە شيركە ئەوە گومراييەو ضلالەتە جا لەم ئايەتە پيرۆزەدا كەبەداخەوە زۆربەی خەلكی كە لێ بێ ئاگايە ئەشيلێن بەس لێ بێ ئاگان هەروەكو (لا اله الا الله)كەيان ئەو ئەلێت (لا اله الا الله) ماناكەی چيە ؟! يانی نا بۆ هەموو شتێك تەنها بۆ خوا ! كەچی بەعكسەوە ئەلێن بەلێ بۆ هەموو شتێك إلا بۆ خوا نەبێ ! لێرەدا شێخ ئەلێ تۆ پێ بلێ ئەمە ڕێگەی گومرايانە كەوا نەصاران شتێكی تر ئەوەيە لەم سورەتی فاتيحەيەدا سبحان الله زۆر ئاشكرايە پێت ئەلێ خوايە ڕێگەی يەهود و نەصارام نيشان مەدە كەچی سەير

[1] : سورة البقرة اية :٢٠٠

[2] : سورة الأنعام اية :١١٦

ئەکەی ئەمرۆ هەموو ئەگەرێتەوە بۆلای یەهود و نەصارا ئەوروپا چیە ئەمریکا چیە ! زۆرینەی زۆری سەرزەویی ئێستا نەصرانیە پلکەی یەکەمە ئەوەتا هەر ئەلێ ئەوروپا و ئەمریکا دوای ئەوە ئەگەرێتەوە بۆلای جولەکە کە ناویان ناوە إسرائیل[1] ئێمە پێ نالێن إسرائیل پێ ئەلێن دەولەتی یەهود دەولەتی شیرکی یەهودی بەس جولەکە پێیان بلێ تۆ کوری منی ئەلێ بەقوربانت بم دەستت ماچ ئەکەم! نەك خۆیی لێ بەریی بکا تۆ ئەبێت خۆتی لێ بەریی بکەی بلێ نە یەهودیم و نەنەصرانیم هەتا یەهود و نەصرانیەکان مونازەعەی پێغەمبەر و صەحابەکانیان ئەکرد ﷺ لەسەر (إبراهیم) خوای گەورە وتویەتی (إبراهیم) نەیەهودی بوە نە نەصرانی (مَا كَانَ إِبْرَاهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ الْمُشْرِكِينَ)[2] یانی ئێوە موشریکن ئێوە ضال والمضلن عەجیبە لە کەسێك هەموو رۆژی لەنوێژەکەیدا چەند جار دووبارەی بکاتەوە بلێ خوایە رێگەی یەهود ونەصارام نیشان مەدە کەچی لەسەر رێگەی ئەواندا بڕوات کەچی بەخەڵکیش بلێ إلا ئەوە حەتیمە دەبێ لەسەری بڕۆیی ئەوە واجبە ئەوە تەواوە! پاشان ئەلێ (فالضالون هم الذين يعبدون الله على غير علم) نەصارای گومرا و ضال وە هاو وێنەکانیان ئەوانەن کە بەبێ عیلم خوا دەپەرستن (وعلى غير معرفة بالعبادة) نازانن عیبادەت چیە ! (وإنما يعبدون الله بالعادات والتقاليد) خوا ئەپەرستن بەعادات و تەقالید وەکو ئەمرۆ هەمووی عادات و تەقالیدە مەنهەج نیە لەناخیان و لەکیانیاندا نیە ئەو شەخصە کە بلێ لەخوا زیاتر من کەسیتر قبول ناکەم (وما وجدوا عليه آباءهم وأجدادهم) ئەوەی باو باپیرانیانی لەسەر بینیوەتەوە ئەمرۆ وایە ! سەیری رێبازەکان بکە هەمووی هاواری کەسێك و شەخصێك ئەکا کەمردووە ئیتر ئەگەر بەرێگای عەلمانی بێ یاخود بەرێگای شیرکی و صۆفی ودەروێشی بێ (دون أن يرجعوا إلى ما جاءت به الرسل) ناگەرێنەوە بۆلای پێغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) (ونزلت به الكتب) ناگەرێنەوە بۆلای ئەوەی کە قورئان پێی هاتۆتە خوارەوە (وهذا هو سبب الضلال) کەواتە هۆکاری ئەم گومراییە ئەمەیە ! (والالتجاء هو طلب الحماية من أمر مخوف لا يدفعه إلا الله) باسەیری الالتجاء بکەین چی یە ؟ خۆدانە پاڵ پەنا گرتن بریتیە لە داواکرن وطەلەبی حیمایە داواکاری

---

[1] : واتا عبدالله

[2] : سورة ال عمران اية :٦٧

پاراستنه لەخوا وە لەهەرکەسێك کەتۆ داوای دەکەی الالتجاء ئەمەیە لەشتێك کە ترسناکە إلا خوا لای ئەبات کەسیتر لای نابات کەواتە ئەمە عیبادەتە ! ئەگەر بۆ خوای بیکەی عیبادەتە ئەگەر بۆ غەیری خوای بیکەی شیرکە ، (فهو نوع من أنواع العبادة ، والله سبحانه يجير ولا يجار عليه ويعيذ من استعاذ به) جۆرێکە لەجۆرەکانی عیبادە وە خوای تبارك وتعالى خۆیی پەنای خەڵکی دەدا کەس ناتوانێ پەنای کەسێك بدا کە خوای گەورە بیەوێت سزای بدا وە خوای گەورە خۆیی ئەوکەسانە ئەپارێزی کەوا داوای پاراستن لەخوای تباك وتعالى بکەن (فمن التجأ إلى ميت فقد عبده من دون الله) هەرکەسێك خۆیی بداتە پاڵ مردوویێك یاخود داوای پەناهەندەیی لەمردوویێك بکات ئەوە ئەوکەسە پەرستوویەتی لەغەیری خوای تعالى کەواتە ئەوە عیبادەتی بۆ کردووە (وكذلك من أعظم أنواع العبادة الدعاء) هەروەها لەگەورەترین جۆرەکانی عیبادەت دوعایە پارانەوەیە نزایە داوا کردنە لەو خوایە (حيث قال الله تعالى :ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ)[1] ئێوە داوا لەخوای پەروەردگارتان بکەن کەدروستی کردوون سەیری بکەن (ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ) بەهەردوو مانای ربوبیەت و الالوهیەت وەکو وتمان ئەگەر بەتەنها هاتن هەردووماناکە ئەگەیەنێ (رب و إله) پێیمان ئەڵێ ئەوەی تۆیی دروست کردوە عیبادەت بۆ ئەو بکە کەواتە کەسێك تۆیی دروست نەکردوە نابێ عیبادەتی بۆ بکەی (قُلۡ أَرَءَيۡتُمۡ شُرَكَآءَكُمُ ٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَرُونِي مَاذَا خَلَقُواْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِ أَمۡ لَهُمۡ شِرۡكٞ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ أَمۡ ءَاتَيۡنَٰهُمۡ كِتَٰبٗا فَهُمۡ عَلَىٰ بَيِّنَتٖ مِّنۡهُۚ)[2] بزانم ئەوانەی لەغەیری خوا چیان دروست کردوە ئادەی ئەوانەی غەیری خوا کە عیبادەتیان بۆ ئەکەن کە سەمع و تاعەیان بۆ ئەکەن یان داوایان لێ ئەکەن بزانم لەئاسمانەکان و زەوی بزانین زەویان لەگەل خوادا دروست کرد بەشداریەتی خۆیان هەیە لەئاسمانەکان وزەوی لەگەل خوادا ! کەواتە إلا ئەبێ خالق بپەرسترێی ئێوە شایستەی پەرستن و بەقسەکردن وإلالتجاء و دوعا و سەمع و تاعە نین ! (ٱدۡعُواْ رَبَّكُمۡ تَضَرُّعٗا وَخُفۡيَةًۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُعۡتَدِينَ)[3] واتا بەملکەچی و بەشاراوەیی خوای گەورە لەسنور لادەری خۆش ناوێی بێت داوا لەغەیری خوا بکات بێت هاوار هاوار بکات

---

[1] :سورة الأعراف اية :٥٥

[2] : سورة فاطر اية : ٤٠

[3] :سورة الأعراف اية :٥٥

و قیژه قیژ بكات ئەوه موعتەده ريا وسومعه بكات ئەوه موعتەده (وأنت بالتجائك إلى غير الله قد دعوت غير الله وهذا شرك. ) تۆ كەخۆت داوەته پالْ غەيرى خوا ئەوه داوات لەغەيرى خوا كردوه ئەوه شيركه

(الصلاة لله والذبح له سبحانه وتعالى)

شێخ (محمدى كورى عبدالوهاب )ئەلێ : (فقل له : فإذا عملت بقول الله تعالى (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ)[1]وأطعت الله ونحرت له ، هل هذا عبادة؟) سەيركه لێرەدا تۆ ئايەت روون ئەكەيتەوه بۆ بەرامبەرت ئەلێ پێ بلێ ئەم ئايەته ئەزانيت كەخواى گەوره فەرموويەتى : نوێژ بكه بۆ خواى پەروەردگارت وەهەورها حەيوانت سەربرى تەنها بۆ ئەو سەرى ببره ، ئەمه دوو عيبادەت بوو (نوێژ و سەربرين) تۆ ئەگەر إطاعەى خواى گەورەت كرد نوێژت كرد وه تۆ حەيوانت سەربريت ئەمه عيبادەته ياخود نا ! (فلا بد أن يقول : نعم) ئەبێت پێت بلێ بەلێ نوێژ وسەربرين عيبادەته (فقل له : فإذا نحرت لمخلوق) ئەى ئەگەر بۆ مەخلوقێك ئەمەت كرد (نبي أو جني أو غيرهما) پێغەمبەرێك يان جنيەك يان غەيرى ئەمان لەمەلائيكه و صالحين (هل أشركت في هذه العبادة غير الله ؟)ئايا غەيرى خوات بەشەداركرد لەم عيبادەتەدا ؟ (فلا بد أن يقر ويقول: نعم. ) تەبعەن ئەبێ إقرار بكات و بلێت بەلێ لەبەر ئەوەى بەشدارى كەسێكم كردوه لەمەدا كەواته تۆ بوويت بەموشريك ، جالێرەدا تۆ سەيريكەن (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ)[2] ئەمرۆ بەخەڵكى بلێ كه ئەلێت (يارسول الله) بلێ وەره نوێژێك بكه بۆ پێغەمبەر ئەلێ بابه نوێژ بۆ خوا ئەكرێت ركوع و سجود بۆ خوا ئەبرێت ئەى بەهەمان شێوه ئەلێت (وَٱنْحَرْ) واتا بۆخوا ئەويش هەر عيبادەته كەواته تۆ چۆن نابێ نوێژ بۆ غەيرى خوا بكەى ئەبێ سەربرينيش بۆ غەيرى خوا نەكەى ئەگينا ئەكەويته شيركەوه وەلەو ئەمرۆ بەداخەوه ئەبينين كه سوجدەش ئەبەن بۆ غەيرى خوا ئەوەش نەماوەتەوه بينومانه بەچاوى خۆمان كه سجده ئەبرێت بۆ غەيرى خوا بۆ بەشەرەكان سوجده ئەبرێت قاچيان ماچ ئەكات

[1] : سورة الكوثر اية :٢

[2] : سورة الكوثر اية :٢

و سوجدەيان بۆ ئەبات ركوع و سوجدەكانيش بۆ بەشەرەكان ئەكرێی يانی جاران ئەوترا كاكە ركوع و سجود چيە ؟! هەر بۆخوايە كەچی ئێستا بۆ بەشەرەكانيش ئەكرێت .

شێخ (صالح) ئەلێ :

(أي لا بد إذا تلوت عليه الآيات والأحاديث بأن الدعاء عبادة لابد أن يعترف)ئەگەر تۆ بۆت باسكرد و ئەو ئايەتانەت بۆ باسكرد ئەو حەديسانەت بۆ خوێندەوە كە دوعا عيبادەتە ئەبێ ئيعتراف بكات (فتقول له) كەمادەم ئيعترافی كرد ئەبێ پێ بلێت (لو دعوت الله في الليل والنهار)تۆ شەو و رۆژ داوا لەخوا بكە (لكنك في بعض الأحيان تدعو غير الله)ئەگەر هات و لەجارێك لەجارەكان لەغەيری خوات داوا كرد (هل تكون مشركا ؟) تۆ ئەبێ بەموشريك يان نا (فلا بد أن يعترف ويقول إنه مشرك)ئەبێ بلێ بەلێ من موشريكم بەوە (لأنه دعا غير الله ومن دعا غير الله فهو مشرك. )لەبەر ئەوەی لەغەيری خوای داوا كردوە ئەوەی لەغەيری خوا داوا بكات ئەوە موشريكە .

(وإذا كان من دعا غير الله ولو مرة واحدة في العمر) جا ئەو كەسەی داوا لەغەيری خوا بكا ئەگەر يەكجاريش بێت لەژيانيدا بەمەرجێك كەوا تەوبە نەكا كە تەوبەی كرد ئەوە خوای گەورە لەهەموو گوناهێك خۆش ئەبێ (يكون مشركا مع أنه يدعو الله في الليل والنهار) موشريكە ئەوە با شەو ورۆژيش ئەو كەسە داوالەخوا بكات يەكجار داوا لەغەيری خوا كرد تەوبەی لەسەر نەكرد لەسەر ئەوە مرد بۆ جەهەنەم بەهەتاهەتايی ئەروات ئەبێ ئاگادار بێ موشريكە (فكيف بالذي يلهج دائما بذلك)ئەی ئەگەر يەكێ بەردەوام ئەمەی لەسەر زار بێ بەبەردەوامی بلێ (يارسول الله ، ياحسين ،عبدالقادری گەيلانی ،،،،)( يا فلان فيصدر منه الشرك كثيرا. ) ئەی ئەگەر كەسێك بەزۆريی ئەمەی لەسەر دەمی بێ ئەوە شيركی زۆری كردوە .

(فإذا كان من ذبح لغير الله أو صلى لغير الله يكون مشركا) ئەو كەسەی بۆ غەيری خوا سەربربڕێت ياخود بۆ غەيری خوا نوێژ بكات ئەگەر موشريك بێ (فكيف بمن يلجأ إلى غير الله في كشف الشدائد ألا يكون مشركا ؟ )كەسێك خۆی بداتە غەيری خوا لەنارەحەتيەكاندا هانا بۆ غەيری خوا ببات نابێ بەموشريك (بلى) بەلێ ئەبێ بەموشريك (لأن الباب واحد)

دەرگاکانی عیبادەت هەمووی یەکە (وأنواع العبادة كلها بابها واحد لا يجوز أن يخلص لله في بعضها ويشرك بالله في البعض الآخر. ) نابێ هەندێکی بۆ خوا بێ وە هەندێکی بۆ غەیری خوا بێ نابێ لەهەندێکی ئیخلاصی عیبادەت بۆ خوا بێ لەهەندێکی بۆ خوای تعالی نەکەی ئێستا بەعام بەعام ئێستا تۆ بەخەڵکی بلێ ڕۆژووی رەمەزان بۆ کێ ئەگرێت هەمووی ئەڵێ بۆ خوا بەعام باشە ئەی بۆچی تۆ کاتێك کە حەیوانێك سەرئەبریت ئەڵێ بۆ مەولودی پێغەمبەرە ﷺ ئاخر ئەوە شیرکت کرد ئەوە بۆ پێغەمبەرت کرد ئەوە شیرکت کرد لێرەدا ئەبێ ئاگاداری شتێك بکەینەوە لەبارەی ئەوەی کەئەڵێن فلان کەس موشریکە تەبعەن بەتەئکید ئەبێ بەموشریك ئەو شەخصە ئەبێ بەموشریك بەبێ هیچ گومانێك هەتا نەشزانێت بەڵام جیاوازی هەیە لەنێوان موشریکێکی موعەزەب وموشریکێکی غەیر موعەزەب شێخ الاسلام ئەفەرمووی : (ئەو کوفرەی کە تەعزیبی لەسەر ئەدرێی ئەوە ئەبێ لەدوای بلوغی ریسالەوە بێ )[1] یانی کەسێك کە بوو بەموشریك کەی عەزاب ئەدرێی کە زانی ئەوە شیرکە ئەگەر نەزانێ ئەوە عەزاب نادرێی بەڵام موشریکە ئاگاداربن ئەی چی لێ ئەکرێت لەدونیادا نە نوێژی لەسەر ئەکرێت نە دوعای بۆ ئەکرێت نە ئەشۆرێت نە ئەخرێتە قەبرستانی موسلمانانەوە نەژنی ئەدرێتی نەسەربراوی دەستی ئەخورێی ئەمە حوکمەکەیەتی لەدوونیادا هەتا ئەگەر نەشزانێت چونکە حوکمی شیرکی لەدونیادا لەسەر جێ بەجێ بوو بەڵام لەقیامەتدا ئەو کەسە تاقی دەکرێتەوە ئەگەر نەیزانی بێت تەبعەن .! بەڵام گەر هاتوو زانیبێت و پێوترابێت لەئەهلی ئاگرە وەکو (عمر کوری لوحی غوزاعی) دەی ئەوە لەئەهلی فیترە نەبوو ! دایك و باوکی پێغەمبەرﷺ لە ئەهلی فیترە نەبوو ! هەردووکیان لەعەزابدان لەبەر چی لەئەهلی ئاگرن بۆ لەعەزابدان ؟! (إن أبى وأباك فى النار)[2] چونکە موشریکێکی موعەزەبە بەوەی کە پێوتراوە وەکو (بن باز) دەڵێ : ئەو کابرایەی دیارە حنفاء پێیان وتوە کەوا شیرکە ئەویش موسیر بوە لەسەر ئەمە ! وەنەبێ نەیزانی بێت کەواتە موشریکمان هەیە موعەزەبە وە موشریکمان هەیە موعەزەب نیە ئینجا لێرەدا نابێ کێشەمان هەبێ لەوەی نابێ پێی بلێن موشریك چونکە زۆرکەس نەزانە ئەڵێ چۆن تۆ کافری ئەکەی ئەوە نوێژ ئەکا یانی ئەمرۆ زۆرشت ئەبیستین

---

[1] : المجلدة الاول

[2] :صحيح مسليم

ئەلیّ کاکە ئەوە عەلمانیە ئەلیّ ئاخر نویّژ ئەکا چۆن تۆپیّ دەلیّت کافر هەمانە حالەتەکەیە وەکو ئەوە وایە بلیّ (یارسول الله) تۆچۆن پیّ ئەلیّت موشریك ئەوە والله نویّژ ئەکات ئاخر بەتالّی کردەوە ئەوە بریتیە لە هەلوەشیّنەرەوەی ئەو ئیمانە ئەبیّ موسلمانان هەلوەشیّنەرەوەکانی ئیمان بخویّنەوە ولیّ شارەزابن و لیّ بترسن نەکەونە ناویی .

## (كيفية عبادة المشركين للملائكة والصالحين واللات وغير ذلك)

شیّخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلیّ : (وقل له أيضا : المشركون الذين نزل فيهم القرآن ، هل كانوا يعبدون الملائكة والصالحين واللات وغير ذلك ؟ ) وە تۆ پیّ بلیّ ئایا ئەو موشریکانەی کەوا قورئانیان لەسەر هاتە خوارەوە (هل كانوا يعبدون الملائكة والصالحين واللات وغير ذلك ؟)ئایا ئەمانە مەلائیکە و صالحین و لات و مەناتیان ئەپەرست یان نا (فلا بد أن يقول : نعم) پیّت ئەلیّ بەلیّ ئەیان پەرست تۆ پیّ بلیّ (فقل له : وهل كانت عبادتهم إياهم إلا في الدعاء والذبح والالتجاء) عیبادەتی ئەوان چی بوو هەر لەدوعا و داوا لیّ کردن و سەربرینی حەیوان لەپەناپیّگرتنی ئەوان بوو (ونحو ذلك . .وإلا فهم مقرون أنهم عبيده وتحت قهره) ئەوان ئەیانزانی و ئیعترافیان بەوە ئەکرد ئەو موشریکانەی زەمانی پیّغەمبەر ﷺ پیّش پیّغەمبەریش ئەیانزانی کەوا ئەوانە عەبدی خوان وە لەژیّر دەسەلاتی خوادان ئەوان عیعترافیان بەخوا ئەکرد وە ئەشیانزانی کەوا خوا خالقە و رازقە مودبیرە خوای تعالی خاوەنیانە (وأن الله هو الذي يدبر الأمر) ئەیانزانی کەوا خوا کارەکانیان بەریّوە ئەبات (ولكن دعوهم والتجؤوا إليهم للجاه والشفاعة) هەمووی ئیشەکەی ئەوان داوایان لیّ ئەکردن لەبەر ئەوەی جاهیان هەبوو وە لەبەر ئەوەی شەفاعەتیان هەبوو وەکو لەشوبهەی یەکەم و دووەم وسیّیەم دا باسمان کرد وەکو وتمان دوونیان کەوا دەیانوت کەوا جاهیان هەیە وەشەفاعەتیش ئەکەن (وهذا ظاهر جدا. ) کەواتە بابزانین ئەبیّ ئیّمە لەقورئان بکۆلینەوە سەیرئەکەین هەتا ئەوان ئیعترافیان بە ئەسماء وصیفاتی خوا کردوە (عزين) کەلیمەی عەزیز هەتا هاتوون ئیعترافیان بەعەرشی خوا کردوە کیّ رەبی عەرەشی گەورەیە وتویانە خوا . ئیمانیان بەعەرشی گەورەش هەبوە ئیمانیان بەوە هەبووە کەخوای تعالی تەنها تەنها خۆیی

ئەیان پارێزی ئەگەر چونە ناوبەحرەوە کەسیتر نایان پارێزی (دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ)[1] ئەوانە عیبادەتیان بۆ خوا کردوە جا من لێرە ئەمەوێت شتێکتان پێ بلێم زۆر گرینگە ئەو شتە ئەویش ئەوەیە ئێوە وا تەسەور مەکەن کەوا (ئەبو جهل و ئەبو لهب) سەرانی کوفری قورەیش کەسانێك بوون کەوا دووژمنی خوا بوون یاخود کەسانێك بوون کەوا قەد عیبادەتیان بۆخوا نەکردوە رۆژێك لەرۆژان خوایان نەناسیوە بۆیە وایان لێهاتووە نەخێر ئەگەر تۆ تەماشایان بکەی قەناعەتم وایە ئەوان لەزۆربەی عەلمانیەکانی ئەمرۆ خوا پەرستربوون تەوافیان کردوە بەدەوری کەعبە ئادەی علمانیەکان تەواف ئەکەن بەدەوری کەعبە إلا ئەوەی کە ئەیکات بەنیفاق ئەیکات وە زۆریان بەلوت بەرزی هەتا ئێستاش تەوافیکێکیان نەکردووە (ئەبو جهل) تەواف ئەکرد ئەی باشە تەواف بۆ ئەکرد ئەیوت خوای بەیت منی دروست کردووە (عبدالمطلب) کە (أبرە) هات وتی چی نەیوت خوای ئەو ماڵە ئەیپارێزی ! ئیمانی بەخوای ئەو ماڵە نەبوو هەتا ئێستا لەو خەڵکە بپرسە ئەوانەی کەوا مەلودیان بۆ ئەخوێنرێتەوە ئەلێن حەزرەتی (عبدالمطلب)! کەلەکاتێکدا موشریك و کافربووە (عبدالله) کەپێغەمبەرﷺ ئەفەرمووی : کە باوکەیتی کە ئەلێ لەئاگردایە ئامینە بەهەمان شێوە ، ئەلێ حەزرەتی (عبدالله و ئامینە) ! یانی خەڵکی تەسەوریان بۆخەڵکی ئاوها بووە وایە یان نا کەواتە ئەوانە عیبادەتیان کردووە بۆ خوای تعالی ئەوانە شیرکیان کردوە لەبەر ئەوە خوای گەورە لێیان خۆش نابێ ئەمرۆش خەڵکانێك ئەبینین کەوا خەڵکانێك کەوا نوێژ ئەکات و رۆژوو ئەگرێی عیبادەت ئەکا بۆ خوای تعالی شیرك ئەکات بەهەمان دەستووری (ئەبو جهل و ئەبو لهب) و جەماعەتەکەی بەهەمان دەستوری (عبدالله )ی باوکی پێغەمبەرﷺ بەهەمان دەستوری (عبدالمطلب و عمری کوری لوحی ) (عمر)خوای دەپەرست بەڵام دەیوت ئەم (لات و منات)ە ئەمە رجایی هەیە لەلای خوا ئێ تۆش فەرقت چیە کەوا بلێ (عبدالقادر) رەجای هەیە لەلای خوا هیچ فەرقت نیە با هەتا ئێواری رۆژوو نوێژوو بکەی بەتاڵ ئەبێتەوە .

شێخ( صالح) ئەلێ :

(أي أن المشركين الأولين ما كان شركهم إلا في هذه الأمور)موشریکەکانی پێشوو لەم بابەتانەدا بوو (وقد نزل القرآن في الإنكار عليهم والأمر بقتالهم وإباحة أموالهم ودمائهم) ئینجا

---

[1] :سورة لقمان اية ٣٢:

تۆ تەماشاکە قورئان ئایەتی ناردە خوارەوە ئینکاری لێکردن ئەمری کرد بە پێغەمبەرﷺ لەناویان بەرێت قیتالیان لەگەلدا بکات ملیان بپەرێنێت هەمووتان ئەزانن جیهاد واجب کرا لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە بەدر و ئەو ئوحد ئەوە خەندەق هەتا دوای غەزوەکانی دوای فەتحی مەککەش ئایا پێغەمبەری خوا ﷺ کاتێك کە ئەوەی کردوە و شمشێری راکێشاوە بەمری خوا نەبووە ! خوای گەورە نەیوتوە !( يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّبِيُّ جَٰهِدِ ٱلۡكُفَّارَ وَٱلۡمُنَٰفِقِينَ وَٱغۡلُظۡ عَلَيۡهِمۡ)[1] ئەمرۆ بەداخەوە جیهاد نەما حەرام کرا ئەورۆ بەداخەوە لێدانی کافرەکان حەرامە چۆن ئەبێ تیرۆرستیە ئەمە بریتیە لە شەرانگێزیەتی بەلاَم لەسەر پارە لەسەر دینار لەسەر نەوت لەسەر هەوای نەفس ملیۆنێك بکوژرێی بەلایانەوە ئاساییە لە حەربی عالەمی چەندێك کوژرا !! گەورەترین فیتنەیان لەسەر ئەرز دروست کرد لەبەر ئارەزووکانی خۆیان کەس نالێ بەری چاوت کلی پێوەیە بەس پێغەمبەری خوا ﷺ بەئەمری خوا ئەفەرمووی (وَقَٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٞ)[2] گەردنیان لێ بکەرەوە هەتا وەکو کوفر و شیرك دروست نەبێ هەتاوەکو شیرك وکوفر دروست نەبێ بۆیە ئەوانە دەکوژرێن و لەناو ئەبردرێن هەتا موسلمان کاتێك لە موسلمانیەتیەکەی هەلئەگەرێتەوە دەسەلاتداری موسلمان نابێت بهلێت إلا ئەبێت تەوبەی داوا لێ بکە ئەگەر نا ئەبێ بکوژرێی وەکو ئەفەرموی (من بدل دينه فقتله)[3] نابێت مورتد بەکەیفی خۆیی بێت و بڕوات کەواتە دین لەسەرووی هەمووشتێکەوەیە (وَكَلِمَةُ ٱللَّهِ هِيَ ٱلۡعُلۡيَاۗ وَٱللَّهُ)[4] ئینجا ئەوان دێن ئەلێن شێخ ئەفەرمووی ئایەت هاتە خوارەوە بۆ قیتالی ئەوکەسانە کە تەواف ئەکرد کەوا مالی خوای خزمەت ئەکرد کە صەدەقاتی ئەکرد کە دەست گیرۆیی لێقەوماوانی ئەکرد بەلاَم ئەیوت (یالات و منات و عوزا) ئەگەر قەناعەتی نەکرد لەملی بدە (ما كانوا مع أصنامهم يعتقدون أنها تخلق وترزق وتحي وتميت) ئایا ئەوان کەی لەگەل پەرستراوەکانیان ئەیانوت لات و منات و عوزا ئەمانە دونیایان دروست کردوە کەی وایان وتووە تەبعەن شوبهەیەك هەیە ئاگاداربن کە صۆفیەکان ئەیهێنن هەمان قسە ئەکەن ئەلێن با ئەوانە وتویانە ئەوانە خوای ئێمەن ئەمانە ئێمەیان دروست

[1] :سورة التوبة اية :٧٣

[2] : سورة الأنفال اية :٣٩

[3] :صحصح البخاري

[4] : سورة التوبة اية :٤٠

كردوه ئەمەش پێیان ئەلێن درۆ ئەكەن (قُلۡ هَاتُواْ بُرۡهَٰنَكُمۡ إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ)[1] وەرە كوا قورئان وا دەلێت قورئان دەفەرمووێت (وَلَئِن سَأَلۡتَهُم مَّنۡ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضَ لَيَقُولُنَّ ٱللَّهُۚ)[2] دەلێن خوا نالێن لات و منات و عوزا ! ئەلێن (الله) دروستی كردوه تۆ درۆ ئەكەی وا ئەلێت ئەوە بۆچوونی خۆتە ئەوە شەیتان سەری لێ تێكداوی (وما كانوا يدعونها إلا من أجل الشفاعة) كەواتە دوعاكان بەس لەبەر شەفاعەت بوو (فكذلك عباد القبور اليوم يدعون الأضرحة والأولياء والصالحين ولا يعتقدون فيهم أنهم يخلقون ويرزقون ، وأنهم خلقوا السماوات والأرض) شێخ (فوزان) ئەلێ: ئەوانەی قەبر ئەپەرستن تەبعەن تۆ قەبر بپەرستی كافری بۆیە پێیان ئەلێ ئەوانەی كە قەبر ئەپەرستن ئەمرۆ داوا لەو قەبرانە ئەكەن داوا لەو پیاوچاكانە ئەكەن داوای شەفاعەت ئەكەن إعتیقادیان نیە كە ئەمانە هەریەك لەمانە ئەرز و ئاسمانیان دروست كردوە یاخود رزقی خەڵكی ئەدەن شتی وانیە (وإنما اتخذوهم لقضاء الحاجات ، والتوسل بهم إلى الله ليشفعوا لهم ويقربوهم إليه زلفى ، والالتجاء إليهم في كشف الكرب والشدائد. )بۆیە شێخ بە موشریك ناویان ئەبات بە عیبادەتكاری قەبرەكان ناویان ئەبات ئەلێ ئەم جۆرە كەسانە موشریكن وە ئەبێ ئاگایان لەخۆیان بێ لەخوا زیاتر داوا لەكەسیتر نەكەن .

## (الفرق بين الشفاعة الشرعية والشركية)

شوبهەی پێنجەم :

شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب )ئەلێ : (فإن قال : أتنكر شفاعة رسول الله ﷺ وتتبرأ منها ؟ فقل : لا أنكرها ولا أتبرأمنها بل هو رسول الله ﷺ الشافع والمشفع وأرجو شفاعته ، ولكن الشفاعة كلها لله تعالى كما قال تعالى: قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا)[3] واتە : شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب ) ئەلێ : ئەگەر وتی تۆ شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ ئینكاری ئەكەی و خۆتی لێ بەریئ دەكەی تەبعەن ئەمەیەكێكە لەگەورەترین شوبوهاتی موشریكین ئەهلی شیرك و

[1] : سورة النمال اية :٦٤

[2] : سورة الزمر اية : ٣٨

[3]:سورة الزمر اية : ٤٤

ضلالەت لەهەموو كاتێكدا بەزۆری لەسەر دەعوەی گەرانەوە بۆ لای سەلەف ئومەت كە پێ ئەوترێی (الدعوة السلفية) واتا گەرانەوە بۆ كیتاب و سونەت بە فهمی سەحابە و تابعین .
هەركەسێ هەرگری ئەم دەعوە و بانگەوازەبێ موشریكەكان لەصۆفی و دەورێشەكان راستەوخۆ پێیان ئەلێن ئێوە رقتان لەپێغەمبەرە ﷺ ئێوە ئینكاری ئینكاری شەفاعەت ئەكەن ! ئێوە خۆتانی لێ بەریئ ئەكەن ! جا ئەم شوبهەیە زۆر گەورەیە ئاگادار بن ئەم شوبهەیە پەیوەستە بەداواكردن لەپێغەمبەرەوەﷺ وە ناهابردن بۆی وە داوا شەفاعەت لەو ! كە ئەمە یەكێكە لەگەورەترین ئێشەكانی ئەوان و ئەوان كاتێك كە رەخنە ئەگرن لەهەركەسێكی موحید و یەكخوا پەرست ئالەم شوبوهەیەوە بۆی دێن ! پێیان ئەلێن ئێوە ئینكاری شەفاعەتی پێغەمبەر دەكەن ﷺ! ئێوە پێغەمبەرتان خۆش ناوێی وادەلێن ﷺ بەدەلیلی ئەوەی ئینكاری شەفاعەتەكەی ئەكەن
تەبعەن ئەمە لەهەموو كاتێكدا دژی هەلگرانی دەعوەی یەكخوا پەرستی بۆتەوە بەتایبەتی شێخ(محمدی كوری عبدالوهاب) تۆ لەهەركەسێكەوە گوێت لێ بێت لەهەرشوێنێكی ئەم جیهانە ئەوەی كە ئەهلی شیرك وضلالەت بێ لەگەل باسی كە (محمدی كوری عبدالوهابی) بكەوێتە بەر گوێی ئەلێن ئەوە ئینكاری شەفاعەت ئەكا ﷺ ئەم شوبهەیە بزانین چۆن بەتاڵی ئەكەینەوە ئەمە بزانن ئەمە زۆر گرینگە !
شێخ ئەلێت (فإن قال : أتنكر شفاعة رسول الله ﷺ وتبرأ منها ؟) ئەگەرپێت وترا كابرا پێی وتی تۆ ئینكاری شەفاعەت ئەكەی چونكە تۆ نالێت (یارسول الله) هاوار شەفاعەت ! ئەمە بەشیرك ئەزانی ئەویش راستەوخۆ بەتۆ ئەلێ رقت لەپێغەمبەرەﷺ ئەلێ شەفاعەتی نەدراوەتێ ! ئینكاری شەفاعەت ئەكەی ! دێت راستی ئەكاتەوە (فقل : لا أنكرها) یەكەمجار پێت ئەلێ چۆن تۆ رەدی ئەم شوبهەیە بدەیتەوە بلێ نەخێر من ئینكاری ئەم شتە ناكەم ، (ولا أتبرأمنها) نەخێر ئینكاری ئەوە ناكەم (بل هو رسول الله ﷺ الشافع والمشفع) بەڵكو پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ شەفاعەت ئەكا وە خوا شەفاعەتەكەشی قبول ئەكا ! (وأرجو شفاعته) وە منیش یەكێكم لەوانەی كەوا شەفاعەتی داوا ئەكەم ! یانی لەكێ ئاگادار بە لەخوای تعالی ، شەفاعەتەكەی لەخوای تعالی داوا ئەكەم ! (ولكن الشفاعة كلها لله تعالى) بەلأم ئەوە بزانە ئەی كەسی موشریك ئەی كەسی هاوبەش پەیداكار ئەی ئەوەی كەسی

کەبچی لەخوا داواکەی ئەچی لەپێغەمبەر داوا ئەکەی ﷺ بەمە بویت بەموشریك ئەو شەفاعەتە هی خودی پێغەمبەر نیە ﷺ بەڵکو خودا پێداوە ! خودا خاوەنی ئەو شەفاعەتەیە نەك پێغەمبەر ﷺ پێغەمبەر پێی بەخشێنراوە ﷺ (كما قال تعالى: قُل لِّلَّهِ ٱلشَّفَٰعَةُ جَمِيعًا)[1] وەکو خۆی ئەفەرموویێ : تۆ بلێ شەفاعەت هەمووی هی خوایە مولکی هیچ کەس نییە !. کەواتە کەشتێك مولکی خوای تعالی بوو هەر لەخوا داوا ئەکرێی . (ولا تكون إلا من بعد إذن الله) ئەبێ ئەوەش بزانی ئەمە لەدوای ئیزنی خوا نەبێ پێغەمبەریش ناتوانی ﷺ شەفاعەت بۆ کەس بکا ئەبێ خوا ئیزنی بداتێ وەکو خۆی ئەفەرموویێ (كما قال تعالى: مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ)[2] کێ شەفاعەت ئەکا لەلای خوا إلا ئەوە نەبێ کەخوای تعالی ئیزنی داوە إلا ئەوە نەبێ کە خوای گەورە ئیزنی داوە واتا بەبێ ئیزنی خوا نابێ کەمادەم بەئیزنی ئەویش بوو با ئێمە لەخۆی داوا بکەین (ولا يشفع النبي ﷺ في أحد إلا بعد أن يأذن الله فيه) پێغەمبەری خوا ﷺ شەفاعەت بۆ هیچ کەسێك ناکا إلا ئەبێت خوا ئیزن بدات خوای گەورە ئیزنی بداتێ بلێت شەفاعەتی بۆ بکە، (كما قال تعالى: وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ)[3] دوو مەرج لەم ئایەتەدا بەدی ئەکەین !

*یەکەمیان : (وَلَا يَشۡفَعُونَ) واتا بەهیچ شێوەیەك شەفاعەت ناکەم إلا بەئیزنی خوای تعالی نەبێ

*دووەمیان: (إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ) إلا بۆ ئەو کەسەش کە خوای گەورە لێ رازییە

کەواتە بەم دوو مەرجە ئەبێ خوا ئیزن بدا وە دەبێ خوای گەورەش رازی بێ کە شەفاعەتەکەی بۆ بکرێی (وهو سبحانه لا يرضى إلا التوحيد) خوای تعالی پاکی بۆ ئەو لەهەموو شیرك و زولمێك ئەو رازی نابێ إلا بە یەکخوا پەرستی نەبێ هەرکەسێك یەکخوا پەرست نەبێ ناهێلێت پێغەمبەرەکەی شەفاعەتی بۆ بکا ﷺ (كما قال تعالى : وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينًا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ)[4] ئەم ئایەتە زۆر گەورەیە لە ال عمران ئەبێ وریابین ئەم ئایەتە تعریفی ئەوەمان بۆ ئەکات کەوا ئەگەر بێت و هەرکەسێك ئیسلام نەکا بەدینی خۆی و پێی

[1] : سورة الزمر اية : ٤٤
[2]: سورة البقرة اية :٢٥٥
[3]: سورة الأنبياء آية : ٢٨
[4]: سورة ال عمران اية : ٨٥

ڕازی نەبیٚ و لەسەری نەڕوا بەرائەت نەكا لەغەیری ئیسلام بەهیچ شێوەیەك هیچ شتێكی لیٚ قبول ناكرێی ، هەر ڕێباز و ڕێچكە و هەر ڕێگەیەكی تر كار بكا ! (وَمَن يَبۡتَغِ) یانی (ومن یطلوب) ئەوەی داوا بكا ئەوەی بیەوێی (غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا) لەغەیری ئیسلام دینێكی تر هەلبژێرێی ڕێچكە و ڕێبازێكی تر هەلبژێرێی (فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ) خوا لیٚ قبول ناكا با تەعریفی ئیسلام بكەینەوە خۆشەویستانم (هو الاستسلام لله بالتوحيد والانقياد له بالطاعة والبراءة من الشرك وأهله) هەركەسێك ئەگەر بێتوو كە دینی ئیسلام كە ئەكا بەدینی خۆی ئەبیٚ ئەوە بزانیٚ تەنها خوا بە پەرستراو بزانیٚ تەنها خوا بەدروستكار بزانیٚ تەنها خوا بە خاوەنی ئەو ئەسماء صیفەتانە بزانی كەهەیەتی و كەسی تێدا بەشدار نەكات ، واتا نابیٚ شەیرك لە الالوهیەت الربوبیەت وە الاسماء صیفات بكا . ئەوەیە (الاستسلام لله بالتوحيد) دوای (والانقياد له بالطاعة) ئەبیٚ ملكەچ بیٚ بۆ هەموو فەرمانەكانی نابیٚ تەكبوركا لەفەرمانەكانی خوا تەكبوری كرد لەیەك لەفەرمانەكانی خوای تعالی وەكو شەیتان چۆن تەكەبوری كرد لەسجدبردن كافر ئەبیٚ پەنا بەخوا !، پاشان ئەلیٚ مەرجی سێیەم كە موسلمانی تێدا قبول ئەكرێی لەو كەسە هەبیٚ ئەبیٚ برائەت بكا لە شیرك و ئەهلی شیرك ئەگەر بلیٚ من عیلاقەم نیە بەرێبازەكانی تر و بەكافركردن و عیلاقەی بەكافركردنم نیە ! ئەوە ئەو كەسە موسلمان نیە !. چونكە ئەوكەسە بەرائەتی نەكردوە لەشیرك و موشركین ئەبیٚ بەرائەت بكات ، ئینجا ئەم دینی ئیسلامی ئێمە بەداخەوە خەڵك تێی نەگەیشتوە ئەگەر تێی بگایشتایە چۆن موسلمان ئەبیٚ ئەبیٚ بەعلمانی چۆن موسلمان ئەبیٚ ئەبیٚ بەصۆفی و دەورێش چۆن موسلمان ئەبیٚ ئەبیٚ بە لیبرالی ئەبیٚ بەقومی بە ئەمیركی و ئەورووپی ئەبیٚ بەجنی و ئینسی ئەبیٚ بە شەمسی و قەمەری ئەبیٚ بەهەرشتێكی تر غەیری خوا (من دون الله) خوای تعالی لە غەیری خۆی هیچ شتێكی تر قبول ناكا هەر ناوێكی تر هەر ڕێبازێكی تر لەغەیری دینی خوای تعالی ەوە بیٚ خوای تعالی قبولی ناكا ئەوە ئایەتەكەیە (وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا) دێن لەو خەلكە ئەپرسین ئادەی بزانین ڕێبازی ژیانت چیە ئیسلامە یان ئیسلام نیە ؟! ئەگەر ئیسلام بوو الحمدلله . ئەگەر ئیسلامیش نەبوو وەلا كاكە تۆ لەسەر شیرك وضلالەت ئەرۆیی خۆ ئەگەر تێكەلاوی بكەی ئەوە موشریكی ! هاوبەشت پەیا كردوە بۆ دینەكەی خوای تعالی . كەواتە خوای تعالی تەنها كەسی موحیدی پیٚ ڕاستە وە سروشتی ئینسان وایە كەسێك نیە

معصوم بێ له هەله وحال ئەکەوێته گوناهەوه ئەو شەفاعەتەی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەهلی کبائیر و ئەهلی گونهباره وگوناهکاره ، نەك بۆ ئەهلی شیرك و کوفر ئاگاداری ئەم خاله به (فإذا كانت الشفاعة كلها لله) ئەگەر شەفاعەت هەمووی بۆ خوا بێ واتا خوا خۆی خاوەنەکەی بێ مولکی شەفاعەت هی خوای تعالی یه (ولا تكون إلا من بعد إذنه)ئەوەش بەبێ ئیزنی ئەو نابێ (ولا يشفع النبي ﷺ ولا غيره في أحد حتى يأذن الله فيه) نەپێغەمبەرﷺ نه غەیری پێغەمبەریش بەهیچ شێوەیەك شەفاعەت ناکەن بۆ کەسێك إلا ئەبێ خوا ئیزن بات (ولا يأذن الله إلا لأهل التوحيد) وه ئیزنیش نادا خوای گەوره إلا بۆ کەسانێك یەکخوا پەرستبن شیرکیان پەیا نەکردبێ (تبين لك أن الشفاعة كلها لله) ئەوه بۆت بەیان بوو بۆت ڕۆشەن بوو کەوا شەفاعەت هەمووی هی خوایه و مولکی ئەوه (وأطلبها منه) کەواته لەوی داوا بکه لەخوا داوا بکه بلێ خوایه شەفاعەتی پێغەمبەرەکەتم ﷺ پێ ڕەوا ببینی پێببەخشی خوایه پێغەمبەرەکەت بکەی به شەفیعم ﷺ (فأقول : اللهم لا تحرمني شفاعته) خوایه بێ بەشم نەکەی لەشەفاعەتی پێغەمبەرﷺ (اللهم شفعه في) خوایه بیکەی بەتکاکارم خوایه بیکەی بەشەفیعم (وأمثال هذا) وینەی ئەمانه بەم جۆره داوایانه ، نەك بلێ (یارسول الله ) هاوار بۆتۆ دخیلك و شەفاعەت بۆتۆ و ئەمجۆره بابەتانه ئەوجۆره شەفاعەته لەو داوا ناکرێت .

ئەم گومان و ئەم شوبهەیه ئەم چەواشەکارییه تەبعەن کەشفی شبهات بکەین بەکوردی واتا بەدیار خستن و پەردەلادان لەسەر چەواشەکارییەکان شبوهات چەواشەکارییه ئەو چەواشەکارییه که ئەهلی شیرك وضلالەت ئەهێنه دەستی موسلمانان لەوانه کەوا باسمان کرد ئەلێن ئێمه بۆیه لەوان داوا ئەکەین چونکه جاهیان هەیه ! چونکه قەدریان هەیه یاخود ئەلێن ئەوانه شەفاعەتیان دراوەتێی یان ئەلێن ئێمه خۆ وەك بتپەرستان خۆ دار و بەرد ناپەرستین هەتا ئێوه ئەو ئایەتی شیرکانه لەسەر ئێمه تطبيق بکەن ئەمانه هەمووی بریتیه له چەواشەکاریی ، ئینجا ئێمه دێن بۆیان باس ئەکەین یەکه بەیەکه ئەو شوبوهاتانەیان بۆیان هەلدەوەشێنینەوه یەك بەیەك بەدەرخستنی ئەم چەواشاکارییانه شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ڕەحمەتی خوای لێ بی لەم پەراوه بەنرخ و بەهایەدا شبوهاتەکانی ئەوان هەمووی هەلدەوشێنێتەوه ئەلێ ئەم شوبهەیەی کەئێستا باسمان کرد پەیوەسته به کەوا ئەوان داوا له پێغەمبەر دەکەن ﷺ (إستغاثة) دوعای پێغەمبەرﷺ دەکەن (إستغاثة) و دوعا

ئەمە هەردووكی عیبادەتە ئەمە بۆخوا نەبێ بۆ كەس نابێ پاشان لەسەر ئەم دەعوەیی شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) وەكو وتمان لەسەر دەعوەی سەلەف لەسەر هەردەعوەیەك كە بگەڕێنێتەوە بۆ كیتاب و سوننە بۆ ئیسلامی ڕاستەقینە كاتێك كە ئەبینین هەلگرانی ئەم بانگەوازە نالێن (یا رسول الله) هاوارە رأسەن پێیان ئەلێن ئێوە رقتان لەپێغەمبەرە ﷺ ئەمە گرینگترین شوبهەیە كە لەناو كیتابەكەدا وەرەد دانەوەكەشی بەو شێوەیەیی كە ئێستا شێخ رەدی دایەوە بینیتان دێنە سەر شەرحی (صالح فوزان):

ئەلێ : (شفاعة النبي ﷺ لا ينكرها إلا أهل الباطل) سەیركە ئسلوبی رەد دانەوەكە رأسەن ئێمەش پێیان ئەلێن نەخێر ئێمە شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ ئینكار ناكەین كێ ئینكاری ئەكا ئەهلی باطل كێن ئەوانە ؟ (والفرق الضالة كالخوارج والمعتزلة) بۆچی خەواریج و موعتەزیلە دێن شەفاعەتی پێغەمبەر ئینكاری لێ ئەكەن ﷺ ؟ لەبەر ئەوەی ئیعتقادی ئەوان وایە هەركەسێك گوناهەیەكی كرد ئەو كەسە كافرە كە كافریش بێ ئەوان ئەلێن شەفاعەتی پێغەمبەر بۆ كافر نیە ﷺ كەواتە بەتەواوی شەفاعەت نەما !. ئینكاری كرا ! ! كەواتە یەك لەعقائیدەكانی خەواریج و موعتەزیلە ئەوەیە كەوا بروایان بە شەفاعەت نیە لەبەر ئەوەی ئەوان ئەلێن هەر كەس كەوتە ناو گوناهی كەبیرەوە ئەو گوناهە گەورانە كافری ئەكا كە كافریش بوو شەفاعەت بۆ كافر هەیە ! نەخێر ئێمەش ئەلێن نەخێر بەنیسبەت گوناهە گەورەكانەوە ئینسانی پێ كافر نابێ ئەگەر حەلالی نەكا ! ئەما ئەگەر حەلالی كرد ئەوە كافر ئەبێ ئەوە چوە ناو جوملەی كافرەكانەوە بەس ئەگەر حەلالی نەكرد بۆ نمونە كەوتە زیناوە كەوتە دزییەوە كەوتە درۆكردنەوە كەوتە هەركەیەكێك لە گوناهە گەورەكانەوە ئەشیزانی كە ئەمە حەرامە ئەوە ئەو كەسە كافر نابێ وە ئەم جۆرە كەسانە لەگەل ئیمان و توحیدەكەیاندا ئەگەر ئەعمالی صالیحەیان زۆر بوو یاخود ئەگەر هاتوو ئەم گوناهانەیان ئەوەندە زۆر بوو زیاتر بوو لە رۆژی قیامەت لەچاكەكانیان موجیبی ئەوەن كەوا بچنە ناو ئاگری دۆزەخەوە خوای گەورە بیان سوتێنی ئالێرە شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ بۆیان ئەبێ كەنەچنە ناو ئاگرەوە یان ئەگەر چووشن بینە دەرەوە زوو بێنە دەرەوە . ئەمە بنیسبەت ئعتقادی ئەهلی سوننە وجماعە كەوا بیروباوەریان وایە كەوا ئینسان بەگوناهی كبیرەوە كافر نابێ مادەم بەحەلالی نەزانێ ، بەلكو بەكافر بوون كافر ئەبێ نەك بەگوناهی گەورە ! جا

لێرەدا ئەبێ ئەو جیاوازییە بكەین ئاگادار بە لەنێوان خەواریج و موعتەزیلە لەگەل ئەهلی سوننە و جەماعە ، زۆر جار موحید و یەكخوا پەرست كە ڕێگەی قورئانی پیرۆزیی گرتوە لەكافر كردنی كافران و لەوەی كەوا بەكافر ئەلێ كافر دێن كەسانی تر ئەلێن ئێوەش خەواریجن چونكە خەلك كافر ئەكەن . ئایا كافر كردن خۆی ئا بەو مطلقیەوە ئەخاتە ناو مەنهەجی خەواریج و موعنەزیلەوە ؟ نەخێر و هەزار جار نەخێر . بەڵكو بە پێچەوانەوە كافر كردن دوو بەشە:

١:كافر كردن بە حەق .

٢: كافركردن بەناحەق .

ئەوەی كە بكەوێتە كوفرەوە ئەوەی كەبكەوێتە شیرك وضلالەتەوە ئەوەی كە بكەوێتە ئەوشتەی كە ئینسانی پێ كافر ئەبێ كافر ئەبێ ئەبێ كافری بكەی كافری نەكەی خۆت پێی كافر ئەبێ . بەمەرجێك ئەوكوفرانە لە كوفرە ظاهیرەكانبن ئەما ئەگەر كوفری خەفی بوو بۆی بەیان ئەكەی ئەگەر دوای ئەوەی بۆت بەیان كرد ئەوكاتە كافر ئەبێ بەس كوفرە ظاهیریەكان كابری پێی كافر ئەبێ بۆنمونە كابرا جوێن بدا بە پێغەمبەر ﷺ بۆنمونە كابرا هاواركاتە پێغەمبەری خوا ﷺ (إستغاثة) بەغەیری خوای تعالی شیرك وضلالەت پیادە بكات ئەمجۆرە كەسانە ئەكەونە ناو كوفرەوە پێی كافر ئەبێ ئەبێ تۆ كافری كەی ، سەرجەم ئایەتەكانی قورئان ئەوها باسی كافركردنیان كردوە كەواتە ڕەددانەوەی ئەمە چۆن ئەدەینەوە ؟ ئەلێن شەفاعەتی پێغەمبەرﷺ ئینكاری ناكا إلا ئەهلی باطل نەبێ لەخواریج ولە موعتە زیلە خۆ ئێمە خواریج و موعتەزیلە نین ، (أما أهل السنة والجماعة فإن من أصول عقيدتهم الإقرار بشفاعة النبي ﷺ وشفاعة الأولياء والصالحين) ئایا ئێمە لەبابی ئیعتقادا ئیمانمان چۆنە بەشەفاعەت ؟ ئەلێن ئێمە ئیمانمان بە شەفاعەت هەیە كە خوای گەورە بەخشیویەتی بە پێغەمبەر ﷺ بەلام هەتا خوا ڕازی نەبێ وەهەتا خوای تعالی ئیزنی نەدا وە خوا ڕازی بێت لەو كەسەی كە شەفاعەتی بۆ ئەكرێی خوا ئیزن با بەو كەسەی كە شەفاعەتەكە ئەكا ئینجا ئەو شەفاعەتە دەوری خۆی ئەبینی (ولكنها لا تطلب منهم وهم أموات) بەلاٌم ئایە كە شەفاعەت دراوە بە پێغەمبەرﷺ بە ئەولیا و لەصالحین ئایا كاتێك ئەوان مردوون ئێمە لێیان داوا بكەین ؟ ئەلێن نەخێر . (وإنما تطلب من الله) باسی داوا

كردنەكەی ئەكەین نەك باسی ئەصلەكەی ئەصلی شەفاعەتەكە داوا ناكرێی لەوان (لأن أحدا لا يشفع عند الله إلا من بعد إذنه) لەبەر ئەوەی هیچ كەسێك شەفاعەت ناكا لەلای خوا إلا لەدوای ئیزنی خوا نەبێ (ولا بد أن يكون المشفوع فيه ممن يرضى الله عنه من أهل التوحيد) ئەو كەسەشی شەفاعەتەكەی بۆ ئەكرێی ئەبێ خوا لیٚ رازی بێت و لەئەهلی توحيد بێت ئەبێ خوای پەرستبێت بەتەنها شیركی پەیا نەكردبێ (والنبي ﷺ وهو أعظم الشفعاء يوم القيامة إذا تقدم له أهل المحشر وطلبوا منه أن يشفع لهم عند الله في فصل القضاء بينهم ، فإنه لا يشفع ابتداء) ئاگادار بە هەتا رۆژی قیامەت پێغەمبەر ﷺ كەكاتێك خەڵكی زیندوو ئەبنەوە لە مەعشەردا كاتێك كەئەچن بۆلای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای شەفاعەتی لیٚ بكەن ئایا ئەو شەفاعەتە كەكاتێك داوای لیٚ ئەكرێی بۆ ئەوەی خوای تعالى بۆئەوەی حوكم بكا لەنێوان عەبدەكانیدا وە موحاسەبە دابنێی ئایا ئەتوانیٚ یەكەمجار شەفاعەت بكا كاتێك كە خەلكی ئەچن داوای لیٚ ئەكەن تەبعەن ئەبیٚ ئاگاداری ئەم خالە بین ؟ ئەوان ئەچن لەوكاتەدا داوا لەكیٚ ئەكەن لەزیندوویەك ئەكەن ؟! ئەمە دروستە ئەمە یەكەم .

دووەم :ئایا پێغەمبەر ﷺ یەكسەر كارەكە جیٚ بەجیٚ ئەكا یاخود ئەچیٚ سەجدەیەك ئەبات و داوا لەخوا ئەكات و خوا كەلیماتێكی فێرئەكا دوای ئەو كەلیماتە ئەلێت خوای گەورە پێی ئەفەرمووێی سەربەرزكەرەوە من شەفاعەتی تۆ قبول ئەكەم یان نا ؟ ئەو كاتە لەدوای ئەوەیە كە خوای گەورە قبولی ئەكا كەواتە ئێستا حالین ئەوشتە نەهاتووە دوو رێگر هەیە :

*یەكەمیان : ئەو مردوە ئاگای لەئێمە نیە .

*دووەمیان : ئەوە رۆژی قیامەتە كە ئەو شەفاعەتەكە ئەكات خۆ ئێستا ئەو ئەو كەلیماتانە فێرنەكراوە .

(وإنما يستأذن ربه)یانی داوای ئیزن لەخوا ئەكا جل وعلى (ويطلب منه أن يأذن له بالشفاعة فيخر ساجدا بين يدي ربه ويدعوه ويتضرع إليه) داوای لیٚ ئەكا لەخوای رب العزه وەسوجدەی بۆ ئەبا لەسجدەكەیدا (ويستمر حتى يقال له) بەردەوام لەو سجدە و لەو داواكاریە تا خوای گەورە كەلیماتی فێرئەكا هەتاوەكو ئەو ئەو شەفاعەتەی ببێت و پێی ببەخشێت ئینجا پیٚ ئەلێت (يا محمد ارفع رأسك ، وسل تعطه ، واشفع تشفع)[1] (يا محمد

[1]: البخاري التوحيد( ٧٠٧٢ )

ارفع رأسك)ئەی محمد ﷺ سەر بەرزکەرەوە (وسل تعطه) چی داوا ئەکەی ئەتدرێتی (،
واشفع تشفع) تکا بکە تکاکەت قبول ئەکرێی .

(ولكن كيف تطلب الشفاعة ؟) بەلأم بابزانین چۆن طلب ئەکرێی ئەو شەفاعەتە؟(الشفاعة تطلب من الله) لەخوای تعالی داوای شەفاعەت ئەکەین (ولا تطلب من المخلوق) لەمەخلوق داوا ناکرێت (فتقول) ئابەم شێوەیە داوا ئەکەی : (اللهم لا تحرمني شفاعة نبيك) ئەپارێتەوە ئەلێ خوایە شەفاعەتی پێغەمبەرم ﷺ بێ بەشم مەکە لەو شەفاعەتە ،( اللهم شفعه في) خوایە بیکەی بەتکاکار بۆمن (وأمثال هذا) بە وێنەی ئەو کەلیماتانە کەواتە ئەصلی داواکە لەخوا ئەکرێت (والنبي ﷺ بعد موته لا يطلب منه شيء لا شفاعة ولا غيرها) پێغەمبەرﷺ لەدوای مردنی هیچ شتێکی لێ داوا ناکرێت نە شەفاعەت نە غەیری شەفاعەت ، (لأن طلب الأشياء من الأموات شرك أكبر) لەبەر ئەوەی داوا کردنی هەرشتێك لەمردوو شیرکی گەورەیە نابێ لەمردوان داوا بکرێت کەواتە ئەوکەسەی دەسەلاتی نەبێ داوای لێ ناکرێت بەلأم ئایا لەزیندووان‌دا داواکردنی شتێك کە لەتوانایاندا هەبێت ئەکرێت یان نا ؟ بەلێ ئەکرێت ، کەواتە با ئەمەش تێکەل نەکەین ئەم چەواشەکارییە ئەوە نیە پێغەمبەر ﷺ خەڵکی لەژیانیدا داوایان لێ کردوە فەرقی نیە ژیان و مردنی وەکو یەك وایە ! ئەمە چەواشەکارییەکەیە ئەلێن لەژیانی بەلی گوێی لێ بووە لەدوعای ئەم خەڵکە بەلێ ئەو دوعای بۆکردوون داواشی لەخوا کردوە جل وعلی وە یان قبولی کردوە یان نا دوعامان هەیە پێغەمبەرکردوەیەتی ﷺ لەحالی حەیاتیدا خوای گەورە لێ قبول نەکردوە ! وتویەتی خوایە با ئومەتەکەم با بەش بەش نەبێ لێ قبول نەکرد ! کەواتە هەموو دوعایەك ئەبێ إلا خوا قبولی بکا ئەگەر قبولی نەکا هەر مەرج کردنەکەی نیە .

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب ) ئنیجا ئەلێت :(**فإن قال : النبي ﷺ أعطي الشفاعة وأنا أطلبه مما أعطاه الله تعالى.** ).

ئەگەر بەتۆ بلێ من سەیری پێغەمبەر کەی ﷺ کەوا ئەو شەفاعەتی دراوەتێ من ئەو شەفاعەتە لەو داوا ئەکەم لەوشتەی کە خوا پێی بەخشیوە ، کەواتە ئەو دەلێت مادەم خوا

پێى بەخشيوە ئەمە شوبهەكەيە ئەمە چەواشەكارييەكەيە ئەلێ مادەم خوا پێى بەخشيوە تواناى ئەوەهەيە بيدات كەواتە من لەوى داوا ئەكەم .

(فالجواب : أن الله أعطاه الشفاعة) بەلى ڕاستە خواى تعالى شەفاعەتى داوەتێ بەلاّم (ونهاك عن هذا) نەهى لەتۆ كردوە كە تۆ داوا لەو بكەى (فقال تعالى : ﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾[1] سەيركە پێت ئەلێ داواى هيچ شتێك مەكە لەگەل خواى تعالى يانى لەغەيرى خوا داوا لەكەسيتر مەكە ﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾ لەگەل خوادا داوا لەكەسيتر مەكە بەس داوا لەخوا بكە وەكو وتمان (﴿لا تَدۡعُواْ﴾) دائمەن ئاگاداربنماناى (لا تسأل وبمعنا لا تعبود) داوا مەكە عيبادەت مەكە لەگەل خوادا كەسيتر مەپەرستە لەگەل خوادا داواى كەسيتر مەكە هەر بلێ (يا الله) كافيە و بەستە (فإذا كنت تدعو الله أن يشفع نبيه فيك) ئەگەر داوا بكەى لەخواى تعالى كە پێغەمبەرەكەى بكا بە شەفاعەت كارى تۆ ﷺ (فأطعه في قوله: ﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾)[2] ئەوە تۆ تەماشاكە لێرە ئەو شەفاعەتەى كە خواى گەورە پێى بەخشيوە قەناعەتت بەوە هەيە ئەبێ قەناعەتيشت بەوە هەبێ كە خواى گەورە بەتۆيى وتوە كە داوا مەكە لەغەيرى خوا ! دەى ئەوەش جێ بەجێ بكە (﴿فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا﴾) (وأيضا فإن الشفاعة أعطيها غير النبي ﷺ ) سەيركە يەكێكى تر لەڕەدەكان چۆن ڕەدى ئەو جۆرەكەسانە ئەدەينەوە ئەلێن ئايا شەفاعەت هەر بەپێغەمبەر دراوە ﷺ ؟ نەخێر ، تەبعەن بە پێغەمبەر و بەغەيرى پێغەمبەريش دراوە ﷺ (غير النبي ﷺ فصح أن الملائكة يشفعون ، والأفراط يشفعون ، والأولياء يشفعون) هاتوە بەصەحيحى كە مەلائيكە تكا ئەكات وە هەروەها ئەولياكان دۆستانى خوا ئەوانەى موتەقين ئەوانەى عيبادەتێكى جوان و زۆريان بۆخواى تعالى كردوە قسەيان وەر ئەگرێى شەفاعەتيان وەرئەگرێى كەخۆيى پێى بەخشيون وەهەروەها (والأفراط يشفعون)[3] مندالانيش تاكا ئەكەن بۆيە كاتێك كە منداڵێك ئەمرێى لەسوننەتدا لەدوعاى نوێژى جەنازەكە كە نوێژمان لەسەر كرد ئەلێن خوايە بيكە بە فراط بۆ دايك و باوكى يانى پێشى بخە ببێتە خێرێكى پێش خراو بۆ دايك و باوكى وە شەفاعەتى بۆ بكە ، (أتقول : إن الله

---

[1]: سورة الجن اية : ١٨
[2]:سورة الجن اية : ١٨
[3]: جمعى فراط ئەو منداڵەيە كە ئەمرێت هى موسلمانان وە كاتێك مرد شەفاعەت بۆ دايك و باوكى ئەكات

أعطاهم الشفاعة وأطلبها منهم) پرسیارێکت لێ ئەکەین ئایا تۆ ئەڵێت وەلا ئەو منداڵە شەفاعەتی دراوەتی ئێستا لەو منداڵە ئەکەم !؟ کەس هەبووە بیبستن بڵێت منداڵە بچووکەکە ئەوانەی کە بەمنداڵی مردوون ئەوانەی بە دوو ساڵ و سێ ساڵی مردن داواتات لێ ئەکەین شەفاعەتمان بۆ بکەن منداڵەکەم هاوار بۆتۆ شەفاعەتم بۆ بکە ؟! قەت شتی وای وتوە !؟ ئینجا فەرقی چیە هەمان حاڵەتە شێخ ئەڵێرە پێت ئەڵێت (أتقول : إن الله أعطاهم الشفاعة وأطلبها منهم فإن قلت هذا رجعت إلى عبادة الصالحين التي ذكرها الله في كتابه. ) ئەگەر تۆ ئەوە بڵێت کەواتە گەڕایتەوە بۆ عیبادەتی صالحین ئەگەر بڵێ بەڵی مەلائیکە و ئەولیا و منداڵان شەفاعەت ئەکەن من داواش لەوانیش ئەکەم کەواتە نەفسی قسەت کرد کەوا کافرەکان کردیان ئێمە بۆیە داوایان لێ ئەکەین بۆئەوەی نزیکمان بکەنەوە لەخوا ! هەمان قسەی ئەوانت کرد (وإن قلت : لا) ئەگەر بڵێ : نا داوا لەوان ناکەم (بطل قولك) کەواتە قسەکەت پوچەڵ بوویەوە ! کە مادەم داوا لەوان ناکەی کە شەفاعەتیان دراوەتێ داواش لەپێغەمبەر مەکە کە لەدونیادا کە شەفاعەتی دراوەتێی ﷺ (أعطاه الله الشفاعة وأنا أطلبه مما أعطاه الله. ) کەواتە ئەم قسەی تۆ باطلە کەبڵێ (أعطاه الله الشفاعة وأنا أطلبه مما أعطاه الله) ئەوان ئەڵێن مادەم خوا شەفاعەتی داوە بەو کەسە من لەو کەسە داوا ئەکەم ! ئەڵێن کەواتە تۆ لێرە قسەکەت بەتاڵ بوویەوە ، ئەم شوبهەیەوە پەیوەستە بەداوا کردن لە پێغەمبەری خوا ﷺ کەداوای شەفاعەتی لێ ئەکرێت وە بڵاوی ئەکەن لەناو خەلکیدا بۆئەوەی خەڵکی بکەن بە دووژمنی دەعو و بانگەوازی یەکخوا پەرستی بەخەڵکی بڵێن ئەمانە ڕقیان لەپێغەمبەرە ﷺ ئەمانە ڕقیان لەشەفاعەتەکەیتی ئەمانە ئینکاری شەفاعەت ئەکەن ، ئەمیش بەم شێوازە ڕەدی دایەوە ئەگەر لەم جۆرە ڕەددانەوە یە ئەگەر وردە وردە بڕۆین لەگەڵ شێخدا ئە ئێستا بە مختصەری باسی کرد ئەڵێن ئەم شوبهەیە لەدووشت پێك دێت :

*یەکەمیان : (الإدعاء بأن منسيد ينكر شفاعة رسول ويمرء منها ) موشریکان صۆفیان دەورێشان لەهەموو کاتێك و وەختێکدا بەشێخ (محمدی کوری عبدالوهاب)یان وتوە تۆ ئینکاری شەفاعەت ئەکەی ! ئەوە شوبهەکەیە .

*دووەم : (أن رسول ﷺ يعطى شفاعة مادم أن يعطى شفاعة فنحن يطلبو منه أعطاه الله ) پێغەمبەر شەفاعەتی دراوەتێ ﷺ مادەم پێی بەخشێنراوە ئێمەش لەویی داوائەكەین لەبەر ئەوە هەندێكیان ئەلێن (لما أعطلى شفاعة لرسول ﷺ كان بيدى رسول) مادەم پێغەمبەرﷺ پێی بەخشێنراوە بەدەست خۆیەتی (فطلبوها من الرسول كطلب عاجة في تقادرين) كاتێك كەتۆ لەویی داوا ئەكەی وەك ئەوەوایە كەسێك شتێكی لەتوانادا هەیە تۆش لەو داوا ئەكەی ئەوە ئەوها مەسەلەكە هەندێكیان ئەلێن دوای شەفاعەت (الشفاعة من رسول جائز وقد كان صحاب يفعلون في حياة) هەتا ئەلێن پێغەمبەر ﷺ لەژیانی رۆژانەیدا خەلك داوای شتی لێ كردوە لەمردنیشدا بەهەمان شێوە ئەها بزانە شتەكەیان تێكەلاو كرد چەواشەكارییەكە لێرەدایە جا چۆن رەد لەمە ئەدەینەوە وەكو وتمان یەكەم شت ئێمە ئعتراف ئەكەین ئەلێن بەلێ شەفاعەت مەوجودە بۆئەوەی ئاگادربن ئەو چەواشەكارییەیان تێنەپەرێنن بەسەر خەلكیدا باوەریان پێی بهێنن بلێن ئێمە بروامان بە شەفاعەت نیە ! وەكو وتمان ئێمە ئیمانمان بەشەفاعەت هەیە تەسلیم دەبین بەو موقەدیمەیەی كەئەوان هێناویانە بەلێ ئیمانمان بەشەفاعەت هەیە وەرجای شەفاعەتەكەیان ئەكەین لەخوای تعالی ! ئەمە هیچ ئیشكالێكی تێدا نیە ،

رەد دانەوەی دووەم :ئەوەی كەوا بینایان كردوە لەسەر ئەم موقەدیمەیە ئەوەیە مادەم پێغەمبەرﷺ شەفاعەتی دراوەتێ نەتیجەكە ئەوەیە ئێمەش لەو داوا ئەكەین ئێمەش ئەلێن بەلی راستە شەفاعەتی دراوەتێ بەلام كە لەو داوا ئەكەین ئەمە هەلەیە ! (ولاكن قولهم مطلوب فی الحياة دنيا هذا خطء بل إن الشفاعة الرسول زمنها فی الاخره ) شەفاعەتی رسول لە ئاخیرەتدایە وە لەئاخیرەتیشدا ئەوكاتە كە خوای تعالی پێی ئەفەرمووێی سەربەرزبكەرەوە ! (فان تسألت رسول ﷺ شیء لم يأتی زمنه ) تۆ داوای شتێك لەپێغەمبەر ئەكەی ئێستا لەحەیاتی دونیادا ﷺ كە زەمەنی نەهاتوە هێشتان هەروەكو لەحەدیسی صەحیح هاتوە ئەفەرمووێی : (ان الناس يأتون اليوم القيامه الى الرسول ﷺ ويطلبون أن يشفع)(أما فی دنيا فلا) هەروەكو لەحەدیس هاتوە خەلكی ئەچن بۆلای پێغەمبەر ﷺ داوای شەفاعەتیان بۆ بكا شەفاعەتیان بۆ بكا بۆئەوەی حوكم دابنرێی و خەڵكی موحاسەبە بكرێت لەو كاتەدا دروست ئەبێ نەك ئێستا لەدونیادا داوا بكرێی .

یەكێكی تر لەم شتانەی كەوا ئەم شوبهەی پێ ڕەد ئەدرێتەوە ئەوەیە كە بوترێی شەفاعەت مولكی پێغەمبەر نییە ﷺ ئەگەر مولكی بوایە پێویستی ئەكرد لەڕۆژی قیامەت بلێ ئەی خوایە داوا لەخوای تعالی بكا ! مادەم شتێك مولكی تۆ بێ پێویست ئەكا لەكەسێكی تری داوا بكەی ! پێویست ناكا ،گەر شتێك مولكی خۆت بێ پێویست ناكا بچێت داوا لەكەسێكی تر بكەی بلێ ئەو شتە بدەم بەكەس و نەیدەم بەكەس ! كەواتە دەركەوت كەوا شەفاعەت هی خوای تعالی یە نەك هی پێغەمبەرﷺ كە پێ بەخشێنراوە وەكو وتمان بە ئیزن پێ بەخشێنراوە ئەبێ ئیزن لەخوای تعالی وەربگرێت وە خوای گەورە ئیزنی نادا هەتا ئەو كەسە موحید نەبێ .

یەكێكی تر لەرەدەكان ئەوەیە پێی بلێن بەلێ خوای تعالی شەفاعەتی داوەتێ بەس نەهی كردوە لەتۆ كەوا داوای لێ بكەی ! خوای تعالی فەرموویەتی چی لەقورئانی پیرۆزدا (فَلَا تَدۡعُواْ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدٗا)[1] كەواتە تۆ نابێ داوا لەغەیری خوا بكەی كەواتە ئەمە هەلەیە تۆ بلێ لەبەر ئەوەی شەفاعەتی دراوەتێ من لەو داوا ئەكەم بەلێ شەفاعەتی دراوەتێ بەلاّم خوای تعالی پێی وتوی كەوا لەو داوا مەكە هیچ شتێك لەو داوا مەكە لەكەس داوا مەكە لەهیچ بەشەرێك مادەم شتیان لەدەسەلاتدا نەبێت پاشان ئەلێن شەفاعەت پەیوەست نیە بەخودی پێغەمبەرەوە ﷺ تایبەت نیە بەخودی ئەوەوە ، ئەویش و غەیری ئەویش پێغەمبەران و ئەولیا و مەلائیكە و الافراط هەمووی شەفاعەت ئەكا ئایا تۆ ئەچی لەغەیری ئەوانی داوا بكەی ؟ ئەگەر وتی بەلی . ئەلێن وەكو موشریكەكانت كرد ئەگەر وتی نە ئەلێن بۆ مادەم ئەو پێی دراوە بۆچی لێ داوا ناكەی ئەلێ مولكی ئەو نیە ئەلێن پێغەمبەریش مولكی ئەو نیە ﷺ واتا شەفاعەت مولكی پێغەمبەر نیە ﷺ.

یەكێكی تر لە رەددانەوەكان ئەلێن ئەو داوایە لەخوا بكە بەلێ ئیسپاتی شەفاعەتمان كرد كەوا بیلێن خوایە بیكەی بە شەفاعەتكارمان ئابەم شێوەیە ئەم شوبهەیە ئەرەوێتەوە .

شێخ (صالح) ئەفەرمووی :

(أي ليس من لازم إعطاء النبي ﷺ وغيره الشفاعة جواز طلبها منهم) واتا ئەمە ئەوە ناگەینێ كەوا پێغەمبەر ﷺ شەفاعەتی پێدراوە یان غەیری ئەو شەفاعەتی پێدراوە جائیز بێت تۆ

[1] : سورة الجن اية : ١٨

داوایان لیٚ بكەیت (وهم أموات) لەكاتێكدا ئەوان مردوون !( بدليل أن الله سبحانه وتعالى نفي أن يشفع أحد عنده إلا بإذنه ورضاه عن المشفوع فيه) بەدەلیلی ئەوەی كە خوای گەورە نەفی و ڕێگری ئەوەی كردوە كەكەسێك شەفاعەت بۆ كەسێك بكا إلا بەئیزنی خوا وە ئەبێت خوا لەو كەسەش ڕازی بێت . ئەم دوانە لەبیر مەكەن ئەبیٚ خوای تعالی ئیزن بات وە ئەبیٚ خوا لەوكەسەش ڕازی بیت كە شەفاعەتی بۆ ئەكرێت ئەویش موحید نەبێت نابێت (ولأن طلب الشفاعة من الأموات شرك) داوا كردنی شەفەعات لەمردوان شیركە واتا خوا هەموو ئیشەكان خوای گەورە پوچەلی ئەكاتەوە هەموو نوێژو ڕۆژووەكانت و عیبادەتەكانت بەس بەوەندە بلێت (یارسول الله )شەفاعەتم بۆ بكە هیچ عمەلێكت نامێنیتەوە وە ئەگەر لەسەر ئەمە بمرێت بە موشریكی و بەكافری ئەڕۆیت پەنا بەخوای گەورە ! (والله قد حرم الشرك ، وأحبط عمل صاحبه ، وحرم عليه الجنة) خوای گەورە شیركی حەرام كردوە وە هەرچی كارێك خاوەنی ئەو شیركە بیكات خوای تعالی لەناوی ئەبات وە بەهەشتی لەسەر حەرام كردوە (وقد أنكر سبحانه على الذين يدعون غيره ويقولون هؤلاء شفعاؤنا عند الله) خوا ئینكاری كردوە جل وعلى لەو كەسانەی كەوا لەغەیری خودا داوایان كردوە وتویانە كەوا ئەوانە شەفاعەتكارمانن (ونزه نفسه عن ذلك وسماه شركا) خۆی لەوە خاوێن كردۆتەوە خوای تعالی كەئەمری بەوە كردبیٚ یان ڕێنمای بەخەلكی كردبێت وابلێن وە ئەوەی بەشیرك داناوە ،( وأيضا إعطاء الله الشفاعة ليس خاصا بالنبي ﷺ فهل كل من أعطي الشفاعة تطلب منه من دون الله) هەروەها ئەلێت شەفاعەت پەیوەست و تایبەت مەند نیە بە پێغەمبەری خواوە ﷺ كەسانیتریش و غەیری ئەویش پێی بەخشێنراوە ئایا ئەبیٚ داوایان لیٚ بكەین لەغەیری خوای تعالی ؟! (فهل كل من أعطي الشفاعة تطلب منه من دون الله ؟) لەغەیری خوا لەو شەخصە داوا ئەكرێت ؟ (كما كان المشركون الأولون يفعلون ذلك) هەروەكو موشریكەكانی پێشین ئەمیان ئەكرد ! (هَٰٓؤُلَآءِ شُفَعَٰٓؤُنَا عِندَ ٱللَّهِ)[1] ئەیانوت ئەمانە شەفاعەت كارانمانن بۆلای خوای تعالی .

[1]: سورة يونس اية : ١٨

## (إثبات أن الالتجاء إلى الصالحين شرك)

شوبهەی شەشەم : (فإن قال : أنا لا أشرك بالله شيئا) کابری موشریك دێت کابرای صۆفی و دەورێش دێت بەتۆ ئەلێت من شەریك بۆ خوا قەرار نادەم (حاشا وكلا) تەبعەن هیچ کاتێك ئەوە نیە بەخۆی بلێت من موشریکم بەس عەمەلەکەی شیرکە بەخۆی نازانی ئێستا دێنە سەر ئەم شوبهەیان (ولكن الالتجاء إلى الصالحين ليس بشرك) ئەمە چەواشەکارییەکەیە شوبهەکە لێرەدایە ئەلێت : بەڵام داوا کردن و پەنا گرتن و داوای یامەرتی و پەناگەی لەصالحین شیرك نیە ، یانی هانا بردن بۆ صالحین داوا لێکردنیان داوای پەنا لێکردنیان داوا شتێکیان ئەمە پێی ناوترێی شیرك کەواتە ئەو لێرە تەعریفی شیرك نازانیٚ ئەو ئەمە بە شیرك نازانیٚ (فقل له) تۆ پێی بلیٚ : (إذا كنت تقر أن الله حرم الشرك أعظم من تحريم الزنى) ئەگەر إقرار ئەکەی بەوەی خوای تعالی شیرکی حەرام کردوە زۆر لەزینا گەورەتر . زینا حەرامە یان نا ئەلیٚ بەلی حەرامە . ئایا تۆ إقرار ئەکەی بەوەی کەوا شیرك لە زینا گەورە ترە (وتقر أن الله لا يغفره) وە إقرار ئەکەی کەوا لەشیرك خۆش نابیٚ ؟! (فما هذا الأمر الذي حرمه الله وذكر أنه لا يغفره) پێی بلیٚ دەوەرە تەعریفی شیرکم بۆ بکە ؟! ئەمە وەکو شوبهەی چوارەم وایە . کە ئەیوت ئەمە عیبادەت نیە ئێمەش ئەلێن وەرە تەعریفی عیبادەتمان بۆ بکە ! ئینجا ئەلیٚ (فإنه لا يدري) نازانیٚ چیە تەعریفی شیرك ،ئەلیٚ ئەمە شیرك نیە یانی هاوارکردن بۆ صالحین و داوا کردن لەصالحین بەشیرك نازانی ئەمە (فقل له: كيف تبرئ نفسك من الشرك وأنت لا تعرفه ؟) جا لەبەر ئەوەی هاواربردن بۆ رسول الله ﷺ و بۆ صالحین بۆ پێغەمبەران و بۆ مەلائیکە شیرکە و ئەویش بەشیرکی دانانیٚ ئێمە پێی ئەلێن (كيف تبرئ نفسك من الشرك وأنت لا تعرفه ؟) تۆ نالێت شیرك حەرامە ؟ بەلی ؟ ئەی چۆن تۆ شیرك نازانی بۆ ئەوەی خۆتی لیٚ بەریئ ئەکەی ، وەرە تەعریفی شیرك فێر بە (كيف يحرم الله عليك هذا ويذكر أنه لا يغفره ولا تسأل عنه ولا تعرفه ؟) یان چۆن خوا شتێکی حەرام کردوە وەتوویەتی من لەوکەسە خۆش نابم بکەوێتە ناو شیرکەوە کەچی تۆ نازانی شیرك چیە پرسیاری لیٚ ناکەی ؟! ناتەوێی بیزانی ؟! پرسیاری لیٚ ناکەی ! (أتظن أن الله يحرمه ولا يبينه لنا ؟) ئایا تۆ پێت وایە خوای گەورە شتێکی حەرام کردبیٚ بەیانی نەکردبێت

لەقورئانەکەیدا ؟! پێت وایە کەوا بۆی بەیان نەکردبێ کەوا ئەو شتەی کەوا حەرام کراوە لەوقورئانەکەیدا پی نەوتبین چیە ئەوشتە ؟! (فإن قال : الشرك عبادة الأصنام) ئینجا کابرا دێت پێت ئەلێ ئا ئەزانم شیرك چیە . شیرك چیە ؟ ئەلێ : واتا لەدار و بەردێك بپەرستی و لەدار و بەردێك داوا بکەی ئەوە شیرکە !. (ونحن لا نعبد الأصنام) پێت ئەلێ بت و صەنەم ناپەرستم کا من بت و صەنەمم پەرستوە کا من هاتووم بت بتاشم وەکو (لات ومنات وعزا) بیان پەرستم ! ئەمە شیرکە ! (فقل له : ما معنى عبادة الأصنام ؟) تۆش پێی بلێ وەرە بزانم عیبادەتی ئەصنام چیە لەلای تۆ ؟ (أتظن أنم يعتقدون أن تلك الأخشاب والأحجار تخلق وترزق وتدبر أمر من دعاها ؟ فهذا يكذبه القرآن) ئایا تۆ باوەرت وایە کەوا ئەو کەسانەی کەوا داوایان ئەکرد لەو بت و صەنەمانەی لەو خەشەبانە لەو بەردانە لەو دارانە ئیعتقادیان وابێ کە ئەمە دونیای دروست کردوە ؟! ئەمە رزق ئەدا ؟! ئەمە دونیا بەرێوە ئەبات ؟! ئەمە قورئان خۆی بە درۆی ئەخاتەوە چونکە قورئان ئەفەرمووێی : ئەگەر تۆ پرسیاریان لێ بکەی کێ ئەرز و ئاسمانی دروست کردوە ئەلێن خوا ، واتا (ئەبو جهل )پێت ئەلێ خوا دونیای دروست کردوە ، ئێوە سەرنج بدەن (ئەبو جهل ) طواف ئەکرد بەدەوری کەعبەدا ! بەرۆژوو ئەبوو ئەوەتا پێغەمبەر ئەفەرمووێی ﷺ: قوریش لەموحەرەمدا بەرۆژوو ئەبوون (ئەبوجهل ) طواف ئەکرد حەجی ئەکرد صەدەقاتی ئەکرد وە یارمەتی خەلکی ئەدا ئاو و نانی حاجیەکانی ئەدا ئەیوت لەبەر ئەوەی خوای تبارك وتعالى لێمان رازی بێت بەلاَم لەهەمانکاتدا بۆ صالحینیشیان ئەکرد ئەوشتانە داوای ئەوانەشیان ئەکرد جا قورئانە بۆخۆی ئەم دەعوەیە بەدرۆ ئەخاتەوە بلێ (ئەبو جهلە)کانی زوو ئەوانە ئەو دارو بەردەیان لەبەر ئەوە پەرستوە چونکە ئیعتقادیان وابووە ئەوانە دونیا بەرێوە ئەبەن ! نەخێر وانەبوو (وإن قال : هو من قصد خشبة أو حجرا أو بنية على قبر أو غيره) ئەگەر پێی وتی شیرك مەبەستی ئەوەیە کە کەسێك داریك بەردێك یان بینایەك کە لەسەر قەبرێك دروست کراوە مەبەستی ئەمانە بێ (يدعون ذلك ويذبحون له يقولون : إنه يقربنا إلى الله زلفى ويدفع الله عنا ببركته ويعطينا ببركته ، فقل : صدقت) ئەگەر پێشت بلێ شیرك ئەوەیە کە هەر کەسێك دارێك بەردێك شتێك بپەرستێ هاواری بکا مەبەستی بێ کە داوایان لێ بکا و وە حەیوانیان بۆ سەربرێی وە عیبادات بکا وە ئەوانە بلێن بۆ ئەمانەی ئەکەین وە نزیکمان ئەکەنەوە لەخوا

وه خوا دەفعی بەلاّمان لیّ ئەکا بەبەرەکەتی ئەمانە . بلیّ والله راست ئەکەی ئەمەیە شیرك . (وهذا هو فعلكم عند الأحجار والأبنية التي على القبور وغيرها) ئائەمەیە ئیشی ئیّوە لەلای ئەو دار و بەردانەی کەوا ئەیپەرستن لەلای ئەو قەبرانەی کەوا ئەیپەرستن (فهذا أقر أن فعلهم هذا هو عبادة الأصنام فهو المطلوب. ) ئەمە إقراری کرد کە فیعلی ئەوانە عیبادەتی ئەصنام ئەوهایە ئەمەیە کە ئیّمە داوای ئەکەین جا ئەمە وەکو ئەو عیبادەتەیە کە ئیّوەش ئەیکەن (ويقال له أيضا : قولك : (الشرك عبادة الأصنام) هل مرادك أن الشرك مخصوص بهذا) ئەگەر بلیّ :وەلا شیرك تەنها ئەوەندەیە تایبەت مەندە بەوەندەوە ! هیچی تر (وأن الاعتماد على الصالحين ودعاءهم لا يدخل في ذلك ؟)بلیّت پشت بەستن بەپیاو چاکان و داوالیّ کردنیان و تەوەکول لەسەر بەستنیان و بانگەواز کردنی ئەوان ناچیّتە ژیّر ئەم بابەتەوە ؟! ئەلیّن (فهذا يرده ما ذكر الله في كتابه من كفر من تعلق على الملائكة أو عيسى أو الصالحين) ئەم قسەیەی کە تۆ ئەیکەی چی رەدی ئەداتەوە خوای تعالی لەقورئان کە کەسانیّك هاتوون موتەعەلیق و پەیوەست بوون بەملائیکە و بەعیسا و صالحینەوە خوای تعالی بەموشریکی لەقەلەم داون ! (فلا بد أن يقر لك أن من أشرك في عبادة الله أحدا من الصالحين فهذا هو الشرك المذكور في القرآن وهذا هو المطلوب) کەواتە پیّویستە ئەو کابرایە إقرار بکا بلیّ ئەوەی کەوا شەیرك لە عیبادەتی خوادا دابنی شیرك بکات لەعیبادەتی خوا و هەر کەسیّك بەشدار کا لەعیبادەتی خوای تعالی جا صالح بیّت یان غەیری صالح ئەوە ئەو شیرکەیە واتا (من دون لله ) بیّت ئەوە ئەوشیرکەیە گەیشتنیە مەبەست .

(وسر المسألة أنه إذا قال : أنا لا أشرك بالله) جا وەرە بۆ سیری ئەم مەسئەلەیە ئەم شوبهەیە بابزانین چۆنە ! ئەلیّ من شیرك پەیدا ناکەم بۆ خوای تعالی ! (فقل له : وما الشرك بالله ، فسره لي ؟)دەوەرە شیرکم بۆ تعریف بکە ؟ بزانم شیرك چیە لای تۆ ؟ (فإن قال : هو عبادة الأصنام)شیّخ گەرایەوە تلخیصی بابەتەکە ئەکا پیّمان بلیّ عیبادەتی ئەصنام چیە ؟ (فقل : وما معنى عبادة الأصنام فسرها لي ؟) ئادەی بزانین عیبادەتی ئەصنام چیە بۆمان تەفسیرکە ؟

(فإن قال : أنا لا أعبد إلا الله) دوای وتی لەخوا زیاتر من کەسیتر ناپەرستم ! (فقل : ما معنى عبادة الله ؟) دەپێمان بڵێ عیبادەتی خوا بەتەنها چیە(فسرها لي ؟) بۆمان تەفسیر کە بۆمان ئاشکرا بکە ؟ (فإن فسرها بما بينه القرآن فهو المطلوب) ئەگەر تەفسیری کرد بەوەی قورئان باسی کردوە ئەوە تەواو ئەوە وایە (وإن لم يعرفه فكيف يدعي شيئا وهو لا يعرفه ؟) ئەگەر نەیزانی ئەلێن جا باشە کە تۆشتێك نازانی چۆن إدعای زانینی ئەوشتە ئەکەی ؟! (وإن فسر ذلك بغير معناه) ئەگەر تەفسیری کرد بەغەیری مانای خۆیی (بينت له الآيات الواضحات في معنى الشرك) ئینجا برۆ ئایەتەکانی بۆ بێنە کە باسی بەیانی شیرك ئەکات ! (في معنى الشرك وعبادة الأوثان وأنه الذي يفعلونه في هذا الزمان بعينه)ئەوەی ئەمرۆ خەلك ئەیکا هەر نەفسی ئەوەیە کە خوا لەقورئاندا باسی کردوە . یانی کاتێك کە کابرا ئەلێ (یارسول الله ) هاوار (یاعبدالقادر) هاوار ئەلێن نەفسی ئەوەیە کە کاتی خۆی ئەیان وت (یاود ، یایغوس و یا سواع)! یان (یا لات و منات و عزاء ) هیچ فەرقی نیە چونکە ئەوانە صالحین بوون لەکاتی خۆیدا داوا کراون لەغەیری خوا تۆش لەئەنبیاء و صالحین داوا ئەکەی هیچ فەرقێکتان نیە (وأن عبادة الله وحده لا شريك له هي التي ينكرون علينا) عیبادەتی خوا بەتاك و تەنها ئەوەیە کەشەریکی نەبێ ئێوە بەئێمە ئەلێن نەخێر بەو شێوەیە نابێ عیبادەت وانیە بەم شێوازە ئینکاری ئەوەمان لێ ئەکەن ! (ويصيحون فيه كما صاح إخوانهم)سەیری ئەو عیبارەتە بکە (ويصيحون فيه كما صاح إخوانهم)! واتا هاوارت لێ ئەکەن هەروەکو برا برا موشریکەکان (ئەبو جهل)ی برایان هاواری ئەکرد کاتی خۆیی کە ئەیان وت (حيث قالوا: أَجَعَلَ ٱلْآلِهَةَ إِلَٰهًا وَٰحِدًا ۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيْءٌ عُجَابٌ)[1] چۆن ئەبێ تەنها داوای (الله) بکرێی بەتەنها ! چۆن ئەبێ تەنها تەنها خوا بپەرسترێی بەتاك و تەنها ! ئەی ئەو پیاو چاکانە جاهیان هەیە ! ئەو پیاچاکانە شەفاعەتیان هەیە ئەو ئەنبیاء و رسولانە هەتا کۆتاییەکەی ! بەعام ئەم قسانەمان بۆ ئەکەن چۆن تۆ ئەوانە مەنع ئەکەی لەئێمە !؟ نەفسی قسەش نیە ئەوانەی ئەمرۆ ئەیکەنەوە !؟ هەمان قسەیە ، برۆ پێیان بلێ بەس لەخوا داوا بکە بەس خوا داوا بکە دڵی دائەخرێی ئەلێ چۆن لەپێغەمبەر داوا نەکەم ﷺ! چۆن (عبدالقادر) داوانەکەم ! تۆ داوا کردنت تەنها لەخوادا تەسك کردەوە ئەوهامان پێ ئەلێن ئەوەندە رقیان لەتوحیدە ! ئەگەر

[1] : سورة ص اية : ٥

بەتەنها داوا لەخوا بكرێی دلیان بێزار و بێتاقەت ئەبیٚ و دائەخرێی لەغەیری خوا داوا بكرێی دڵیان ئەكرێتەوە ! ئەم بابەتە پەیوەست نیە بەدوعای كەسەكان وەكو نەزر و صەلات و ئەوبابەتانە بەتەنها چونكە ئەمڕۆ كێشەكە زۆر لەوە گەورەترێكە ئاگاداربە یانی شوبهە و چەواشەكارییەكان زۆر لەوە گەورەترن ئێستا علمانیەك ئەچێ دەستوری كەسێك قبول ئەكا ناوی نانێت شیرك ! ئەلیٚ خۆمن نالێم ئەو كەسە دونیای دروست كردوە ئەو ڕێنمایم ئەكا ئەی ڕێنمایی كردن شیرك نیە ! وەرە شیركم بۆ تەعریف كە وەرە عیبادەتم بۆ تەعریف كە ! ئابەم جۆرە ڕەددانەوە تۆ ئەتوانی ڕەدی هەموو ئەو جۆرە موشریكانە بدەیتەوە چ صۆفی و دەورێش بیٚ چ علمانی بیٚ چ كەسێكی دونیایی بیٚ بێت تەنها دونیا بپەرستێی ئەوانە دونیا ئەپەرستن ، تۆ بەقسەی كەسانێك ئەكەی لەغەیری خوا ! تۆ ئەوامیر لەغەیری خوا وەرئەگریی كەواتە تۆ موشریكی ! هەروەكو چۆن كابرا داوا لەغەیری خوا ئەكا موشریكە تۆش بەهەمان شێوە موشریكی جا ئەگەر ئێمە وایان پێی بلێن بلێن بەس خوا وەرە بەس خوا بپەرستە وەرە بەس داوا لەخوا بكە وەرە بەس ڕێنمای لەخوا وەربگرە ئەو تۆیی دروست كردوە ئەبیٚ بەس ڕێنمای لەو وەربگریی هاوارت لیٚ ئەكا ئەلێن (أَجَعَلَ ٱلۡأٓلِهَةَ إِلَٰهٗا وَٰحِدًاۖ إِنَّ هَٰذَا لَشَيۡءٌ عُجَابٞ)[1] چۆن ئەبیٚ ڕێنمایی لەیەك كەس وەربگرین ئەها ئەمڕۆش سەیركە ئازادی ئازادی ! ئەلیٚ من ئازادم لەوە دیموكراتی وەرئەگرم ئازادم لیبرالیم ئازادم وەطەنیم ئازادم فلان شتیم فلان شتیم هەتا داوای سەر بە ئەمریكام سەر بە ڕوسیام سەر بەصینم سەر بەفلانم سەر بەماركسم یانی ئەم ناوانەت بۆ دەهێنی ناویشی نانێت شیرك ئەمە بۆخۆی شیركە ئەمە بۆخۆی هاوبەشی پەیدا كردنە بۆ خوای تعالی چونكە تۆ ڕێنمایت لەغەیری خوا وەرگرت ئینجا ئەو بەشیركی بزانی یان نەزانی تەبعەن ئەوان هیچ كاتێك بەخۆیان نالێن موشریك . شەیتان بەخۆی ئەلیٚ موشریك و كافر ؟ كیٚ هەیە بەخۆی بلیٚ موشریك و كافر . شەیتان كاتێك كە كەسێك كافر ئەكا شیركی پێی ئەكا یەكسەر ئەلێت (إني برئ ) من بەریم لەو شیركە ! خۆی لیٚ بەرائەت ئەكا (إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)[2] ئەلێت (إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ) بەداخەوە ئەمڕۆ چەندەها شتی سەیر سەیر ئەبیستین شەخص ئەهێنین بۆ نمونە دانیشتنی ئیسلامی و علمانیەكان ئەبیٚ ! لەمیدیاكاندا سەیرئەكەی پرسیاریان لیٚ ئەكەن

[1]: سورة ص اية :٥
[2]: سورة الحشر اية : ١٦

ئەلیٚ ئەوە کافرە ئەلیٚ من کەس کافر ناکەم ئەلیٚت ! ئەلیٚ کیٚ کافرە ئەو کەسەی کە بەخوٚی بلیٚ کافر کافری ئەکەم باشە کەس هەیە بەخوٚی بلیٚت کافر کەس هەیە بەخوٚی بلیٚت من کافربوویمە مەگەر کەسیٚك زوٚر زوٚر هەتا بلیٚت بیٚعەقل بیٚ هیچ نەزانی لەسیاسەتی روٚژانی هیچ نەزانی خەلٚکی لەخوٚی هارکا بلیٚ ئا من کافرم بەخوا و بەپیٚغەمبەر و ﷺ و بڕوام بەوشتانە نیە ! ئاوها بلیٚ بەو شیٚوەیە بەلاٚم علمانیەکان زوٚر مونافیقن نایەن بلیٚن من کافرم ئەلیٚن (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ)[1] مردوەکیان هەبیٚ ئەلیٚن خوا بەبەهەشتی شاد بکا یان ئەوەتا سەیرکە ئیٚستا زوٚر بەی علمانیەکانی ئیٚستا کە لەکاتی خوٚیدا ئەو پەری چەپ رەووبوون ئیٚستا هەموو زمانیان بریتیە لە (إن شاءالله) ئەلیٚت إن شاءالله بەیانی ئەچین بوٚ پەرلەمان بە ئیزنی خوا بەپشتیوانی خوا ئەها بزانە ناوی خوات بوٚ ئەبا بوٚ ئەوەی بوٚت برازیٚنیتەوە بوٚئەوەی بوٚت ئاسان کا کە توٚ باوەرت وابیٚ کە ئەو شەخصە باوەری بەخوا هەیە باشە بڕوابوون بە خوا هەر ئەوەندەیە کە بلیٚت خوا هەیە ئەوە (جەهمی کوری صفوانە) کە کافر کرا لەکاتی خوٚیدا خوٚ شەیتان لەهەمووتان لەباشتر خوا ئەناسی لەهەمووتان باشتر بڕوای بەبەهەشت و بەجەهەنم هەیە ! شەیتان یەك ئیشی نەکرد سەجدە بەرە نابەم ئیٚوە چەندەها ئەمری خواتان شکاندوە چوٚن پیٚی کافر نابن ئەوامیری خوا کە بەتەکەبورر ئەشکیٚنی چوٚن پیٚی کافر نابی جالیٚرە ئەبیٚ ئاگاداریی ئەوە بین مەسەلەی شیرك و مەسەلەی عیبادەت تەعریفی داوا بکەین لەخەلکەکە بلیٚن وەرە جاریٚکیکیە وەرە ئیسلام پیٚناسە بکەنەوە شیرك پیٚناسە بکەنەوە کە توٚ ئەلیٚ من خەلك کافر ناکەم بزانم وایە یانی جوٚین بەخوا ئەدا ئەلیٚ من کافری ناکەم جایهلە .

شیٚخ (فوزان ) ئەلیٚت :

(يبين الشيخ رحمه الله أن الشرك ليس مقصورا على عبادة الأصنام) ئالیٚرەدا شیٚخ (محمدی کوری عبدالوهاب) لەرەد دانەوەی ئەم شوبهەیە کە شوبهەی شەشەمە رەدی ئەوانە ئەداتەوە کە گوایە ئەوان وائەزانن کەوا شیرك بریتیە لەوەی کەوا بەردیٚك بتاشی و سەجدەی بوٚ بەریت ! هەر ئەوەندەیە شیرك بوٚیە هاوار کردن بوٚ پیٚغەمبەران (عليهم الصلاة والسلام) بوٚ ئەولیا و صالحین بەشیرك نازانن (لأن المشركين الأولين منهم من يعبد الملائكة ، والملائكة أصلح

[1]: سورة الفاتحة اية : ١

الصالحین كما قال تعالی : بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ۝٢٦ لَا يَسۡبِقُونَهُۥ بِٱلۡقَوۡلِ وَهُم بِأَمۡرِهِۦ يَعۡمَلُونَ ۝٢٧ يَعۡلَمُ مَا بَيۡنَ أَيۡدِيهِمۡ وَمَا خَلۡفَهُمۡ وَلَا يَشۡفَعُونَ إِلَّا لِمَنِ ٱرۡتَضَىٰ وَهُم مِّنۡ خَشۡيَتِهِۦ مُشۡفِقُونَ ۝٢٨ ۞ وَمَن يَقُلۡ مِنۡهُمۡ إِنِّيٓ إِلَٰهٞ مِّن دُونِهِۦ فَذَٰلِكَ نَجۡزِيهِ جَهَنَّمَۚ كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلظَّٰلِمِينَ)[1] وتمان شێخ (فوزان) ئەلێ : شێخ (محمدی كوری عبدالوهاب) بەیانی ئەكا كە شیرك تەنها ئەوەندە نیە تۆ بت بپەرستی بەتەنها ئەوە شیركە بەلاَم شیركی تریشمان هەیە لەبەر ئەوەی موشریكینی پێشوو مەلائیكەیان ئەپەرست كە ئەوانە (أصلح الصالحین)بوون سەیری كە خوای گەورە لەقورئاندا فەرموویەتی (بَلۡ عِبَادٞ مُّكۡرَمُونَ ) ئەوانە كەسێك نین بپەرسترێن بەلكو ئەوانە عەبدن پەرستراو نین ! وە ڕێزلێنراون لەلای خوای تعالی ئەوانە بەبێ ئەمیری خوا هیچ شتێك ناكەن خوای تعالی ئاگاداری هەموو كار و كردەوەیانە هەموو وتەیانە هەموو جموجۆلەكیانە چی بكەن و چی نەكەن ئەوە ئەوانە شەفاعەت ناكەن إلا بۆ كەسێك نەبێ خوا لێ ڕازی بێ وە لەخوا زۆر زۆر ئەترسن وەهەركەسێك لەوان بلێ ئەبێ من بپەرسترێم بەقسەم بكرێی بەقسە بكرێم هاوارم بۆ بكرێی عیبادەتم بۆ بكرێی ئەوە خوای تعالی ئەفەرمووێی من تۆ لەی لێ ئەستێنم بەئاگری دۆزەخ هەر مەلائیكەیەك وابلێت ئاوهاش هەر زالمێكی تر هەر كافرێكی تر ئەو قسەیە بكا من تۆڵەی لێ ئەسێنمەوە هەر كەسێك بلێ داوا لەمن بكەن هەركەسێك بلێ ڕێنمای من وەربگرن لەغەیری خوای تعالی خوای تعالی ئەلێت :بەجەهەنم تۆڵەی لێ ئەستێنم ! (ومنهم من یعبد الصالحین) هەبوو صالحینی ئەپەرست خوای تعالی ئەفەرمووێی (أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ يَبۡتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ ٱلۡوَسِيلَةَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ وَيَرۡجُونَ رَحۡمَتَهُۥ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُۥٓ)[2] ئەوانەی ئێوە داوایان لێ ئەكەن لەغەیری خوای تعالی ئەوانەی كە ئێوە دەیان پەرستن لەغەیری خوای تعالی ئەوان بۆخۆیان (ئەنبیاء صالحین و مەلائكانە) خۆیان پێشبركێی ئەكەن لەكاری عیبادەتدا لەئەنجامدانی كاری عیبادەت كامیان زیاتر بچێتە پێشەوە بۆلای خوای تعالی بەعیبادەتەكەی وە ئەوانە ڕجای ڕەحمەتی خوایان هەیە لەخوا ئەترسن ئێوە چۆن ئەیان پەرستن ئێوە چۆن داوایان لێ ئەكەن ، جا شێخ (فوزان) ئەلێ ئەم ئایەتە وتراوە (قیل إنها نزلت فیمن یعبد عزیرا والمسیح من الأنبیاء) وتراوە بۆ ئەوانە هاتۆتە خوارەوە كەوا ئەوانەی

[1]: سورة الأنبياء اية : ٢٦-٢٩
[2]: سورة الإسراء اية : ٥٧

كە عوزێریان ئەپەرست یاخود ئەوانەی كە مەسیحیان ئەپەرست پێغەمبەر عیساء (علیه الصلاة والسلام) یاخود (وقیل : نزلت في قوم كانوا یعبدون الجن فأسلم الجن) لەسەر كەسانێك ئەم ئایەتە هاتۆتە خوارەوە كەوا جنیان ئەپەرست جنۆكەكان موسلمان بوون كە موسلمان بوون چی ئەكەن بە تبیعەتی حاڵ عیبادەت ئەكەن پێش بركێی ئەكەن بۆ خوای تعالی كەواتە ئەوی ئەو كەسانەی كە ئەو هەموو جنە ئەپەرستن ئەمان بۆ خۆیان عیبادەتی خوا ئەكەن لەبرین لەو عیبادەتەی كە ئێوە بۆیان ئەكەن وە ئەوان پێش بركێی ئەكەن بۆنزیك بوونە لەخوای تعالی یە (ولم یعلم من یعبدهم من الإنس أنهم أسلموا) ئەوانەی لەئینسانەكان ئەیان پەرستن ئەم جنۆكانەیان ئەپەرست نەیانزانی كە موسلمان بوون وە خوای تعالی ئەلێت ئەوانەی ئێوە دەیان پەرستن لەغەیری خوا خۆیان عیبادەت بۆ خوا ئەكەن ئەو وەسیلەیەی كە خوا لێرەدا بەكاری هێناوە باسی كردوە یانی عیبادەت یانی عمەلەی صالح نەك وەسیلە بەو مانایەی طلبی شەفاعە ئاگادار بە كە لیمەی وەسیلەیە یەكێكە لەو چەواشاكارییانەی كە صۆفی و دەروێشەكان خەڵكی پێی گومرا ئەكەن ئەلێن وەسیلە پێغەمبەر وەسیلەمانە ﷺ یانی چی ئەمە واتا داوای لیّ بكەین ! وەسیلەیە ئەوە نیە وەسیلە تۆ عیبادەت كەی بچیتە پێشەوە بۆ لای خوای تبارك وتعالی (وقیل : نزلت في قوم كانوا یعبدون الجن فأسلم الجن ولم یعلم من یعبدهم من الإنس أنهم أسلموا ) ئەمە واوتراوە كە ئایەتەكان لەسەر ئەوانە هاتۆتە خوارەوە .

(والمقصود من ذلك أن الله ذكر أن المشركین الأولین منهم من یعبد الأصنام والأشجار والأحجار ومنهم من یعبد الأنبیاء والصالحین ، وسوى بینهم في الحكم وحكم علیهم بالكفر والشرك) خوای تعالی ئەفەرموویی موشریكانی پێشوو بەلیّ تێیاندا هەبووە دار و بەرد و ئەوشتانەیان پەرستوە ! وە تێشیاندا هەبووە پێغەمبەران و صالحینیان پەرستوە! وە خوای گەورە هەموویان لەیەك حوكم باس كردوە فەرقی نەكردوە لەنێوان ئەوانەی كەوا داوا لەپێغەمبەرێك بكات یان داوا لەبەردێك بكات هیچ جیاوازی نیە (وحكم علیهم بالكفر والشرك) وە ئەوانی كافر و موشریك كردوە (وأنت أیها المشبه ترید أن تفرق بین من عبد الأصنام ومن عبد الصالحین فتفرق بین ما جمع الله وهذا من المحادة لله سبحانه وتعالى) تۆش ئەتەوێت چی بكەی ؟! ئەتەوێت فەرق بكەی لەنێوان كەسێك كە عبدایەتی بۆ صەنم كردوە لەگەڵ

كەسێك كە عەبدایەتی بۆ پێغەمبەر كردوە نەخێر جیاوازی نیە عەبدایەتی هەر عەبدایەتیە إلا بۆ خوا ئەكرێت بۆ كەسیتر ناكرێت (هذا وجه رد هذه الشبهة حيث تبين أنه لا فرق بين شرك الأولين وشرك هؤلاء الذين يدعون الإسلام) ئاگادار بە شێخ (فوزان )ئەلێت چۆن ئەم شوبهەیە ڕەد ئەكەینەوە ئەلێن هیچ جیاوازی نیە لەنێوان شیركی ئەوەلین و شیركی ئێستا یەك جیاوازی نیە لەنێوانیان ئەوانەی إدعای ئیسلام ئەكەن یانی حوكم نادات بەموسلمان بوونیان ئەمەش ڕەدە بۆ ئەو تیَ نەگەیشتوانەی ئەمڕۆ كە ئەلیَ نا ئەوەی هاوار كاتە غەیری خواتعالی ئێمە ناتوانین پێی بلێن موشریك ئەلێن قولەكە شیركە بەس خۆی موشریك نیە دەی وەالله كاكە موشریكە فەرقی چیە لەگەل (ئەبو جهل) چ فەرقێكیان هەیە (وهم يعبدون القبور والأولياء والصالحين لأنهم لا يعرفون أن هذا شرك ، وهذه نتيجة الجهل بعقيدة التوحيد الصحيحة والجهل بما يضادها من الشرك فإن من لا يعرف الشرك يقع فيه وهو لا يدري ، ومن هنا تتضح ضرورة العناية بدراسة العقيدة الصحيحة وما يضادها. ) ئەبیَ ئاگادار بن ئەوانە كە إدعای ئیسلام ئەكەن لەكاتێكدا قەبر ئەپەرستن و پیاو چاكان ئەپەرستن پێغەمبەران و صالحین ئەپەرستن ئەوانە نازانن شیرك چیە ، ئایا بەم نەزنینەیان حوكمەكەیان لەسەر لائەچێت چەندجارمان باس كردوە كە شیرك بەنەزانین بیكەی و بەزانین بیكەی تۆ موشریكی (من وقع فى شرك وقع شيرك عليه) ئەمێنیتەوە سەر عەزابدان وەكو چەند جار باسمان كردوە ئایا ئەو كەسەی كە نەزانیت عەزاب ئەدرێی لەسەری ئەلێن نا إختبار ئەكرێی لەڕۆژی قیامەت ،ئەی ئەگەر زانی موعەزەب ئەبێت ئەما ئەو شەخصە موشریكە بەلیَ موشریكە جاهیل بیَ و غەیری جاهیل موشریكە و (أشركه) مانای نیە كابرا شیرك بكات و بلیَ موشریك نیە ! بلیَ (یا رسول الله) بلیَ وەالله ئەو كابرایە راستە وتویەتی (یارسول الله) شیركە بەس موشریك نیە چۆن موشریك نیە ؟! جا لەبەر ئەوە ئاگاداری ئەمە بن شێخ لەكۆتایەكەیدا ئەلێت (ومن هنا تتضح ضرورة العناية بدراسة العقيدة الصحيحة وما يضادها. ) كەواتە پێویستە لەسەر موسلمانان لەشیرك و لەتوحید بكۆلنەوە لەعیبادەت ئەم كەلیماتانە تعریف و پێناسەكەیانیان بەجوانی شارەزا بن ،ئیسلام بزانین ئیسلام چیە والله ئەو كەسەی نوێژبكا و علمانی بێت نە لەعلمانی تیَ گەیشتوە نە لە نوێژ تیَ گەیشتوە نە ئەمەیانە نە ئەمەیتریانە ئەگەر علمانیت نوێژی چی ئەكەیت ! ئەگەر نوێژئەكەیت بۆچی علمانیت ! نابیَ ئاخر ئەمە

شیرکە ئەمە ضلالەت و گومراییە تۆ لەئیسلام تێ نەگەیشتووی لە نوێژەکەت تێ نەگەیشتووی تۆ لەنوێژەکەت ئەلێت (إِيَّاكَ نَعۡبُدُ وَإِيَّاكَ نَسۡتَعِينُ)[1] یانی خوایە تەنها من عیبادەت بۆتۆ ئەکەم تەنها بۆتۆ عیبادەت ئەکەم تەنها لەتۆ ڕێنمایی وەرئەگرم کەچی دوایش ئەچی لەغەیری خوا ڕێنمایی وەرئەگرێت یانی ئەمە تناقضە ئەمەیان ئەمە هەلت وەشاندەوە تۆ ئیشەکەت بۆیە ئەبێ بزانیت ئیسلام چیە ! ئەبێ بزانیت شیرك چیە ! ئەبێ بزانیت بیدعە چیە ! ئەم تعریفات و پێناسانە لەشوێنی خۆی وەربگرە ئاگادار بە نابێ لەهەموو کەسێکی وەربگرێی کە نەزانی تەعریفەکەی چونکە ئێستا ئەوەتا لەموشریکین بپرسە بلێ شیرك چیە ؟! ئەلێ ئەوەیە کە تۆ سجدە بۆ صەنەمێك بەریت ئەوەیە شیرك لای ئەو ! ئەوە هەلەیە شیرك ئەوەیە کە عیبادەت بۆ غەیری خوا بکرێت ئەگەر پێغەمبەریش بێت ﷺ شیرك ئەوەیە کەتۆ ڕێنمایی وەرگریی لەغەیری خوای تبارك وتعالى ئینجا سەیرکەن خودی پێغەمبەر خۆی ﷺ خوای تعالى پێ ئەلێت (وَلَوۡ تَقَوَّلَ عَلَيۡنَا بَعۡضَ ٱلۡأَقَاوِيلِ ﴿٤٤﴾ لَأَخَذۡنَا مِنۡهُ بِٱلۡيَمِينِ)[2] پێغەمبەری خوا ﷺ شتێك بلێ کە خوا نەی وتبێ خوا ئینتقامی لێ ئەستێنی کەواتە خودی پێغەمبەر خۆی ﷺ گەیەنەرە بەس یانی ئەو ئەو فەرمانانەمان پێ ڕائەگەینێی کە خوا پێی داوە نەك لەخۆیەوە بێت شتێك بلێ بەکەیفی خۆی بەکەیفی خۆی نیە ! لەبەر ئەوە خوای تعالى پێ ئەفەرموێی (بَلِّغۡ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ)[3] ئەلێ ئەوەی بۆت هاتوە بەلاغی بکە بیگەینە ئەگەر نەیگەیەنی تۆ زالمی ئینتقامت لێ ئەستێنی خوای تعالى. کەواتە ئاگادار بین زۆر پێویستە تەعریفی شیرك و عیبادە وبیدعە و سوننە و فیسق ئەم تەعریف و پێناسانە لە شوێنی خۆی وەربگرین .

شوبهەی حەوتەم :

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ :( فإن قال) ئەگەر کابرای موشریك وتی (إنهم لم يكفروا بدعاء الملائكة والأنبياء ، وإنما كفروا لما قالوا : الملائكة بنات الله ، ونحن لم نقل : إن عبدالقادر ولاغيره ابن الله)ئەگەر کابرای موشریك کە هاوار ئەکات (یاعبدالقادر یارسول الله ﷺ) تۆ پێ ئەلێت ئەمە شیرکە ئەمە کوفرە ئەو بێت ئەم شوبهەیەت بۆ بهێنێت بلێ ئاخر

[1] : سورة الفاتحة اية :٥
[2] : سورة الحاقة اية : ٤٤-٤٥
[3] : سورة المائدة اية : ٦٧

رابردوان ئەوان کە داوایان لەمەلائیکە کردووە لە ئەنبیاء کردوە بەوە کافر نەبوون ! ئەلێ بەوە کافربوون کە وتوویانە مەلائیکە کچی خوان بەمە کافر بوون خۆ ئێمە نالێن (عبدالقادر) کوری خوایە یان غەیری ئەو کوری خوایە ! ئەمە شوبهەکەیانە !.

وەلامەکەی :

(فالجواب : أن نسبة الولد إلي الله تعالي كفر مستقل ) ئێمە باجارێی بزانین ئەمەی کە تۆ باسی ئەکەی بەوە کافربوون وتویانە ئەمە کچی خوایە ئەمە خۆی لەخۆیدا کوفرێکی موستقیل و سەربەخۆیە بەمە هەرکەسێك بلێ مەلائیکە یاخود صالحین یاخود ئەنبیاء کور و کچی خوان ئەمە بۆخۆی کافر بوو لەم لایەنەوە بەسەربەخۆیی بەبێ ئەوەی شتی تری بخەینە پالیدا (قال الله تعالى : قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ)[1] خوای گەورە بەپێغەمبەر دەفەرمووێت ﷺ تۆ بلێ ئەوە خوایە کەوا بێ نظیرە واتا هیچ کەسێك وەك خوا نیە (أَحَدٌ ) وەك وتمان واتا لەسیفاتەکانیدا کەس وەکو خوا نیە واحید واتا ذاتی یەکە بەس أحد واتا لەسیفاتدا کەس وەکو خوای گەورە نیە (والأحد : الذي لا نظير له) هاو وێنەی نیە خوای تعالى (ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ) خوای تبارك وتعالى جێ راز ونیاز و مەبەستەکانمانە ئێمە ئەو مەبەستمانە لەهەموو کردەوەکانمان لەهەموو داواکارییەکانمان هاوار و هانا بۆ ئەوئەبەین عیبادەت بۆ ئەو ئەکەین ئەو مەبەستمانە ، با سەیری ئەم ئایەتە بکەین ئەم ئایەتە کە خوای تبارك وتعالى کە باسی کردوە فەرموویەتی : خوای تبارك وتعالى تاك و تەنهایە خوای تعالى جێ گای مەبەستی عەبدەکانیەتی ئەلێ (والأحد : الذي لا نظير له ، والصمد : المقصود فی الحواج) واتا کەلیمەی أحد ئەوەی کە هاو وێنەی نیە ئەو خوایەی کە هاو وێنەی نیە وەك ئەو هەر نیە ! ئەو صەمەدیش ئەوەیە کە خەڵکی کردوویانە بەجێگای مەبەستی خۆیان لەوەی کەهاوار و هانای بۆ ئەبەن عیبادەتەکان بەتەنها بۆ ئەو دەگەرێنەوە ، شێخ ئەلێ :( فمن جحد هذا فقد كفر) هەر کەسێك ئائەمە ئینکاری بکات کافر ئەبێ کە بلێ خوای تبارك وتعالى بێ وێنەیە خوای تعالى جێ گەی راز و نیاز و مەبەستەکانمانە (ولو لم يجحد اخر السورة) ئەگەر سورەتەکەش ئینکاری نەکا بۆنمونە سەیری کەن سورەتەکە زۆر وردە ئاگادارین

[1] :سورة الإخلاص اية : ١-٢

لەسورەتەكەدا دوو شتی تێدا ئەبینیتەوە (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ)[1] لەدوایدا ئەلێت (لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ)[2] ئەوانە نالێن خوا مندالی هەیە برگەی یەكەم باسی مندالی كرد ؟! نەخێر ، برگەی دووەمی ئایەتەكە سەیركە (قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ۝١ ٱللَّهُ ٱلصَّمَدُ) ئەمە باسی ئەوە ئەكات كە خوای تبارك وتعالی ئەبێ بپەرسترێت نابێ كەسیتر بپەرسترێت لەو زیاتر ئەمە بۆ خۆیی كوفرێكی سەربەخۆ و موستەقیلە ئەگەر لە غەیری خوا زیاتر بپەرستی ، برگەیەكی تر (لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ) نە ئەوالادی هەیە نە وەلد ئەمەش برگەیەكی ترە ئێوە كەئەلێن ئێمە ئەلێن (عبدالقادر) كوری خوا نیە ئەوەیە كە ئەوانی پێ كافر بوون كە ئەیانوت مەلائیكە كچی خوان خۆ ئێمە نالێن (عبدالقادر ) كوری خوایە ! ئێمە ئەلێن راستە ئەوە بۆ خۆیی كوفرێكی سەربەرخۆیە كەواتان نەوتوە بەلاّم لەهەمان كاتدا چیتان وتوە و چیتان كردوە كێشەكەتان ئەوەیە كە هاوار ئەبەنە غەیری خوا ئەمەش كوفرێكی ترە كەواتە ئێوە ئەمە بە كوفر نازانن ! ئەمە خۆیی كوفرە ئەویتریشیان هەر كوفرە ! تۆ هاوار كردنە غەیری خوا بەعیبادەت ئەزانێ تۆ ئەمە ناویی ئەنێت وەسیلە ناوی ئەنێت تقرب ئەمە بۆخۆیی شیركە كەواتە بەبێ ئەوەی ئەوەش بلێت (ولو لم يجحد اخر السورة) واتا ئەگەر كابرا بلێت خۆ من نالێم ئەمە كوری خوایە ، ئەوەتا خوای گەورە ئەفەرمووێت ئەلێت كوری نیە (لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ)[3] تۆ جحدی ئەمە ناكەیت با جحدی ئەمەش نەكەیت بەس هاتوویت لەم لاوە هانات بردۆتە بەر كەسێك كە ئەوە بەشەرە و مخلوقە نابێ عیبادەتی بۆ بكەی خوای گەورە خۆیی عیبادەتی بۆ ئەكرێت ئەو صەمەدە ئەو جێگای راز و نیازەكانمانە ئەو شایەنی ئەوەیە كەتۆ هاواری بۆ بكەیت نەك (عبدالقادر) ئەوانیتر ، ئینجا دواتر شێخ ئایەتێكی تریان بۆ دەهێنیتەوە ئایەتەكە ئەگەر وردبیتەوە هەردوو شتەكەی تێدایە واتا هەردوو كوفرە سەربەخۆكەی تێدایە سەیركە (مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ)[4] ئەوانیش ئەلێن بەلێ خۆ ئێمە نەمان وتوە كەوا مندالی هەیە (مَا ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ مِن وَلَدٍ ) خوای تعالی مندالی نیە مندالی بۆخۆیی دانەناوە دووەم (وَمَا كَانَ مَعَهُۥ مِنْ إِلَٰهٍ)[5] پەرستراوێكی تری لەگەل نییە ! كەسێكیتری لەگەل نیە كە شایستەی ئەوە بێت كەوا

---

[1] :سورة الإخلاص اية : ١-٢

[2] : سورة الإخلاص اية :٣

[3] : سورة الإخلاص اية :٣

[4] : سورة المؤمنون اية : ٩١

[5] : سورة المؤمنون اية : ٩١

هاواری بۆ بکەیت ، کەواتە هەردوو برگەکەی تێدایە ئەوان برگەی یەکەم دانانین کە مندالەکەیە بەس برگەی دووەمیان دانا غەیری خوایان کرد بە (إله) تەبعەن تەواوی ئایەتەکە ئەلێت (إِذًا لَّذَهَبَ كُلُّ إِلَٰهٍ بِمَا خَلَقَ وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ)[1] جا ئەگەر وابوایە ئەگەر خوایەکی تری لەگەلدا بوایە هەریەك لەو خوایانە ئەچوون کێیان دروست کردوە ئەیان هێنا بۆخۆیان و مەملەکەتێکی تایبەتیان بەخۆیان دروست ئەکرد دوای ئەوە (وَلَعَلَا بَعْضُهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ) ئینجا تەبعەن بۆخۆتان ئەزانن گەورەکان هەموویان چاو لەویتر ئەبرێت ئەبێت خۆیی گەورە بێت ئەوان بەردەبوونە یەکتری و وە دونیا تێك ئەچوو ئەو لەوی ئەدا ئەو خوایە لەو خوایەی ئەدا کەواتە موستەحیلە خوای تبارك وتعالى یەك خوایە وە خەلقیش هەمووی هیی ئەوە وە پاشان ئەفەرموویێت : (سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يَصِفُونَ)[2] خوا زۆر لەوە خاوێنترێکە ئەوان ئابەم شێوەیە وەسفی دەکەن شیرك ئەدەنە پالّی ، کەواتە لێرەدا چەند شتێکمان بۆ دەر ئەکەوێت :

یەکەم: ئەوەی کە خەلّق ئەکات ئەبێت بپەرسترێت مەخلوق ناپەرسترێت .

دووەم: ئەوەی کەوا خەلق ئەکا رێنمایم ئەکا ئەوەی مخلوقە نابێ رێنمایی من بکا بەوەی بێت دەستور و یاسام بۆ دابنێت .

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ : (ففرق بين النوعين) واتا خوای تعالى هەردوو نەوعەکەی جیاواز خست واتا جیاوازی خستە نێوان هەردوو نەوعەکەوە کە هەردووکیان شیرکن :

*جۆری یەکەم : ئەوەیە کەوا خوای تبارك وتعالى مندالی نیە .

*جۆری دووەم : (إله) یّکی تر و پەرستراوێکیتری لەگەل دا نیە .

(ففرق بين النوعين وجعل كلا منهما كفرا مستقلا) هەریەك لەو دوو کوفرەی کرد بە کوفری سەربەخۆ واتا بەهەر یەکێکیان تۆ کافر ئەبی هەتا ئیمانیشت وابێ کەخوا مندالی نیە بەس کە ئیمانت وابوو خوا (إله)ێکیتری لەگەلدایە (إله) بەمانای خالق نا بەلّکو بەمانای (مألوء ،معبود ) بەمانای پەرستراو بەقسە کراو عیبادەت بۆ کراو رێنمایی لێوەر گیراو ئەگەر تۆ ئەو

[1] : سورة المؤمنون اية : ٩١

[2] : سورة المؤمنون اية : ٩١

ئیعتقادەت هەبێ کافر ئەبی کەواتە هەردووکیان کوفری موستەقیلن ، پاشان دێتە سەر ئایەتێکی تر (قال تعالى : وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ ٱلْجِنَّ وَخَلَقَهُمْ وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَـٰتٍۭ بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ)[1] خوای گەورە ئەفەرموێت کافرەکان (وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ) هاتن شەریکیان بۆ خوا دانا شورەکائەکان کێ بون (ٱلْجِنَّ) جنیان کرد بە شەریکی خوای تعالی لەکاتێکدا (وَخَلَقَهُمْ) خوای تعالی ئەو جنانەی دروست کردوە کەواتە مخلوق چۆن ئەبێ بپەرسترێت یان خوای تعالی موشریکەکان و جنەکانیشی دروست کردوە چۆن ئەبێ مەخلوق بپەرسترێت کەواتە ! (وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَـٰتٍۭ) هاتن درۆیان بەست بەخواوە کەوا کچ و کوریان بۆ دانا عیسا کوری خوایە و مەلائیکە کچی خوایە ! پەنا ئەگرین بەخوا (بِغَيْرِ عِلْمٍ ۚ) بەمەرجێکیش هیچ زانیاریان بەمە نیە هەر ئفك و درۆیە هەلبەستراوە قسەکەیان خۆ نەهاتوە دەلیلێك و بورهانێك و سولتانێکیان بەدەستەوە بێ کەوا بلێ بەلێ ئەم شتە وایە ئێمە لە لەوحل مخفوظدا بینومانە یاخود خوا عیلمێکی بەئێمە داوە ئێمە لەوێوە ئەمە مان وتوە بۆیە ئەفەرمووێی (سُبْحَـٰنَهُۥ وَتَعَـٰلَىٰ عَمَّا يَصِفُونَ)[2] خوای گەورە خۆیی لەوە خاوێن ئەکاتەوە خوا خاوێنە لەوەی کەوا شەریکی هەبێت و کوری هەبێت لەوەی کەوا زولم بکات لەوەی کەوا نوقسان بێت هەروەها شێخ ئەفەرمووێت (ففرق بين الكفرين) خوای تعالی لەم ئایەتەشدا فەرق و جیاوازی کرد لەنێوان هەردوو کوفرەکەدا دوو کوفرەکەش بریتیە لەوەی سەیریکەن (وَجَعَلُوا۟ لِلَّهِ شُرَكَآءَ)ئەوە کوفری عیبادەیە ئەوە شیرکی عیبادەیە (شُرَكَآءَ) هات شەریکی بۆخوا دانا (وَخَرَقُوا۟ لَهُۥ بَنِينَ وَبَنَـٰتٍۭ) ئەوەش کوفرەکەیترە کەوا کور و کچیان بۆخوا داناوە کەواتە ئەمە رەددانەوەیەکی زۆر بەهێزە لەلایەن شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) بۆ ئەو کەسانەی کەوا ئەلێن خۆ ئێمە نالێن مەلائیکە کچی خوایە بەس ئەوان شەفاعەتیان هەیە و داوایان لێ ئەکەین ئەو داوا لێکردنەش خۆی لەخۆیدا کوفرێکی سەربەخۆیە ئەگەر چیش نەلێت مەلائیکە کچی خوایە والعیاذبالله ، پاشان ئەلێ (والدليل علي هذا أيضا: أن الذين كفروا بدعاء اللات) بەلگە لەسەر ئائەمە ئەوەیە کەوا کافرەکان بەوە کافربوون (أن الذين كفروا بدعاء اللات مع كونه رجلا صالحا لم يجعلوه ابن الله) باشە ئەوانەی لاتیان پەرست قەت بیستوتانە بلێن لات

[1] : سورة الأنعام اية :١٠٠

[2] : سورة الأنعام اية :١٠٠

کوری خوایە ! کەواتە قورەیشەکان کەلاتیان ئەپەرست بەوە واتایە لاتیان ئەپرست هاواریان بۆ ئەکرد با خەڵك لێ تێك نەچێ پەرستن بەومانایە بێت کەوا وایان زانێ بێت لات دونیایی دروست کردوە (لات مخترع مبدع) نا ئەوان ئەیانوت مخلوقە بەڵام شەفاعەتی هەیە لەلای خوای تعالی و جاهی هەیە لەلای خوای تعالی بۆیە ئێمە ئەو ئەکەین بە تکاکار لەلای خوای تعالی ئەمەش عیبادەتە ئەم عیبادەتەش شیرکە پەنا ئەگرین بەخوای تعالی ،ئایا ئەمان وتیان ئەوانە کوری خوایە !؟ نەخێر، کەواتە بەشی یەکەمی عیبادەتەکەیە کە پێ کافربوون (و لم يجعلوه ابن الله، والذين كفروا بعبادة الجن لم يجعلوهم كذلك) ئەوانەشی کە کافربوون بەجن ئەپەرستن و داوایان لێ ئەکرد خۆ نەیان وتوە جن کوری خوایە وایان نەوتوە ، کەوتە ئەبێ ئاگاداربین ئەم شوبهەیە زۆربەشێوەیەکی جوان شێخ ڕەدی داوەتەوە هەر کەسێکیش ئەمرۆ ئەم شتەی وت .

(وكذلك العلماء أيضا في جميع المذاهب الاربعة) لێرەدا دێتە سەر إجماع کەواتە ئەدیلەی بۆ هێناین بەقورئان و بەواقیعی کوفار لەزەمانی خۆیاندا وە إجماعی ئەهلی عیلم ئەهێنیتەوە (في جميع المذاهب الاربعة) إجماعەکەش بریتیە لەوەی (يذكرون في باب حكم المرتد أن المسلم إذا زعم أن لله ولدا فهو مرتد، وإن أشرك بالله فهو مرتد ) هەموو زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی هەرکەسێك بلێت خوا مندالی هەیە مورتەدە لەکیتابی فقهی لەبابی ریدەدا باس ئەکا (فهو مرتد فيفرقون بين النوعين ، وهذا في غاية الوضوح) مانای چی (فيفرقون بين النوعين) فەرق ئەکەن لەنێوان ئەوەی کە بلێن خوا مندالی هەیە کە کوفرێکی سەربەخۆیە وەلەنێوان ئەوەشی کە تۆ هاوار بەریتە غەیری خوای تعالی کە ئەویش هەر کوفرێکی سەربەخۆیە ئەمەش زۆر ڕۆشەن و ئاشکرایە .

شوبهەی هەشتەم :

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) ئەلێ (وإن قاللك)ئەگەر ئەو موشریکە هات بەتۆیی وت ، ئەوەی کەهاوار دەکا بۆ غەیری خوا و نەزر بۆ غەیری خوا ئەکا ئیتر چ ناوێك لەخۆی دەنی دەرویش وصۆفی هەرناوێك بێ هاتوو بەتۆی وت و ئەم ئایەتەی بۆ هێناویتەوە (أَلَآ إِنَّ أَوۡلِيَآءَ

ٱللَّهِ لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ )[1] دیت بەشوبهەی ئەوە بۆت دیت و بۆت ئەهێنیتەوە کەوا جاهیان هەیە وە ئەمانە لەلای خوای تعالی ڕێزیان هەیە قەدریان هەیە کەواتە چۆن ئەبێ ئەمانە نەکەین بەتکاکار(أَلَآ إِنَّ أَوْلِيَآءَ ٱللَّهِ) (أَوْلِيَآءَ)جەمعی وەلییە دۆستانی خوا ئەوانەی بەقسەی خوا ئەکەن ئەوانەی تەقوایان هەیە (لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ) واتا کاتێك ئەمرن لەبەروو چونیان بۆ ڕۆژی قیامەت بۆ بەرزەخ هەتا ئەگەنە بەهەشت (لَا خَوْفٌ عَلَيْهِمْ) واتا خوای تعالی جاریکیتر نایان ترسێنێت نارەحەتیان ناکات ئەو ترسەی کە لەدونیادا کە لەدلیان کۆببویەوە کە لەخوای تعالی ئەترسان بۆ ئەوەی عەزابیان بات ئیتر خوای گەورە ئەو ترسەیان لەسەر لا ئەبات مەترسن تەواو بەرەو ڕەزامەندی خوا و بەهەشت ئەڕۆن (وَلَا هُمْ يَحْزَنُونَ ) ئەمانە غەم وپەژارە روویان تێ ناکات لەجێ هیشتنی کەس و کارو خیزان ومندالیان خوای گەورە یارمەتیان ئەدا خوای گەورە سەرپەرشتیان ئەکا. (فقل هذا هو الحق) جا تۆش بلێ منیش ئەلێم ئەوە حەقە ئەولیای خوای تعالی وان ئێمە ئیمانیمان بە ئەولیاء هەیە با ئەوانە نێن بلێن والله ئێمە باوەرمان بە ئەولیاء کانی خوا نیە وە خەلکمان لەدژ کۆبکەنەوە بلین دژی کەرامەتن ودژی ئەولیاکانن نەخێر ئێمە باوەرمان پێ یانە (ولكن لا يعبدون)بەلێ ئەوانە راست بەلام ئەوانە (يعبدون الله لا يعبدون) ئەوانە خوایان پەرستوە نەك ئێمە بیان پەرستین ئێوە داوامان لێ ئەکەن کە بیان پەرستین بەم ئایەتە ئەم ئایەتە ئەوە ناگرێتەوە بەڵکو بەپێچەوانەوە تەواو ئایەتەکە ئەفەرمووێی (ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَكَانُوا۟ يَتَّقُونَ )[2] (يَتَّقُونَ ) واتا (يعبدون الله سبحانه وتعالى) ئی کەسێك خۆیی خوا بپەرستێت چۆن ئەبێ بپەرسترێت ! (ونحن لم تنكر الا عبادتهم مع الله وشركهم معه)ئێمە تەنها ئەوەندەمان باسکردوە وتوومانە لەگەل خوادا مەیان پەرستن ئێوە کردووتانن بەشیرك لەگەل خوادا لەعیبادەتدا (والا فالواجب عليك حبهم واتباعهم والاقرار بكرماتهم)واجبە لەسەر هەمووماد ئیمانمان هەبێ بەکەرامەت . کی هەیە لەموسلمانان ئیمانی نەبێ کەوا مەریم یەکیکە لەو کەسانەی کەوا ڕێزی هەبوە لەلای خوای تعالی و کەرامەتیشی پێشکەش کردوە ئەوەتا خواردنی بۆهات زەکریایەکی

[1] :سورة يونس اية : ٦٢

[2] : سورة يونس اية : ٦٣

پێغەمبەر پیێ ئەلیێ ئەمت لەکوێی بوو ئەلیێ لەلایەن خوای گەورە بۆم هاتووە ! چۆن بڕوامان بەکەرامات نیە کەرێزێکی خوایە لەمتەقین ئەیەنێت لەوانەی کەوا بەقسەی خوا ئەکەن لەوانەی کەوا سەمع و طاعەیان بۆخوا هەیە (ولا يجحد) ئینکاری ناکات (كرامات الاولياء الا أهل البدع والضلالات)یەکسەر خۆت بەریی بکە پێیان بلیێ ئەوەی کەوا ئینکاری کەراماتی ئەولیاء ئەکا ئەهلی بیدع و زیغ و ضلالە لەخواریج و معتزیلە تەبعەن خواریج و معتزیلە بڕوایان بەکەراماتی ئەولیاء نیە (ودين الله وسك بين طرفين) دینی خوای تعالی دائیمەن لەنێوان دوو تەرەفی (غالی وجافی )دایە لەنێوان توندرەوان وە لەنێوان ئەوانەی کەوا بەرئەدەن .

باسی نێوانەکان بکەین : دائیمەن لەکتابە عقائیدەکان هاتووە ئەلێن : ئەهلی سوننە لەنێوان مرجیئە و خوارج دایە ، لەنێوان جەبرییە و قەدرییە دایە لەنێوان نواصیب و رافزەدایە سەیرکەن نێوانەکان زۆرن کە ئەملا بەریداوە ئەویتر توند رەویی تێدا کردوە (والا فالواجب عليك حبهم واتباعهم والاقرار بكرماتهم ،ولا يجحد كرامات الاولياء الا أهل البدع والضلالات، ودين الله وسك بين طرفين ، وهدي بين ضلالتين) هودایە ڕێنمایە لەنێوان دوو گومرایەت دا گومرایی توند رەوان و ئەوانەی دین بەرئەدەن (وحق بين باطلين)حەقە لەنێوان دوو باطلدا.

## (إثبات أن شرك الأولين أخف من شرك أهل زماننا)

(الأمر الأول : أن شرك الأولين إنما يحصل في حال الرخاء)

شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) دەفەرمووی : (فإذا عرفت أن هذا الذي يسميه المشركون في زماننا كبر الاعتقاد هو الشرك الذي نزل فيه القرآن وقاتل رسول الله ﷺ الناس عليه فاعلم أن شرك الأولين أخف من شرك أهل زماننا بأمرين) ئەلیێ بزانە ئەمەی کە ئەمڕۆ موشریکەکان مەبەستی پیێ ئەوەیە کە ئەلێت (يارسول الله ﷺ) بانوێژ وو ڕۆژوو عیبادەتیش بکا ئەوە وەرناگیرێت لەلای خوادا و بەطابوویەوە (لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ)[1] ئەوەی کە مەڕۆ موشرکینی زەمانی ئێمە شێخ باس ئەکات ناویان ناوە (كبر الاعتقاد)مەبەستی ئەم إعقتادە

[1] :سورة الزمر اية ٦٥

ئەوەیە كەوا موشریكەكان صۆفیەكان دەروێشەكان ناویان ناوە بیرو بروای گەورە یان بیروبروا ئەمە مەبەستەكەیان بریتیە لەوەی كەوا بیروبروا لەسەر دوو بەشە لای ئەوان :

*لەلایەك ئەڵێن خوا خالقە (واتا ئەشعەریت كە دێتە پێشەوە بۆ لا الا الاالله تەفسیری ئەكا ئەڵێ (لاخالق ، لا مبدع، لامخترع الا الله) لەبەر ئەوە هەركەسێك بڵێ من ئیمانم هەیە خوا دونیای دروست كردوە لەلای ئەوان موسلمانە و ئیماندارە ! بەس لە ئەهلی سوننە وانیە لەئەهلی سوننەدا ئەڵێ ئەبێ ئەوەشت هەبێ بەلام لا الە بەمانای (مألوە ،مبعود ،موطاع )دێت ئەبێ تۆ بەقسەی بكەی ئەبێ ڕێنمایی لێ وەربگریت ئەبێ تۆ عیبادەتی بۆ بگەڕێنیتەوە ئەگەر تۆ وانەكەی ئیمانیشت وابێ كە خوای تعالی دونیای دروست كردوە هەر موشریكی خەلك لەوانیە بەلایەوە سەیربێ ئەڵێن بەلاتانەوە سەیر نەبێ شیتان ئیمانی وایە كەخوا دونیای دروست كردوە هەروەها (ئەبو جهل) و جەماعەتەكەی ئیمانیان وایە كەوا خوای گەورە دونیای دروست كردوە بەڵام لەكاتێكدا كە موشریك بوون بەچی موشریك بون بەالالوهیەتەكە بەوەی كە خوای تعالی ناپەرستن و عیبادەتی بۆ ناگەڕێنەوە و ڕێنمایی لێ وەرناگرن ، كەواتە ئەمە رەئی ئەكەم بوو كەوا باوەریان وایە كەوا خوا دونیا دروست كردوە .

*دووەم :(إعتقادهم فى الاولیاء ) ئەوە إعتقادە كبیرەكەیە كەوا باسكراوە كە ئەڵێن ئەبێ بیروبروای گەورە لەلای ئەواندا ئەوەیە كەوا بروات هەبێ بەو پیاو چاكانە كەوا داواكەی تۆ نقل ئەكەن بۆلای خواتعالی ئەمە لەخوێن و گۆشتیاندایە ئەم بیروبروایە چۆن خوای گەورە باسی قەومی موسا ئەكا ئەڵێت (وَأُشْرِبُوا۟ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْعِجْلَ)[1] عیبادەتی عیجل چووبویە ناو خوێن و گۆشتیانەوە خواردبوویان و لەهەموو گیانیان رەنگی دابوویەوە لەلای صۆفی و دەروێشیش هاواركردن بۆ پیاو چاكان لەخوێن و گۆشتیاندایە نایەتە دەرەوە لەبەر ئەوە هەركەسێك دژی ئەوە بجولێتەوە سەرسەخت ترین كەسن بەرامبەری ئەها خوای گەورە ئەفەرمووێی (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا۟)[2] ئێستا صۆفی و دەروێش بەدەستیەوە بێ هەركەسێك لەلای ئەوان بلێت ئەولیاء ئەو دەستەلاتەی

---

[1] : سورة البقرة اية :٩٣

[2] : سورة المائدة اية ٨٢

نیه كه ئێمه داوای لێ بكەین نابێ داوای لێ بكەین ڕاستەوخۆ ئەتكوژێت لەناوت ئەبات چونكه ئەو بیروبراو إعتقادی گەورەیه لەلای ئەواندا بۆیه ئەلێت (فإذا عرفت أن هذا الذي يسميه المشركون في زماننا كبر الاعتقاد هو الشرك الذي نزل فيه القرآن) ئینجا باشبزانه ئەی موحید ئەی یەكخوا پەرست ئەمه ئەو شیركەیه كەخوا جل وعلا قورئانی ناردە خوارەوه و فەرمووی شیركه ئەمه یەك ، وەدووەم (وقاتل رسول الله ﷺ الناس عليه) پێغەمبەری خوا ﷺ لەسەر ئەوه قیتالی لەگەل خەلك كرد بۆیه ئەیفەرموو (أمرت أن أقاتل الناس حتى يشهدوا أن لا إلـه إلا الله وأن محمد رسول الله، ويقيموا الصلاة ، ويؤتوا الزكاة)[1] ئەگەر ئەمه بكەن (فإذا فعلوا ذلك عصموا مني دماءهم وأموالهم إلا بحق الإسلام ، وحسابهم على الله تعالى)[2] كەواته پێغەمبەری خوا ﷺ ڕانەوەستاوه لەسەر هیچ كەسێك كەوا ئەگەر بێتوو داوای غەیری خوا كردبێت ئەمری پێكراوه لەلای خوا ملی لێبكەرەوه ، ئینجا بەداخەوه زۆر له كەسانی گێل و گەمژه ونەزان و نەفام دێن باسی ئەوەمان بۆ ئەكەن والله دینی ئیسلام باسی شمشێری تێدا نیه بەرنامەیەكم بیست بەناو ئیسلامیەك موناقەشه ئەكات لەسەر ڕادیۆیەكی عیلمانی ئەلێ بەحیسابی خۆی دیفاع له ئیسلام ئەكا ئەلێ كاكه وەره بەس كەلیمەی سیفم لەقورئان بۆ دەربێنه بزانه لەقورئان هاتووه ! ! علمانیەكه زیرەكتر بوو وتی ئەیٚ نافەرمووی وقاتلهم ، ئەی قیتال به سیف ناكرێت ! لەبەر ئەوەی ناوی سیف نەهاتوه ئەی كەی بەحوجه كه لەئیسلامدا نیه ! ! ئەی ئەوه نیه ئەلێ وقاتلهم ئەو لەو شارەزاتر بوو ، هەی بێ عقل كەوا شەرم ئەكەی باسی كوشتار بكەی لەپێناوی خوا خوای تعالی جیهادی لەچەند شوێن لەقورئاندا باسكردوه هەتا سورەتێك هەیه لەقورئاندا كه ناوی (محمده)علماء ئەلێن ناوێكی تری پێ ئەلێن (قیتال)تۆ بۆ شەرم ئەكەی لەوه ئەی پێغەمبەر ﷺ قیتالی نەكرد لەبەدر دا ئەی لەئوحدا نەیكرد ! ئەی لەخەندقدا نەیكرد ! ئەی نەچوو فتحی مەكه بكا ئەگەر قیتالیانی بكردایه ملی پان دەكردنەوه ئەی خوای تعالی نافەرمووێی (وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيٍّ قَاتَلَ مَعَهُ رِبِّيُّونَ كَثِيرٌ)[3] ئەی خوای گەوره نافەرمووێی (وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّى لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ

[1]: رواه الشيخان البخاري ومسلم في الصحيحين

[2]: رواه الشيخان البخاري ومسلم في الصحيحين

[3]:سورة ال عمران اية : ١٤٦

﴿وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِ﴾[1] بەداخەوە کەوا قیتال یەکیکە لەگەورەترین عیبادات ئێستا بوە بەوەی کەوا شەرم بکەی کەوا باسی بکەیت بۆتە بە جەردەیی و ڕێگری ئەوەتا هەرکەسێك لەپێناوی خوادا شەربکات پێ ئەلێن جەردە ئەی ئەوەی لەپێناوی هەوا و ئارەزوو ئەوە لەلای ئەوان پاڵەوانە لەلای ئەوان شۆرشگێرە و نیشتمان پەروەرە پەنا ئەگرین بەخوا لەسەر خوا شەر بکە جەردە و پیاو خراپی بەس لەسەر هەوا و ئارەزوو لەسەرهەرشتێکی تر غەیری خوا تعالی تۆ پاڵەوانی ئەوە میزانی ئینسانە گومراو سەرلێشواکانە میزانی خوای گەورە نیە ، ئەمە ئەوە بوو کە پێغەمبەری خوا ﷺ قیتالی لەسەر کرد (فاعلم أن شرك الأولين أخف من شرك أهل زماننا بأمرين) ئینجا ئەلێت کە ئەمەت زانی بزانە باسی شتێکمان بۆ ئەهێنتە بەرچاو کەوا باسی کردوە لە کیتابی (القواعيد الاربعه) لێرەش باسی ئەکاتەوە پێمان ئەلێ لەدوو لایەن کەوا شیرکی موشریکی زەمانی پێغەمبەر ﷺ شیرکەکەیان خفی تر بوە لەوەی ئێستا لەدوولایەن :

یەکەم :(أحدهما : أن الأولين لا يشركون ولا يدعون الملائكة والأولياء والأوثان مع الله إلا في الرخاء) واتا ئەوانەی کەوا هاواریان کردوە لەکاتی خۆشیدا هاواریان کردووە لەکاتیکدا کەوا موشکیلەیان نەبووە لەوکاتانەدا داوایان لە خوا و لەویش کردوە (وأما في الشدة فيخلصون لله الدين) بەس بکەوتبانایە شیدە و ناخۆشی بەهیچ شێوەیەك باسی کەسیتریان نەئەکردو هاواری کەسیتریان نەئەکرد لەخوای گەورە زیاتر ، دەلیلیش بۆ ئەمە (كما قال تعالى: ﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُ ۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمْ إِلَى ٱلْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ كَفُورًا﴾)[2] ئەگەر لەبەحردا توشی ڕەشەبا و مەوجی گەورە بوون کەوا بخنکابانایە بزر ئەبوو ئەوەی لەکاتی ووشکانیدا داوایان ئەکرد إلا خوا نەبێ وە لەبەحردا تەنها داوای خوایان ئەکرد وە لەکاتیکدا کەوا خوا ڕزگاری کردن ئەوانی خستە وشکانی هەشتان شیرکیان کردەوە وە بەڕاستی ئینسان کافرە بەڕاستی ئینسان ئیمانی لادەبات ئیمانی دادەپۆشیت بەو کوفر و شیرکەی کەوا دەیکات . وە ئایەتیکی ترمان بۆ دەهێنێتەوە ﴿قُلْ أَرَءَيْتَكُمْ إِنْ أَتَىٰكُمْ عَذَابُ ٱللَّهِ أَوْ أَتَتْكُمُ ٱلسَّاعَةُ أَغَيْرَ ٱللَّهِ تَدْعُونَ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ۝٤٠ بَلْ إِيَّاهُ تَدْعُونَ فَيَكْشِفُ مَا تَدْعُونَ إِلَيْهِ إِن

[1] : سورة الأنفال اية :٣٩
[2] : سورة الاسراء اية :٦٧

شَآءَ وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ)[1] تۆ برۆ پێیان بلێ ئەی محمد ﷺ ئەگەر عەزابی خواتان بۆ هات بۆنمونە لە بەحردا ئەوە عەزابیك دێت خەریكە لەناو ئەچن یان لەهەرشوێنیكتر كەوا توشی شیدەت و ناخۆشی دەبن (أَوۡ أَتَتۡكُمُ ٱلسَّاعَةُ ) یان ڕۆژی قیامەت بێ (أَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَدۡعُونَ) لەغەیری خوا داوا ئەكەن ! (إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ) یانی ئەگەر ئێوە موحقن ڕاستگۆن لەوەی كە ئێوە ئەلێن ئالیهەتەكانتان كە ئێوە دەیپەرستن لەغەیری خوا سودتان پێ دەگەینێت ، (بَلۡ إِيَّاهُ تَدۡعُونَ) نەخێر وانیە بەلكو لەوكاتەدا ڕاستەوخۆ داوا لەخوا ئەكەن عیبادەت بۆ ئەو ئەكەن (فَيَكۡشِفُ مَا تَدۡعُونَ إِلَيۡهِ) تدعون هەردەم لەقورئاندا بە دوو مانادیت بەمانای داوا لێ كردن و بەمانای پەرستن ،

لەمانای داوا لێكردن كاتێك كە لەبەحردا بوون داوایان لێكرد ،ئەی ئەگەر ڕۆژی قیامەت بێ سەیری هەموو ئایەتەكان بكە موشریكەكان لە ڕۆژی قیامەتدا ئەلێن والله خوایە ئێمە موشریك نین (قَالُوٓاْ ءَاذَنَّٰكَ مَا مِنَّا مِن شَهِيدٖ)[2] پێت ئەلێن والله كەوا كەس شایەتی نادا لەئێمە كەوا تۆ شەریكت هەیە ! لەوێشدا ئەلێن یەكخوا ! هەتا كافریش دەبن بەوەی پەرستویانە لەوێدا ئەبن بە تكفیری لەوێدا تەكفیری طاغوتان و ملهوران دەكەن كەوا بەقسەیان كردوون لەغەیری خوای تعالی یان ئەوانەی كە پەرستوویانن لەغەیری خوای تعالی دەلێن نەخێر ئێمە نەمان كردوە لەوێدا خۆیان بەری ئەكەن ئێستا خۆت بەری بكە بارزگارت بێ بۆیە خوای تعالی ئەفەرمووی لەڕۆژی قیامەتدا ئێوە تەنها داوای خوا ئەكەن (وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ) بیرتان ئەچێتەوە ئەوەی كردووتە بەپەرستراوی خۆت ئەوەی هاوارت بۆ ئەكرد ئەوەی بەرنامەت لێ وەرئەگرت ئەلێ ڕێبازەكەم ڕێبازی فلانە ! لەڕۆژی قیامەت نامێنی ئەمە بەس خوای تعالی ڕزگارم بكا باسی كەس ناكەم ! (وَتَنسَوۡنَ مَا تُشۡرِكُونَ) هەر لەبیرتان ئەچێتەوە چونكە مەیدانەكە مەیدانێكە كەس بەفریای كەس ناكەوێی (وقال تعالی: وَإِذَا مَسَّ ٱلۡإِنسَٰنَ ضُرّٞ دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ)[3] ئەگەر ئینسان توشی ناخۆشی ببێت لەوكاتەدا (دَعَا رَبَّهُۥ مُنِيبًا إِلَيۡهِ) داوا لەپەروەردگاری ئەكا وە ئەمەش هەمووی باسی ئەو ئینسانانەی كەوا لەزەمانی پێغەمبەردا

[1] :سورة الانعام اية :٤٠-٤١
[2] :سورة فصلت اية :٤٧
[3] :سورة الزمر اية :٨

بوون ﷺ یان پێش ئەو بوون داوا لەخوا ئەکا تەبعەن هەشە لێرە کەوا توشی ناخۆشی دەبێ داوا لەخوا ئەکا بەڵام کاتێك رزگاری ئەبێ ئیتر خوای لەبیر ئەچێتەوە بەڵام ئێمە لە بەحسی ئەوەدەیان کەوا دەلیل بۆئەوە ئەهێنینەوە کەوا ئەوان لەکاتی شیدەو ناخۆشیدا تەنها داوایان لەخوا ئەکرد بائایەتەکە هەمووی تەواو کەین (ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةً مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ)[1] (ثُمَّ إِذَا خَوَّلَهُۥ نِعۡمَةً مِّنۡهُ نَسِيَ مَا كَانَ يَدۡعُوٓاْ إِلَيۡهِ مِن قَبۡلُ) ئەگەر خوای گەورە لەو نارەحەتیەدا رزگاری بکات و نیعمەتی بداتی لەبیری ئەچێ کەوا کاتێك داوای لەخوا کردوە و دێت شەریك پەیا ئەکات (وَجَعَلَ لِلَّهِ أَندَادٗا ) دێت هاووێنە بۆ خوا دا ئەنێت پەرستراوی تر بۆ خوا دائەنێت لەبەر ئەوەی (لِّيُضِلَّ عَن سَبِيلِهِۦۚ) بۆ ئەوەی لەرێگای خوای گەورە سەرلێشواو ئەبێ و تووشی شیرك و گومرایی ئەبێ خوای تعالی پێ ئەفەرمووێ (قُلۡ تَمَتَّعۡ بِكُفۡرِكَ قَلِيلًا) رابوێرە لەدونیادا چەندی زۆریش بێ هەر قلیل و کەمە ئاگادار بە لەبەر ئەوەی تەواو ئەبێت ئەوشتەی تەواو ئەبێ کەمە با هەرچەندیش بێ (إِنَّكَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِ) ئینجا تۆ لە ئەصحاب و هاودەم و هاورێیانی ئاگریت بۆ هەتا هەتایی تێدا ئەبیت ، (وقال تعالى: وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوۡجٞ كَٱلظُّلَلِ دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ)[2] (غَشِيَهُم) واتا (عادتهم الامواج) واتا مەوجی بەحر بەسەریاندا بێت لەبەحردا کابرا لەکەشتیەکدایە لەکاتێکدا ئەزانێ رەهێلە و بایەك دێت موجەکە بەرزئەکاتەوە خەریکە ئەیکا بەسەریاندا (كَٱلظُّلَلِ) واتا وەکو هەور وەکو چیا ئا ئەو مەوجە گەورانەی بەحر کاتێك خەریکە بیخات بەسەریاندا (دَعَوُاْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ) ئەگەر تووشی ئەوە ببونایە یەکسەر ئەیان وت خوایە رەحمان پێ بکەیت واتا هەموو کەسێکیان بیر ئەچویەوە ، با لەحالەتی ئەمرۆمان وەکو نمونە بهێنینەوە کاتێك کۆمەلیك لەناوسەیارەیەکدا بن کاتێك سەیارەکە خەریکە وەربگەرێت زۆرینەیان ئەلێن یا غەوسی گەیلانی هاوار یا رسول الله هاوار پەنا بەخوای گەورە کەس نالێ یا الله هاوار إلا موحید و یەکخوا پەرست دەلێت یا الله لەکاتی

[1] :سورة الزمر اية :٨
[2] :سورة القمان اية :٣٢

خۆشیشدا ئەوە هەر هیچ ئەوە زیاتر ئەلێن بۆیە شێخ دەفەرمووێی موشریکینی ئەوزەمانی شیرکەکەیان ئەخفتربوون لە هی ئێستادا .

شێح (صالح) ئەلێ :

(يقول الشيخ رحمه الله : إذا عرفت مما سبق أنه لا فرق بين شرك أهل الجاهلية الذي نزل فيه القرآن والذي قاتل رسول الله ﷺ وأصحابه وشرك هؤلاء المنتسبين إلى الإسلام من عباد القبور وأصحاب الطرق الصوفية المنحرفة ونحوهم لا فرق بين شرك هؤلاء وهؤلاء إلا في الاسم) ئەمەت بۆ دەرکەوت کەوا جیاوازی نیە لەنێوان شیرکی ئەهلی جاهیلیدا وە قورئان هاتە خوارەوە و بەموشریك ناوی بردن پێغەمبەرﷺ قیتالی لەگەل کردن وە شیرکی ئەمانەی ئەمرۆ کەوا خۆیان ئەدەنە پال ئیسلام شێخ پێ ئەلێ شیرك وە پێشی ئەلێ موشریك ئەلێ هیچ جیاوازیەك و فەرقێك نیە ئەصحابی تروقی صۆفی و منحەریف ئەوانەی کەوا لایانداوە لە دینی راستەقینەی خوای تعالی لەتەوحید (لا فرق بين شرك هؤلاء وهؤلاء) هیچ جیاوازیەك و فەرقێك نیە (إلا في الاسم) تەنها لەناوەکەیدا نەبێت (حيث يسمونه الاعتقاد فقط) ئەمان ناویان ناوە إعتقاد هی ئەوان شیرکە (فاعلم أن شرك هؤلاء المتأخرين المنتسبين إلى الإسلام أشد وأغلظ من شرك المتقدمين من أهل الجاهلية من وجهين) شەرحی کەلامی شێخ ئەکا و ئەلێ شیرکی ئەمان کەوا إنتسابیان بۆلای ئیسلامداوە شەدید ترو توندترێکە لەوانەی پێشوو لەدوو لایەنەوە :

*لایەنی یەکەم : (الأول : أن شرك الأولين إنما يحصل في حال الرخاء ، وأما في حال الشدة فم يتركون الشرك ويخلصون الدعاء لله لعلمهم أنه لا ينجي من الشدائد إلا الله سبحانه ، كما ذكر الله عنهم في الآيات التي ساقها الشيخ وغيرها)ئەو ئایەتانەی کەوا شێخ بۆی باسکردین باسی ئەوەی بۆ کردین کەوا شیرکی ئەوانە لەکاتی شیدە و ناخۆشیدا بوو (وأما هؤلاء المشركون) سەیرکە شێخ ناوی نان موشریك ئێمە زۆر جار دیقەت ئەدەینەوە سەر ئەمە چونکە کەسانێك هەن دەلێن ئەوە شیرکی کرد بەس موشریك نیە یان ئەلێت پێ مەلێ موشریك بەإسم فاعل سەیرە کەسێك شیرك بکات و إسم فاعلی بەسەردا جێ بەجێ نەکەی ! چۆن کابرا شیرکی کرد موشریك نیە بۆیە لێرەدا پێیان ئەلێ (وأما هؤلاء المشركون) بە إسم فاعل باس ئەکا ئەو

سبحانه وتعالى) ئەم حالەتە زۆر گەورەیە لە رۆژی قیامەتدا ئینسان هەردەم یەکێك لەوشتانەی ببێتە هۆی جورئەت و ئازایەتی ئینسانی موسلمان ئەم مەوقیفە بیهێنێتە بەرچاوی خۆی کەس ناتوانی ئەوە ئادەم و ئەوە نوح ئەوە موسا ئەوە عیسا کەسیان ناتوانن بچن تکاش بکەن لەلای خوای تعالى کە ژیانیان بە پێغەمبەرایەتی و بەتەقوا و ئیمان رۆیشتووە ،ئەی ئەم ملهورانەی ئەمرۆ کە ئەمر دەکەن بەهەرچی خراپە و فەساد و شیرك و زولم و هەرچی خراپە هەیە لەداوێن پیسی و دەم پیسی و دل پیسی و دەست پیسی ئەمە دەبێتە هۆکارێك بۆ ئەوەی کە تۆ هیچ کاتێك لەمانە نەترسی لەدونیا وەشوێنیان نەکەویی وە ئینکاریشیان لێ بکەی چونکە لەو مەقیفەی رۆژی قیامەتدا بەدەر دەکەوێی کەسانی بەرێز و بەحورمەت و ئەنبیاء ورسول ناتوانن قسە بکەن الله تعالى دەفەرمووی (فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا)[1] بزانە چەند مەوقیفێکی گەورەیە هەردەم ئەمەمان لەبەر چاو بێت ئازاو جەرئ دەبی لەمەوقیفەکانتدا بەحەق بەکافرو مونافیق و موشریك و بەهەموویان هەرچی کەسانێکە کە غەیری خوایان دەوێی پێیان بلێ ئەمە رۆژی قیامەت و ئەوەش خوای گەورە ئەتوانی لەورۆژەدا خۆت رزگار بکەی ! ؟ چ جای من رزگار بکەی ئەگەر من توشی تاوانبکەی ! ؟

پێغەمبەران هەموویان ئەلێن ناتوانین چونکە مەوقیفەکەی زۆر گەورەیە (ثم يأتون إلى محمد ﷺ فيقول : أنا لها ، أنا لها)[2] تەبعەن ئەم پیاوی ئەو مەیدانەیە خوای تعالى ئەوی داناوە ئەمە شەفاعەتی گەروەیە بەس بۆ ئەوە (ثم يأتي ويسجد بين يدي ربه ويحمد الله ويثني عليه ويدعوه ويستمر ساجدا بين يدي ربه حتى يقال له)سوجدە ئەبات وە سوپاسی خوای تعالى ئەکا وەشکوری خوا دەکا وەمەتحی خوای تعالى دەکا بەکەلیماتێك کە ئەورۆژە لەوێدا خوای تعالى فێری ئەکا لەحەدیسدا هاتووە پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : کەلیماتەکان ئەورۆژە خوای تعالى فێرم ئەکا کەچی بلێم ، لەسوجدە ئەمێنێتەوە هەتاوەکو پێ دەوترێی (يا محمد ارفع رأسك ، وسل تعطه ، واشفع تشفع)[3] ئەی محمد سەربەرزبکەرەوەﷺ چی ئەلێ پێت ئەدرێی تکا چۆن دەکەی تکاکەت وەردەگیرێی ، مەبەستمان ئەوەیە کەوا خوا پێ رازییە واتا ئێستا پێغەمبەری خوا ﷺ لەوێدا بلێ خوایە دایك و باوکم بخەرە بەهەشت

---

[1] :سورة طه اية :١٠٨

[2] : البخاري التوحيد ( ٧٠٠٢ ) ، الترمذي تفسير القرآن ( ٣١

[3] : البخاري التوحيد ( ٧٠٧٢ ) ، مسلم الإيمان ( ١٩٣ ) ، ابن ماجه الزهد ( ٤٣١٢ )

نایخاتە بەهەشتەوە خوای تعالی ! ئەبێ خوای تعالی رازی بێ لە ئیشەکەی لەبەر ئەوەی لەحەدیسی صەحیحدا هاتوە دایك و باوکیان بۆ جەهەنەمە هیچ پێغەمبەرێك ناتوانێ شەفاعەت بۆ هیچ کەسێك بکەن لەو رۆژەدا وە لەحەدیسی صەحیدا هاتوە کەوا ئیبراهیم ئەیەوێت شەفاعەت بۆ باوکی بکا بەلام خوای تعالی شەفاعەتەکەی قبول ناکا .

دەبێت ئاگاداربین شەفاعەت بەم شێوەیە :

١–دەبێت کەسێك بیکا کەوا خوای تعالی لێ رازییە .

٢–دەبێ بۆ کەسێك بکرێی کەوا خوای تعالی لەو کەسە رازییە موشریك نەبێ و موحید بێ .

(لأنه لا أحد يشفع عند الله إلا بإذنه ، والرسول ما ذهب إلى الله وشفع ابتداء بل استأذن من ربه)هیچ کەسێك شەفاعەتی لەلای خوای تعالی لێ قبول ناکرێی إلا ئەبێت خوای تعالی ئیزن بدا وە پێغەمبەر ﷺ ناچێ بۆلای خوای تعالی داوای شەفاعەت بکا لەسەرەتا هەتاوەکو ئیزن لە خوای تعالی وەرنەگرێی (وسجد بين يديه حتى أذن له ، وهذا كقوله تعالى) کەسوجدە ئەبات ئیزن وەر ئەگرێی وە خوای تعالی ئیزنی ئەدا کەوا سوجدەکە بەرێت کە شەفاعەتەکە بکا (مَن ذَا ٱلَّذِى يَشۡفَعُ عِندَهُۥٓ إِلَّا بِإِذۡنِهِۦ)[1] بەداخەوە زۆربەی خەلك ئەمە دەخوێنێتەوە بەلام ماناکەی نازانێت ئەمە کێشەکەمانە مانای ئایەتەکان نازانن . کێ شەفاعەت ئەکا لەلای خوای تعالی إلا ئەگەر خوا ئیزنی بدا وە ئەبێ بۆ کەسێکیش شەفاعەت بکرێی کە موحید و یەکخوا پەرست بێ (فيطلب من الله أن يفصل بين عباده ويريحهم من الموقف فيستجيب الله شفاعة محمد ﷺ) لەخوا داوا دەکا کەوا حوکمی بکا لەنێوان بەندەکانیدا وە ئیسراحەت بکا لەو مەوقیفەدا وە خوای تعالی شەفاعەتەکە قبول دەکا (وهذه تسمى الشفاعة العظمى) ئەمە پێ دەوترێی شەفاعەتی گەورە (والقمام المحمود ) پێ دەوترێی مقامی محمود لەبەر ئەوەی هەموو کەسێك سوپاسی ئەو مەوقیفەی دەکا کە ئەبێتە هۆی رزگارکردنی خەلکی .( وهي قوله تعالى : عَسَىٰٓ أَن يَبۡعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامٗا مَّحۡمُودٗا )[2] خوای تعالی زیندووت ئەکاتەوە لەرۆژی قیامەت وە مقامێکت پێ ئەبەخشرێی کە خەلکی هەمووی سوپاست دەکا لەسەری کە مقامی شەفاعەیە (بمعنى أنه يحمده عليه الأولون والآخرون. )لەسەرەتاوە تاوەکو کۆتایی خەلکی

---

[1] :سورة البقرة اية : ٢٥٥

[2] :سورة الإسراء اية :٧٩

سوپاسی پێغەمبەری خوا دەكەن ﷺ كە دەروازەی خێری بۆ كردنەوە كە توشی ئەوە بوون لەو مەقیفە نارەحەتیە رزگاریان بێ خۆتان ئەزانن چاوەروانی ئەگەر سزاشی لەگەل نەبێ هەر ناخۆشە ئێستا تۆ برۆ بۆ شوێنێك بلێ سەعاتێك دوو سەعات راوەستە یاخود چاوەری بكە بەلام كاتەكەی پێت نەلێن چەند ناخۆش و نارەحەت دەبی تۆ ! هەتا ئەگەر لە ئیسراحەتیشدا بی ،ئەی لەم عەزابەدا چەند ناخۆشە كەواتە رزگار بوون لەم سزایە جێگای سوپاسە بۆیە پێ وتراوە مقامی محمود.

(قال القبوریون)گۆر پەرستە كان ئەلێن[1]: (فهذا فیه جواز الاستغاثة بالأنبیاء والأولیاء والصالحین وأنتم تقولون لا یستغاث إلا بالله) ئەلێن جائیزە هاواركرد و ئیستغاثەكردن ئەوەتا لەحەدیسی صەحیحدا هاتووە ئیستغاثەكراوە بەئادەم ئێوەش دەلێن ناكرێی إلا بەخوا نەبێ ئەوە بە ئەنبیاء نەكراوە ئەی !؟ (وقالوا فهذا یدل علی أن طلب الشفاعة من الرسول ﷺ جائز حیا ومیتا وكذلك غیره. )ئەمە دەلالەت لەوە دەكا كەوا داوا كردنی شەفاعەت لە پێغەمبەرو لەغەیری پێغەمبەران بە مردوویەتی و بەزیندوویەتی جائیزە ؟!

وەلامەكەی :

(والجواب عن هذا كما یقول الشیخ)وەكو شێخ وەلامی داوە ئەلێن (إن هذا طلب من إنسان حي قادر علی الدعاء) ئێوە وەرەن ورد ببنەوە و تۆزێك ئەقلتان بخەنە كار ئەمە لەمەوقیفی رۆژی قیامەتدایە هەمووی هاتۆتەوە و هەمووی زیندوو بۆتەوە ئەمە رۆژی زیندوو بونەوە و راوەستانە لەبەردەمی خوای تعالی وە هەمووتان ئەزانن كەوا ئەوەی لەم گۆرەپانەدایە هەمووی زیندوو بۆتەوە ، كەواتە داوا كردنە لە ئینسانێك كە زیندووە و بەتوانایە لەسەر ئەوەی ئەو دوعایە بكا (وعلی الاستئذان بالشفاعة ، والطلب من الإنسان في حال حیاته وقدرته لیس من الممنوع ، كما في قصة موسی: فَٱسۡتَغَٰثَهُ ٱلَّذِی مِن شِیعَتِهِۦ عَلَى ٱلَّذِی مِنۡ عَدُوِّهِۦ)[2] هەروەكو چیرۆكی موسا كاتێك پیاوە بەنی ئیسرائیلیەكە داوای لەموسا كرد كە لەحالی حەیاتی موسا بوو داوای لێكرد كەوا لەدژی دووژمنەكەی بێت یارەمەتی بدا (وكما یستغیث

---

[1]: كەواتە دروستە كەوا كەسێك لەسەر گۆرێكدا هاواری بۆ ئەكا بلێن موشریك و گۆر پەرست نەوەكو بەناو سەلەفیەكانی ئەمرۆ كە دەلێ نەخێر ئەمە شیركە بەس خۆی موشریك نیە !یەكخوا پەرستە نەخێر موشریكە

[2]: سورة القصص ایة : ١٥

الإنسان بإخوانه في الحرب وغيرها. )هەروەكو چۆن كاتێك كەسێك لەجەنگدا ئەگەر لەمەوقیفێكی ناخۆشدا بوو داوای یارمەتی لە هاوڕێكانی دەكا بێن بەهانای و رزگاری بكەن .
(فهذا فيه دليل على أن الاستغاثة بالحي فيما يقدر عليه جائزة)كەواتە هانا بردن لەزیندوویەك لەوەی كەتوانای بەسەردا هەیە و لەدەسەلاتی ئەودایە بەمانای ئەوەی ئەگەر زیندوو بێ و توانای نەبێ نابێ ئێستا تۆ بەزیندوویەك بلێ پارەم بدەرێی كەچی پارەی پێ نەبێت ئەتوانێ پێتی بدا ! پێ نیە ئەو ؟! لەبەر ئەوەی توانای نیە پێتی بدا بازیندووش بێ.
كەواتە داواكردن لە بەم شێوەیە جائیزە لە ئینسانە كانە:
١–دەبێت زیندوو بێ ئەم كەسە .
٢–دەبێت تاوانی ئەوكارەی هەبێت و لەدەسەلاتی ئەودا بێ .
(والذي يقع من الأمم يوم القيامة هو استغاثة بالحي وطلب الدعاء منه) لەرۆژی قیامەتدا روو دەدا داوا كردن و هانابردنە بۆ زیندوویەك بۆ داوا كردنی دوعا كەوا دوعا بكا (فيجوز أن تذهب إلى إنسان حي قادر يسمع كلامك وتقول يا فلان ادع الله لي بكذا وكذا) كەواتە جائیزیشە لە ئێستاشدا بچیت بۆ لای كەسێك كەوا زیندوو بێت و بەتوانا بێ گوێی لەقسەكەت بێ لەمەجلیستدا بێ پێ بلێ كەوا داوات بۆ بكا (والصحابة كانوا يعملون هذا مع النبي صلى الله عليه وسلم في حياته)صەحابە ئەمەیان لەگەل پێغەمبەردا ﷺ ئەنجام ئەدا (وليس هذا من الشرك)ئەمە شیرك نیە .
(إنما الذي يكون شركا وأنكرناه هو الاستغاثة بالميت)ئەو شەفاعەتە كە ئەلێن شیركە و ئینكاری ئەكەین ئەوەیە كەوا هانا ببەیت بۆ مردوویەك (وهذا لا علاقة له بحديث الشفاعة)ئەمە هیچ پەیوەندیەكی بە حەدیسی شەفاعەوە نەبوو (لأنكم تستغيثون بأموات وتطلبون الشفاعة منهم ، والأموات لا يقدرون على شيء)لەبەر ئەوەی ئێوە هانا دەبەن بۆ مردوەكان و داوای شەفاعەتیان لێ دەكەن مردوەكان هیچیان لەدەسەلاتدا نیە (فلا يجوز أن يذهب إلى قبر يستنجد به ويدعوه أو يطلب منه الدعاء أو الشفاعة أو غير ذلك) كەواتە نابێ ئینسان بروات بۆلای گۆرێك داوای هانا و یارمەتی لێ بكا وە داوای تكا و شەفاعەتی لێ بكا (ففيه فرق بين عمل هؤلاء المشركين وبين ما في الحديث الصحيح)وە جیاوازیەكی زۆر ئاشكرا ئەبنین لەنێوان عەمەلی ئەم موشریكانە وە لەنێوان مانای حەدیسە صەحیحەكەدا (وفي قصة موسى عليه

الصلاة والسلام فبهذا التفصيل زالت هذه الشبهة والحمد لله. )ئا بەم ڕۆشنکردنەوە و بەیان کردنە ئەم شوبهەیەش ڕەوویەوە الحمدلله .

شوبهەی دوانزە :

شێخ محمدی کوری عبدالوهاب دەفەرمووی : (ولهم شبهة أخرى وهي قصة إبراهيم عليه السلام لما ألقي في النار اعترض له جبريل في الهواء فقال له) لەسەرەتا دا چیرۆکی ئیبراهیم کە ئایە صەحیحە یاخود نا ئەمە خالێکە بەلام کە شێخ هێناویەتەوە و وەلامیان ئەداتەوە کەوا ئیشارەت ناکا بە صیحت و ناصیحەتی .

چیرۆکی ئیبراهیم صەحیح نیە ئەمەی ئێستا کەباسی دەکەین .

ئیمامی بغوی هیناویەتی لە تەفیسرەکەیدا بەبێ سەنەد ، بەبێ سەندیش ریوایەت چۆن صەحیحە !؟ بۆیە علماء دەفەرموون صەحیح نیە .

بەلام شێخ بۆیە ئەم ابەتەی وەلام داوەتەوە لەبەر ئەوەی وەلامدانەوەی شوبهەکان بەچەند شێوازێك دەبێ یەکێك لەوانە دەلێن ئەم چیرۆکە صەحیح نیە وە ئەگەر ئیوە هەر ئینکاریتان کرد و بەصەحیحتان دانا با بێن وەلامتان بدەینەوە ئەمەیە بابەتە .

شوبهەیەکی تریان هەیە کەوا دەلێن : (ولهم شبهة أخرى وهي قصة إبراهيم عليه السلام لما ألقي في النار اعترض له جبريل في الهواء فقال له)کاتێك کە ئیبراهیم ئاگری بۆ کرایەوە و بخرێتە ناو ئاگر جوبرائیل هات و دەرکەوت بە ئیبراهیمی وت (فقال له : ألك حاجة ؟) هیچت پێویستە من یارمەتیت بدەم (فقال إبراهيم : أما إليك فلا)وتی نەخێر هیچ لەتۆ داوا ناکەم ، داوای لەخوای تعالی کرد و وتی (حسبي الله ونعم الوكيل )موشرکەکان دەفەرموون (فقالوا : فلو كانت الاستغاثة بجبريل شركا لم يعرضها على إبراهيم. ) ئەگەر ئەم هانا بردنە شیرك بێ جوبرائیل ناچێت بە ئیبراهیم بلێت چیت دەوێی !بۆئەوەی ئەویش داوای لێ بکا .

وەلامەکەی :

لەپێش هەموو شتێکەوە جوبرائیل زیندووە وە ئیبراهیمیشی بینیوە لەدەسەلاتیشدایە هیچ کێشەیەك نیە کاتێك مەلائیکەیەك دەرکەوێی بلێت یارمەتیت بدەم نابێت بەشیرك ، واتا شوبهەیەکی زۆر پوچە وە پاشان چیرۆکەکە خۆی صەحیح نیە پاشان ئیبراهیم کە خۆی

قبولی نەکردبیّ لەبەر ئەوە وتویەتی من تەوکل لەسەر خوا ئەکەم لەسەر زیندوویەك ناکەم نەك لەبەر ئەوەی شیرکە ! لەبەر ئەوەی لە خوای گەورە داوا دەکەم إستعانەی بەخوای تعالی کردوە پیّغەمبەران هەموو کاتیّك ئەگەر نارەحەتیەك هاتبیّتە بەردەمیان راستەوخۆ تەوکولیان لەسەر خوای تعالی بەستووە الله تعالی فەرموویەتی (وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُتَوَكِّلُونَ )[1] ئیماندار با لەسەر خوای تعالی تەوکل ببەستیّ وە الله تعالی دەفەرمووی (إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوۡلِيَآءَهُۥ فَلَا تَخَافُوهُمۡ وَخَافُونِ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ)[2] ئایەتەکان روون و صەریحن کەوا ئینسان راستەوخۆ لەگەل لەخوای تعالی دا داوای یارمەتی بکا بەلام ئەگەر زیندوویەکیش هەبیّت و یارمەتی بدا هیچ شیرك نیە ئیّمە بابەتەکەمان لەسەر مردووە .

وەلامی شیّخ محمدی کوری عبدالوهاب (فالجواب : أن هذا من جنس الهيئة الأولى)ئەمە لەوێنەی شوبهەکانیترە (فإن جبريل عرض عليه أن ينفعه بأمر يقدر عليه) جوبریل شتیّکی پیّ وتوە و شتیّکی پیّشکەش کردوە کەتوانای هەیە بەسەریدا بە تەئەکید جوبریل توانای هەیە خوای تعالی دەرهەقی دەفەرموی (فإنه كما قال الله تعالى فيه : شَدِيدُ ٱلۡقُوَىٰ )[3] زۆر زۆر بەهیّزە .

جوبریلیّکی بەهیّز کەوا هەر بالیّکی ئاسمان داگیر بکات و ٦٠٠ بالّی هەبیّ ئەو هیّز و گەورەیەیی هەبیّ ئاگریّك جیە ئەتوانی بە پەنجەیەك فریّی بدا لە خۆر هەلاتەوە بۆ خۆر ئاواوە و کۆتایی پیّ بهیّنیّت (فلو أذن الله له أن يأخذ نار إبراهيم وما حولها من الأرض والجبال ويلقيها في المشرق أو المغرب لف) ئەگەر خوای گەورە ئیزنی بدابایە ئەوە ئاگرەکەی ئیبراهیم و ئەوەی لەسەر زەویدایە بیبات بۆ مشریق یاخود بیبات بۆ مغریب ئەیکرد (ولو أمره أن يضع إبراهيم عليه السلام في مكان بعيد عنهم لفعل) یاخود ئیبراهیم هەرگریّت بیبات بۆ شویّنکی دوور رزگاری بکا ئەیتوانی ودەیکرد (ولو أمره أن يرفعه إلى السماء لفعل) ئەگەر ئەمریی بکردبایە بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمان وەکوچۆن عیسای بەرزکردەوە ئەیکرد کەواتە ئەمەشتیّکە و کەسیّکی زیندوو کە جوبریلە یارمەتی زیندوویەك ئەدا کەوا ئیبراهیمە واتا

[1] :سورة إبراهيم اية :١٢
[2] :سورة ال عمران اية : ١٧٥
[3] :سورة النجم اية : ٥

ئەگەر داواشی کردبێ لەحالەتێکدا شیرك نیە ئەمە ئێمە باسی مردووان ئەکەین کە ناتوانن ئەم کارە بکەن .

(وهذا كرجل غني له مال كثير يرى رجلا محتاجا فيعرض عليه أن يقرضه أو أن يهبه شيئا يقضي به حاجته ، فيأبى ذلك الرجل المحتاج أن يأخذ ويصبر حتى يأتيه الله برزق لا منة فيه لأحد)ئەمە وەکو کەسێك وایە دەولەمەند کەوا مالێکی زۆری هەیە دێت بەکەسێکی فەقیر دەلێت چیت دەوێی ئەوە مالت بدەمی و قەرزت بدەمی قەرزت ئەوێی پێتی ئەدەم ! مالت ئەوێی پێتی ئەدەم هەربۆخۆت مەم دەرەوە ئەویش بلێت من نامەوێت سوپاست دەکەم حەز ناکەم داوا لەکەس بکەم ئەوە جائیزە ئەلێت حەز دەکەم خوای تعالی پێم ببەخشێت من صەبر دەگرم لەسەر ئەم فەقیرییە (فأين هذا من استغاثة العبادة والشرك لو كانوا يفقهون ؟) ئەمە و شیرك لەکوێی !؟ جیاوازیان زۆرە ! .

شێخ (صالح ) دەلێ :

(هذه آخر الشبهات التي ذكرها الشيخ) کۆتا شوبهەیە کەوا شێخ محمدی کوری عبدالوهاب لەوانی دەگێرێتەوە (في هذه الرسالة العظيمة)لەم نامە گەورەیەدا کە چەندێك کەمە بەلام بەراستی زۆر مانای گەورەی تێدایە (فأجاب عنها بجواب سديد موفق ، وهي)وەلامێکی زۆر راست و دروست و مۆفەقانەی داوەتەوە کەدەلێ (أن عباد القبور الذين يطلبون المدد من الأموات ويستغيثون بهم يقولون إن هذه الاستغاثة ليست شركا)ئەوانەی داوای مەدد[1] ئەلێن هاوار بردن و هانابردن بۆ مردووان شیرك نیە (وذلك بدليل قصة جبريل عليه السلام مع إبراهيم عليه السلام حينما ألقي في النار) یەکێك لەبەلگەکانی موشریکەکان چیرۆکی جوبریلە لەگەل ئیبراهیم دا (عليه الصلاة والسلام)کاتێك خرایە ناو ئاگرەکەوە (فإن جبريل جاء إلى إبراهيم كما يروى)[2]شیخ صالح فەرمووی کما یروی لەصیغەی تمریضە واتا حەدیسەکە صەحیح نیە چونکە بەبێ سەنەد هاتووە .

(فقال جبريل لإبراهيم عليه السلام) جوبریل بە ئیبراهمی وت (هل لك من حاجة ؟ )ئەوە خەریکە ئەخرێتە ناو ئاگرەوە هیچت پێویستە بۆت بکەم ؟ (يعرض عليه المساعدة لإنقاذه)

---

[1] : کاتێك داوا لەمردوان دەکەی و داوای یارمەتی لێ دەکەی

[2] : وفي ثبوته نظر

یارمەتی پێشکەش دەکا بۆ ئەوەی ڕزگاری بکا (وجبريل عليه السلام لا شك ذو قوة عظيمة) وە جوبریل گومانی تێدا نیە کەوا خاوەنی هێزێکی زۆر گەورەیە (وعنده قدرة على إنقاذ إبراهيم)ئەیتوانی ئیبراهیم ڕزگار بکا (وقد وصفه الله عزوجل) خوای تعالی وەصفی جوبریلی کردوە (فقال : ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلۡعَرۡشِ مَكِينٍ )[1] خاوەنی هێز و قوەتێکی زۆر گەورەیە لەلای ذی العرش کە خوای تعالی یە خاوەنی عەرشە مکینە واتا ساحێبێ مەکانەتێکی گەورەیە پلە و پایەکی گەورە و بەرێزی هەیە (وفي الآية الأخرى : ذُو مِرَّةٍ )[2] شێخ دەلێ واتا (يعني قوة)خاوەنی قوەتێك و هێزێکی زۆر سەرسورهێنەرە (فعرض جبريل على إبراهيم أن يساعده في إخراجه من هذه الشدة)جوبریل یارمەتی پێشکەش بە ئیبراهیم کرد کە لەم نارەحەتیە ڕزگاری بکا (فلما كان إبراهيم عظيم الثقة بالله عز وجل قال له) ئیبراهیم ئەوەندە تەوکلەکەی گەورەبوو لەسەر خوای تعالی پێ وت (أما إليك فلا ، وأما إلى الله فنعم) بۆلای تۆ نەخێر بەس بۆلای خوای تعالی بەلێ داوا لەخوای تعالی دەکەم (فإبراهيم عليه السلام لم يرد أن يطلب من مخلوق أن ينقذه من هذه الشدة) ئیبراهیم نەیوستوە ! ئەمە ڕەدی ئەمانە کە پێداگیریان کرد و وتیان ئەم چیرۆکە صحیحە ئینجا ئیبراهیم نەیوستوە لە مخلوقێك داوا بکا لەکاتێکدا کەتوانای هەیە (وإنما توجه إلى ربه كما صح في الحديث أنه قال: حَسۡبُنَا ٱللَّهُ وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ )[3] کاتێك ئیبراهیم خرایە ناو ئاگرەوە ئەمەی وت و خوای تعالی ڕزگاری کرد ،پێغەمبەری خواش ﷺ کاتێك پێیان وت خەلکی کۆبۆتەوە بۆئەوەی لەناوتان بەرن هەر ئەمیش وتی (حسبنا الله ونعم الوكيل، نعم المولى ونعم النصير)بلێن خوامان بەسە والله بەم متمانەوە لەدوو حالەت تێ ناپەڕێت یان شەهید ئەبێ یاخود خوای تعالی ڕزگارت ئەکا هەردووکیشی دووشتی باشە بەس بەداخەوە ئەمڕۆ ئێمە چاومان لەم شتانە نیە ترس و بیمی کافرو ئینسانی خراپکار وای لێکردووین کە ئیمانەکەمان لاواز و کزبووە (حَسۡبُنَا ٱللَّهُ،،،) لەبیر چۆتەوە .

[1] :سورة التكوير اية : ٢٠
[2] :سورة النجم اية : ٦
[3] :سورة ال عمران اية : ١٧٣

(فهذا من باب التوكل على الله عز وجل )ئەمە لەبابی تەوكلە بە خوای تعالی ئەمە پشتیوانی بەستوە بە خوای تعالی و بەس (وتفويض الأمر إليه وهذه صفة أكمل الخلق) ئێوە سەیر بكەن پێغەمبەران عادەتیان وابوو (عليهم الصلاة والسلام) كاتێك دووژمن هەرەشەیان كردوە یەكەسەر وتویانە : ئێمە پشتیوانمان بە خوای تعالی بەستوە چی ئەكەن بیكەن وایان بەبەرامبەرەكەیان وتوە وە خوای تعالی چی دانابێ لەقەدەری خۆیدا هەرئەوەیە كەس ناتوانی یەك زەر لەو قەدەری خوای تعالی بەولا و بەولادا بەرێت ئەمەش سیفەتی گەورەترین خەلقە (إيمانا حيث إن إبراهيم رفض مساعدة المخلوق) ئایا كە ئیبراهیم لەم چیرۆكەدا رەفزی موساعەدە و یارمەتی كەسێكی كردوە كە جوبریلە (وقبل مساعدة الخالق)قبولی موساعەدەی خوای تعالی كردوە (لأن مساعدة المخلوق فيها منة وحاجة إلى المخلوق)تۆهەركەسێك لەمخلوق یارمەتیت بدا شتێك لەمنەت هەیە بەسەرتەوە واتا تۆ چاو ژێری دەستی دەبی بۆیە ئەگەر قبولی ئەوە نەكەی باشترێكە خۆ ئەگەر بیشی كەی مادەم ئەتوانی هەر ئەبێ خوای تعالی بۆنمونە بابی زەكاتی داناوە خوای تعالی دەفەرمووی (وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ)[1] ئەمە شەریعەتە هەیە وەری دەگرێی ئەم زەكاتە هەشە وەری ناگرێی ئەوەی كەوا فەقیرە وەری ناگرێی ئەلێ من تەنها داوا لە خوای تعالی دەكەم ئەوەشی كەوا وەر دەگرێت شتێكی ناشەرعی نەكردوە (ومساعدة الخالق سبحانه وتعالى لا منة فيها لغير الله) یارمەتی خوای تعالی بۆ مخلوقاتەكانی منەتی كەسی تیانیە إلا منەتی خوای تێدایە لەبەر ئەوە ئیبراهیم حەزی كردوە منەتی خوا قبول بكا (وهي فضل من الله سبحانه وتعالى)ئەمەش بەخشندەی خوای گەورەیە بۆ ئەو .

(وجبريل عرض على إبراهيم شيئا يقدر عليه ، وهو عرض من حي حاضر قادر كما يعرض الغني على الفقير مساعدته بالمال) ئەمەش پێشكەش كردنی یارمەتی كەسێكی زیندوو ئامادەی بەتوانایە هەروەكو چۆن دەولەمەندێك موساعەدە و یارمەتی پێشكەش بەفەقیرێك دەكا پێ دەلێت ها ئەوە مال چیت ئەوێت بەسەر چاو جا ئەویش ئەتوانی یان قبولی بكا یاخود قبولی نەكا (وليس هذا من جنس الاستغاثة بالأموات أو الغائبين الذين يستغيث بهم القبوريون)ئەمە لەجنسی ئەوە نیە كەوا هاوار بۆ مردوان و ئەوانەی كەوا دیارنین با لەحالی

[1] :سورة التوبة اية :٥

حەیاتیشدا بن مادەم دیارنیە نابێ داوای لێ بکەی (فإن الأموات لا يستغاث بهم) مردوان هانایان بۆ نابرێی (ولا يقدرون على ما طلب منهم) توانایان بەسەر شتێکدا نیە کەداوایان لێ دەکرێی (ولا يسمعون دعاء من دعاهم)هەتا گوێیان لێ نیە کەوا کەسێك کەداوایان لێ دەکا .

جا رەنگە بلێت چۆن گوێی لێ نیە ؟! ئێمە ئایەت ئەهێنینەوە خوای تعالى دەففەرمووی (قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ ۖ لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ ﴿٢٢﴾ وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ)[1]

(قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ)ئەی محمد ﷺ تۆ پێیان بلێ داوا ئەکەن و وا گومان ئەبن کە درۆیە کارەکەتان کە ئەوان گوێیان لێتانە و یارمەتیتان ئەدەن لەغەیری خوا داوا بکەن (لَا يَمْلِكُونَ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَلَا فِى ٱلْأَرْضِ ) کەلیمەی مثقال واتا بەقەدەر بەقەدەر زەرەیەك لەئاسمانەکان و زەوی هیچی ئەوان نیە مالیك نین و خاوەنی هیچ شتێك نین تەنانەت بەقەدەر زەرەیەك لەئاسمانەکان و زەوی کە خاوەنی هیچ شتێك نین تۆ داوای چیان لێ دەکەی ! هیچیان بەدەست نیە (وَمَا لَهُمْ فِيهِمَا مِن شِرْكٍ) ئەمانە چ پێغەمبەران چ پیاوچاکان ئائەمانە هەر هەموویان بەهیچ شێوەیەك یارمەتی خوای تعالى یان نەداوە لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەویدا و شەریکی بن هەتا لەدروستبوونی خۆشیاندا بەشدارنەبووینە (وَمَا لَهُۥ مِنْهُم مِّن ظَهِيرٍ)خوای تعالى هیچ کەسێکی نەهێناوە وەکو یاریدەدەر و پشتیوانی بۆخۆی شتی وا نیە (وَلَا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ عِندَهُۥٓ إِلَّا لِمَنْ أَذِنَ لَهُۥ) وە شەفاعەتیش هیچ سودی نیە لەلای خوا إلا ئەبێ ئەو ئیزن بدا ئەبێ ئیزن بدا بەو کەسەی کەوا شەغاعەتەکە دەکا وە لەو کەسەش رازی بێت کە شەفاعەتەکەی بۆ دەکرێی ئەگەر ئەو شەفاعەتە هیچ سودی نیە (لا تنفع) ئەوە شەفاعەتی منفیە .

(وقال تعالى : ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمْ لَهُ ٱلْمُلْكُ ۚ وَٱلَّذِينَ تَدْعُونَ مِن دُونِهِۦ مَا يَمْلِكُونَ مِن قِطْمِيرٍ ﴿١٣﴾ إِن تَدْعُوهُمْ لَا يَسْمَعُوا۟ دُعَآءَكُمْ وَلَوْ سَمِعُوا۟ مَا ٱسْتَجَابُوا۟ لَكُمْ ۖ)[2].

[1] :سورة سبأ اية :٢٢-٢٣
[2] :سورة فاطر اية : ١٣-١٤

(ذَٰلِكُمُ ٱللَّهُ رَبُّكُمۡ لَهُ ٱلۡمُلۡكُۚ ) پەروەردگاری راستەقینەی ئێوە كە الله یە ئەو ئێوەی دروست كردوە ئەو ئێوەی بەخێو كردوە ئەو خاوەنی ئێوەیە وەمولك هەمووی هی ئەوە هی كەس نیە (وَٱلَّذِينَ تَدۡعُونَ مِن دُونِهِۦ)[1]ئەوەی ئێوە لەغەیری خوای تعالى داوایان لێ دەكەن یاخود عیبادەتیان بۆ دەكەن و دەیانپەرستن (مَا يَمۡلِكُونَ مِن قِطۡمِيرٍ ) خاوەنی قطمير[2]نین بەقەدەر ئەمە خاوەنی هیچ شتێك نین كەچەند بێ ئەهمیەتە (إِن تَدۡعُوهُمۡ لَا يَسۡمَعُواْ دُعَآءَكُمۡ)ئەگەر داوایان لێ بكەن گوێیان لەدوعای ئێوە نیە (وَلَوۡ سَمِعُواْ مَا ٱسۡتَجَابُواْ لَكُمۡۖ) ئەگەر گوێشیان لێ بێ وەلامتان نادەنەوە .

## (وجوب تطبيق التوحيد بالقلب واللسان والجوارح إلا لعذر شرعي)

شێخ محمدی كوری عبدالوهاب دەلێ : (ولنختم الكلام إن شاء الله تعالى بمسألة عظيمة مهمة جدا تفهم مما تقدم ولكن نفرد لها الكلام لعظم شأنها ولكثرة الغلط فيها فنقول) ئەڵێ كۆتایی قسەمان بەوە دەهێنین كەوا بابەتێكی زۆر گەورە وموهیم باس دەكەین لەوەی كە رابورد ئینسان تێ دەگا بەتەنها باسی دەكەین چونكە بەراستی زۆر كەس تێدا كەوتۆتە هەلەوە مەبەستی لە رابردوان و ئێستاشە چەندەها مزاهیب لەم بابەتە دروست بووە .

(لا خلاف أن التوحيد لابد أن يكون بالقلب واللسان والعمل) كە وتی لا خیلاف واتا إجماعه ،خیلاف نیە لەنێوان علماء یان واتا إجماعه لەسەر ئەمە كە تەوحید و ئیمان بریتیە : بەدل و بەزمان و بەكردەوە دێتە جێگا و دروست دەبێ ، واتا محلی ئیمان پێویستە لەدلدا بێ بەزمانیش بێ وە لەكارو كردەوەی چوار پەلەی ئینساندا بێ ئەم بابەتە كە بابەتی ئیمانە ئەهلی سونە و جماعە ئیمان و باوەریان بەم شێوەییە .

لەدلدا پێویستە قولی قەلب هەبێ كە بریتیە لە عیلم و تصدیق وە ئیقرار ، وەدەبێ عەمەلی قەلب هەبێ كە بریتیە : لە حب و رجاء وخوف و إناب هەتا دوای باقی هەموو كارەكانی دل تەبعەن ئەعمالی دل زۆر زیاترێكە لە قەولی دل قەولی دل بریتیە لە تصدیق و ئیقرار و عیلم

[1]: تدعون : بەمانای دوعای مەسئلە دێت و بەمانای دعای عیبادەش دێت

[2]: بریتیە لەو پەردە تەنكەی كە لەسەر ناوكی خورمایە

، بەلام كارى دل بريتيە لە حب بريتيە لە رجاء  بريتيە لە خوف وە بريتين لە باقى ئەو كارانەى كە ئەگەر ئينسان نەيبێت ئەوە ئەو كەسە ئيماندار نيە  بۆ نمونە : خوات خۆش نەوێى ئيماندار نيت لە خوا نەترسيت ئيماندار نيت هيوات بەخوا نەبێ ئيماندار نيت هەروەها باقى ترى كارەكانى دل .

وە دەفەرمووێت (واللسان)ئيمان ئەبێ لەسەر زمان بێ كە ئەمە قەولى ليسانە كە بريتيە لە (لا اله الا الله ومحمد الرسول الله ﷺ) وە هەروەها ئەوشتانەى كەوا بە زمان ئەوترێى لە زيكر و قورئان خوێندن و لەئەمر بە معروف و نەهى لە منكر كە بەزمان دەر ئەبرێت .

وە دەفەرمووى (والعمل ) مەبەستى پێ عەمەلى جەواريحە لەسەرووى هەموويانەوە نوێژ پاشان زەكات پاشان رۆژو و پاشان حەج وە هەر كارێك لەوكارانەى كە كردنيان چ رووكن بێ لە ئيماندا چ واجب بێت چ مستحب بێ .

وە تەرك كردنى ئەو كارانەى كە تەرك كردنيان رووكنە ياخود واجبە ياخود مستحبە پێويستە ئينسان ئاگادارى ئەم كارانە بێ .

ئەمانەى باسمان كرد ئيعتقادى ئەهلى سونە و جماعەيە .

جا هەيە لە فيرقە گومراكان وەكو مرجيئە بەهەموو جۆرەكانيانەوە : لە ئەشاعيرە و ماتوريدى و لەجەهميەكان لەوانە ئەلێن كە ئينسان ئەلێت : ئينسان بەس بزانيت خوا هەيە ئەوە ئيماندارە ئەو كەسە ! ئەگەر نەزانێت خوا هەيە ئەوە تۆ كافريت واتا (معرفة الله إمانه والجهل بالله كفر )ئەمەش هەلەيە زۆر لەبەر ئەوەى خواى تعالى هەرئەمەندەى داوا نەكردوە ئێمە هەمووومان ئەزانين شەيطان بەگوێرەى ئەم پێناسەيە ئەبێ بە ئيماندار چونكە شەيطان لەهەموو كەسێك باشتر ئيمانى بە خواى تعالى هەيە شەيطان بەخۆى قسەى لەگەل خواى تعالى كردوە وە لەبەهەشت دەركراوە وە هەموو پێغەمبەرانى بينيوە ئيمانيشى بە بابەتەكان هەمووى هەيە هەتا شێخ الاسلام ئەفەرمووى : مصدق لە قەلبى خۆيدا بەلام نواقضى ئەم ئيمانەى هێناوە ، كەواتە تەنها بەس نيە بلێن (معرفة الله) .

هەيانە لەم فيرقە گومرايانە ئەلى : ئەم كەسە ئەگەر قەولى قەلبى هەبێ ئەگەر عەمەلى قەلبيشى نەبێ هەر ئەبێت و ئيماندارە ! ئەمەش گومرايەكيترە .

وەهەیانە ئەلێ :ئەگەر ئەعمالی قەلبی هەبێ لەگەل قەولی قەلبی کافیە و ئیمانداره باسی قەولی لیسان ناکا یاخود ئەگەر باسی لیسانیش بکا باسی عەمەلی جواریح ناکا ئەمەش گومرایەکیترە .

واتا ئەم فیرقە گومرایانە ئەوانەی کەوا مرجیئەن و لەجۆرەکانی مرجیئەن نەوهاتن ئەم سێ خالە لەئیماندا کۆبکەنەوە .

بەرامبەریان لە فیرقە گومرایانە کە بریتین لە : موعتەزیلە وخەواریج ئەوان تەعریفەکەیان وەك ئەهلی سونەیە بەقەلب و لیسان و بەعەمەل بەلام ئەوان زێدە ڕەوویان کردوە لە مەسئەلەی عەمەلدا دێن هەموو عەمەلێك هەموو تاکێك لەتاکەکانی عەمەل ئەگەر چی رووکنیش نەبێ واتا واجب یان مستحب بێ هەر بەرووکنی دائەنێن واتا بەنەبوونی هەر عەمەلێك تۆ کافر دەکەن یاخود بە کردنی تەرکی عەمەلێك کەتۆ لەسەرتە تەرکی بکەی وەکو زینا و قتل بەکردنی یەکێك لەوانە تۆ کافر دەکەن ئەوەش گومرایی ئەوانە .

ئەوەی گرینگترە باسی بکەین ئەوەیە لەئێستادا بەناوی سەلەفیەت و بەناوی ئەهلی سونە و جماعەوە بەداخەوە لەو عقیدەیە بلاوە لەسەرانسەری ولاتدا عقیدەی إرجاء ی کە لەعقیدەی خواریجی زیاتر بلاوە لەلای خەلکی یانی ئەوەی ئەمرۆ ئێمە سەرنجی ئەدەین خەلکی بەزۆری لە عقیدەی خواریج ئەترسێ وە ئەبێ بزانین کەوا عقیدەی خواریج عقیدەیەکی گومراییە عقیدەیەکە کەوا پێچەوانەی ئەهلی سونە وجماعەیە بەلام ئەگەر سەرنج بدەین عقیدەی إرجاء گەلێك عقیدەیەکی منتشر و بەربلاوترێکە لەعقیدەی خواریج هەرواش بووە لەکۆن و نوێدا هەروابووە .

ئەوەتا سەیربکەن ئەمرۆ ئەوەی کە خۆی بە ئەهلی سونە و جماعە ئەزانی ئەوانەی کەوا بەناوی سەلەفیەتەوە بەناوی ئەهلی سونە وجماعەوە قسە ئەکەن ئەبنێن کەوا پێناسەکەیان ئەوەیە کەوا :ئیمان قول وعەمەلە بەلام ئەگەر عەمەلەکەش نەبێ ئیمانەکە بەرێی ئەکەن بەبێ عەمەلی جواریح مەبەستیانە کەوا ئیمان دروستە ئەگەر چی هیچ عەمەلێکیشی نەبێ !

ئەوان ئەلێن عەمەل لە ئیمانە نالێن لە ئیماندا نیە بەس کێشەکەیان ئەوەیە لەواجبات و مستحبات دای ئەنێن واتا لە ئەرکان دای نانێن . وەدەبێ ئاگاداربین کەوا لە عەمەل هەمانە

کە بە إجماعی صەحابە کە نوێژە ئەوە رووکنە بۆ ئیمان وەرووکنی عەمەلیە بۆ ئیمان ئەگەر ئەو نوێژە نەبێ ئەوکەسە کافرە بە إجماعی ئەهلی سونە و جماعە لە صەحابە وە لەتابعینیش بەلام لەدوای ئەمانەوە خیلاف دروست بووە کەکاتێك ئەمرۆ سەرنج ئەدەین ئەلێن جمهور ئەلێن ئەوەی نوێژ تەرك بکا کافر نیە بەبێ ئەوەی بزانێ جمهور واتای چی جمهور : بزانین صەحابەی تێدایە !؟ بزانین تابعی تێدایە ؟! لە صیغاری تابعین ئەلێن ئیمامی زوهری وتویەتی : ئەگەر ئیمانی پێ هەبوو تەرکی کرد کافر نیە ،ئەما برۆ بۆ جمهەرەی تابعین چ جای إتفاقی هەموو صەحابە لەسەر ئەوەیە کەوا تاریکی نوێژ کافرە ئینجا ئەگەر جمهورێك صەحابەی تێدا نەبێت کەی جمهورە .

یاخود ئەگەر خیلافێك لەدوای صەحابە دروست بێ ئێمە چۆن ئیعتباری بۆ ئەکەین ئەمەیان زۆر گرینگە ئەم خالە .

ئینجا شێخ دەفەرمووی (فإن اختل شيء من هذا لم يكن الرجل مسلما)ئەگەر یەکێك لەمانە تێك بچێ واتا ئەگەر ئیمان ئەم سێ شتەی کۆنەکردەوە لە ئینسانەکەدا ئەم سێ شتە کۆنەبوویەوە لەئیمانی ئەم کەسەدا ئەو کەسە موسلمان نیە واتا بەبێ ئیمانی دل و زمان و عەمەل ئەبێ هەرسێکی کۆبکەیتەوە ئەگینا تۆ موسلمان نیت ، شێخ إجماعی نەقل کرد .

کەچی ئەمرۆ دێن ئەلێن إجماع یاخود شوبهی إجماع هەیە لەسەر ئەوەی کەوا ئەگەر عەمەلیشی نەبێ موسلمانە ! بەداخەوە ئەمە ئەوکەسانە ئەم قسەیەدەکەن کەوا هیچ إعتبارێك بۆ إتفاقی صەحابە دانانێن لەبابەتی تاریکی نوێژدا .

(فإن عرف التوحيد ولم يعمل به فهو كافر)کەواتە ئەگەر کەسەکە تەوحیدی زانی یەکخوا پەرستی زانی لەدلیدا بەلام کاری پێ نەکرد جا کارەکە چ کارەکانی دل بێ یاخود کاری جەواریح بێ ئیشی پێ نەکرد (فهو كافر معاند كفرعون وإبليس وأمثالهما) ئەوکەسە کافرە وە مادەم ئەزانێ ئەوکەیە معانیدە عینادی کردوە چونکە ئەیزانی و ئیشی پێ ناکا وەکو فیرعون و ئیبلیس و نمونەکانی ئەوانە کافرە ئەمانە هەموویان ئەزانن بەلام کاریان بەتەوحیدەکە نەکردوە (وهذا يغلط فيه كثير من الناس ، يقولون هذا حق ، ونحن نفهم هذا)

لەم بابەتە زۆربەی خەلکی ئەکەوێتە هەلەوە ئەلێن : (ونشهد أنه الحق ولكن لا نقدر أن نفعله) ئێمە ئەزانین ئەمە تەوحیدە حەقە بەلام ناتوانین ئەنجامی بدەین .

(ولا يجوز عند أهل بلدنا إلا من وافقهم ، وغير ذلك من الأعذار ، ولم يدر المسكين أن غالب أئمة الكفر يعرفون الحق) شێخ باسی سەردەمی خۆی دەکا ئەلێت : لەلای زۆربەی ئەهلی ولاتی ئێمە کار بەمە ناکەن ،ئێوە سەیری ئەوکاتە بکەن ئەو کاتە زەمانی عوسمانیەکان بووە زەمانی بلاوبوونەوە شیرك و قەبرپەرستی و شەخص پەرستی و هاوار کردن بۆ پێغەمبەر ﷺ و پیاوچاکان بووە واتا کاتێك کە شێخ رووی کردۆتە کەسێك کە تۆ بۆچی کار بە تەوحید ناکەی تەنها موحید و یەکخوا پەرست بی وە عیبادات هەموی بۆ خوای تعالی تەرخان بکەی إعزاریان هێناوەتەوە (ولا يجوز عند أهل بلدنا إلا من وافقهم ، وغير ذلك من الأعذار ، ولم يدر المسكين أن غالب أئمة الكفر يعرفون الحق) زۆربەی إعزارەکانی ئومەتەکانی پێشوو حەقیان زانیوە بەلام إعزارەکەیان ئەوە بووە کە (ولم يتركوه إلا لشيء من الأعذار) تەرکیان نەکردوە تەنها هەندێك عوزریان هێناوەتەوە

عوزرەکانیان بریتیەبوو :

(كما قال تعالى: ﴿ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا﴾)[1] ثمنی قەلیل دونیایە هەرچەنێك زۆربێت هەر قەلیلە هەرچەنێك تۆ دونیات هەبی هەر قەلیلە تۆ ئایەتەکانی خوای تعالی بە بەدونیایەکی کەم دەگۆڕیتەوە یەکێك لە إعزارەکان ئەم کەسە تەماعی دونیایی هەیە تەماعی سەرۆکایەتی هەیە تەماعی کورسی هەیە دەلێن ئەگەر من وابلێم ئەم رووخێنن ئەگەر وابلێم منصەبەکەم لەدەست ئەچێ و دەرم ئەکەن یاخود دەلێت ئەگەر وابلێم جاهم نامێنی یاخود بەقسەم ناکەن و پشتم تێ ئەکەن کۆمەلێکی زۆری بیانوو ئەهێنەوە بۆخۆیان یاخود لەئێستادا ئەلێ موچەکەم دەبرن و لەمزگەوتەکە دەرم ئەکەن ، ئەگەر بەسەرکردەی دەولەتەکان بلێ وەرە تەوحید جێ بەجێ بکە ئەلێ کاکە ئەوە تۆ باسی چی ئەکەیت ئەلێ خۆ ئەمریکا یەك صاروغم پێوەنێت پارچە پارچەم ئەکا با ئەم دەسەلاتم لەدەست دەرنەچێ واتا بابەتەکە ئەگەڕێتەوە بۆ دونیا ! یان دەلێن گەمارۆی ئیقتصادیمان تووش دەبێ کەوا دەلێن قەت پێغەمبەری خوا ﷺ گەمارۆیی ئیقتصادی نەردرابێ ! کە پێغەمبەران لێیان نەدرابێ!

[1] :سورة التوبة اية ٩

لەوانەی ئەوانەی ئەمڕۆ باسی دەکەن لەم إعزارانە هەمووی بەسەر پێغەمبەران و پیاوچاکاندا هاتووە .

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی : ("حب الدنيا وكراهية الموت)[١] ئەم دوانەیە .

(وغير ذلك من الآيات كقوله: ﴿يَعۡرِفُونَهُۥ كَمَا يَعۡرِفُونَ أَبۡنَآءَهُمۡۖ﴾)[٢]کەواتە ئەزانن ئەمانە پێغەمبەریان ناسیوە ﷺ وەکو چۆن منداڵەکانی خۆیان ئەناسن یەهود لەگەل ئەوشدا شوێنی نەکەووتوون .

تەبعەن لە یەهودی زەمانی پێغەمبەریان پرسیوە ﷺ ئەوە ئەو پێغەمبەرەیە کەوا هاتووە لە تەورات ؟ وتویانە بەلی ئەوە ئەم پێغەمبەرەیە ! وتیانە ئەی موقیفت چیە ؟! وتیانە : هەتا مردن ئێمە دژایەتی ئەکەین !.

کەواتە زانین بەتەنها بەس نیە ئەگەر زانین بەتەنها بەس بوایە و ئینسانی بخستایەتە ئیمان ئەبێ یەهود و فیرعون و ئیبلیس لەپێش هەموو کەسێکەوە ئیماندار بن ! کەواتە عەمەل مەرجە بۆیە ئیمان لەلای ئەهلی سونە و جماعە بەکورتی بریتیە لە (القول والعمل) قەول نیە بەنها وە عەمەلیش نیە بەتەنها بەلکوە پێکەوەیە .

(فإن عمل بالتوحيد عملا ظاهرا وهو لا يفهمه ولا يعتقده بقلبه فهو منافق)ئەگەر بە عەمەلی ظاهیر ئیشی بەتەوحید کرد تێ نەدەگەیشت یاخود باوەری پێ نەبوو تێ نەگەیشتن وەکو ئەوەی بلێن کەسەکە بە تەقلید و چاولێکەری ئەم شتەی دەبرد بەرێوە دینیش بەتەقلید نابێ دین ئەبێت بە عیلم بێ وە یەکێك لە مەرجەکانی (لا اله الا الله) ئەوەیە کە عیلم دەبێ عیلمی هەبێ بەو ئیمانە هەبێ وەئەبێ بزانێ کەوا چی ئەکا .

ئەصلی ئیمان بریتیە :

١-ناسینی خوا و ئیمان بوون بە خوا .

٢-وەکافرکردنی کەسێك کەوا ئیمانی بەخوا نەبێ وە کوفر کردنە بە طاغوتە وەکافرکردنی کەسێك کەوا کوفری پێ نەکا.

ئەبێ تێبگات و بەعیلمەوە بڕواتە ناو ئەم بابەتەوە (اولا يعتقده بقلبه)یاخود لەدلدا ئیمانی پێ نیە بەلام لە کردەوەی ئاشکرا دا ئەنجامی ئەدا وە ئەمە لەزەمەنی پێغەمبەردا ﷺ

[١] : الكتب » مرقاة المفاتيح شرح مشكاة المصابيح» كتاب الآداب» باب تغير الناس

[٢] :سورة البقرة اية : ١٤٦

دەرکەوتووە ،ئێوە سەیربکەن مونافقینی زەمانی پێغەمبەر ﷺ لەترسا مونافق بوون نەیان وێراوە إظهاری کوفری خۆیان بکەن بیانکردایە ئەمکوژران .

بۆنمونە : مونافیقێك نەیتوانی و نەی دەوێرا نوێژ نەکا ئەمەش یەکێکە لە بەلگە بەهێزەکان لەسەر کوفری تارکی نوێژ یەك مونافق نەیدەوێرا نوێژ نەکا ! عبدالله کوری صەبا هەتا ٩ هیجری ژیا هەتا دوای پێغەمبەریش ﷺ نەیوێرا نوێژ نەکا هەرلەدوای پێغەمبەرەوە ﷺ نوێژی ئەکرد لەگەلیشیدا جیهادی ئەکرد نەیدەوێرا بلێ من ئیماندار نیم ! لەظاهیردا ئیماندار بوو ئەگەر چی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەیزانی کەوا ئەهلی نیفاقە بەلام ئێمە حوکمی ظاهیردەکەین حوکمی ظاهیر ئەو کەسە نوێژ دەکا وە (لا اله الا الله محمد رسول الله ﷺ) دەلێت وە نابێت نەواقضی ئیمان بهێنی ،لەبەر ئەوە ئەمانە لەدلیاندا باوەرکە نیە بەلام بە ظاهیر کارەکە ئەکەن (فهو منافق)، بەلام مونافقانی ئەمرۆی ئێمە لەترسدا؟ رەنگە لەترسدا بێ بلێت ئەگەر وانەلێم خەلکی بەچاوێك سەیرم ئەکەن ئەو ئیحتامالە هەیە بەلام زۆربەی مونافقانی ئەمرۆ بۆئەوەیە کەوا موسلمانان تێوە بگلێنن کابرا کافرە و مولحد و بێ دینە دێتە ناو ریزی موسلمانان جاسوسی و نیفاق دەکا ئەو نیفاقە بۆ ئەوە نیە کەوا لەموسلمانەکان ئەترسێ ! نەخێر بەلکو بۆئەوەیە تاوەکو بیانناسێت و بزانێ کێ کێ یە و کێ کێ نیە . ئەوکاتە ئێمەش ئەلێن ئەی قوربەسەرت تۆ لە خوا ناترسی کەوا لەرۆژی قیامەت ئەچیتە بەردەمی ئەو جاسوسیە بۆ کێ ئەکەیت ئەوکەسەی کە تۆ جاسوسی بۆ ئەکەیت لە رۆژی قیامەتدا هیچی بەدەستە دەسەلاتی هەیە !؟ ئەگەر بەحیسابی خۆت دەلێت خوا هەلدەخەلەتێنم لەگەل موسلمانان ئەوە بزانە کەوا خۆت هەلدەخەلەتێنی الله تعالى دەفەرمووی (يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَمَا يَخۡدَعُونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمۡ وَمَا يَشۡعُرُونَ)[١] لەبەر ئەوە نەصیحەتی هەرکەسێك دەکەین کە دەیەوێت جاسوسی بکا و خەلك بەگرتن بدا لەریزی موسلمانان ئەوەندەی پێ ئەلێن کەوا سەیرێکی خوا بکە.

(فهو منافق ، وهو شر من الكافر الخالص) ئەمە مونافقە لەکافری خالص خراپترێکە چونکە کافری خالص هاتوە و خۆی ئاشکرا کردوە و بەئاشکرا تەحدا ئەکا بەس ئەو ناچێ وابکا

[١] :سورة البقرة اية : ٩

(بقوله تعالى: ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾[1] دەرەجات بۆ سەرەوەيە وە دەركات بۆ خوارەوەيە جا درك واتا بۆ نزمترين خوارەوەی جەهەنەم .

(وهذه المسألة مسألة كبيرة طويلة تبين لك إذا تأملتها في ألسنة الناس ، ترى من يعرف الحق ويترك العمل به)شێخ دەلێ : ئەم مەسئەلەيە زۆر گەورەيە زۆر درێژيشە باسكردن لەسەری ئەگەر جوان ڕوودبيتەوە بۆت ڕوون دەبێتەوە لەسەر زمانی خەلكی كەسانێك ئەبينی كەوا حەق ئەناسين و ئەبينن و ئەزانن بەس كاری پێ ناكا . ئەمڕۆ وايە هەر دەلێ ئەزانم كاكە پيم مەلی! بەس كاری پێ ناكا لەبەر چی كارەكەی پێ ناكەی !؟. بيانوەكانيان ئەوانەيە :

(لخوف نقص دنيا)ئەگەر وابكەم كار بەو تەوحيدە بكەم خۆم ئاشكرا بكەم دونيام لەدەست ئەچێ (أو جاه)ياخود كەسەكە جاهێكی هەيە لەلايی خەلكی قەدرێكی هەيە ئەلێ لەدەستم دەرئەچێ گەر وابكەم ياخود دەلێ گەر وابلێم پشتم تێ ئەكەن (أو مداراة الاحد) لێرەدا بەمانا شەرعەكيە نيە مدارات بەلكو بريتيە لە موداهەنە واتا كەسەكە دێت و موداهەنە دەكا .

موداهەنە : كەسەكە ئەزانی ئەوە حەقە بەلام لەگەل ئەهلی باطلدا لەگەل باطلەكەياندا دەڕوا ! ئەچێت بۆيان شل دەكا .

(وترى من يعمل به ظاهرا لا باطنا)ئەبينی كە كەسانێك كە بەباظاهيری ئيشی پێ دەكەن بەلام بەباطنی ئيشی پێ ناكەن يانی موونافقە (فإذا سألته عما يعتقد بقلبه فإذا هو لا يعرفه .)كاتێك پرسياری لێ دەكەی لەوەی لەدليدايە نايزانێ .

شێخ (صالح) دەفەرمووی :

(ختم الشيخ رحمه الله هذه الرسالة بمسألة عظيمة مهمة يجب تفهمها وتعقلها لأنه إذافهمها الإنسان فإنه يدرك أخطاء الناس في العقيدة) ئەلێ : شێخ محمدی كوری عبدالوهاب ئەم ريسالەی بەمەسئەلەيەكی زۆر گەورە كۆتايی پێ ھێناوە كەپێويستە ئێمە تێ بگەين ئەگەر ئينسان تێ بگات ئەوكاتە ئەزانێ هەلەی لەكوێدايە لەعەقيدەيدا (وهذه المسألة هي : أن التوحيد يكون بالقول والعمل والاعتقاد ، لابد من هذه الأمور الثلاثة) شێخ ئيشارەت بەمە دەكا كەوا دەبێ تەوحيد و ئيمان دەبێ بەم سێ شتە بێ كە قەول و عەمەل و ئيعتقاد بێ

[1] سورة النساء اية : ١٤٥

ئەبێ ئەم سێیانە کۆببێتەوە لەئیماندا ئەمانە لەرووکنی پێناسەی ئیماندان ، وە ئەگەر ئێمە پێناسەی ئیمان بکەین ئەبێ وەکو خۆیی پێناسەیی بکەین هەرپێناسەیەك بکەین ئەبێ ئەم سێ رووکنەی تێدا بێ .بۆنمونە : ئێستا پێناسەی ئینسان بکەین نالێن بەس بریتیە لەدەست چونکە مەرج نیە تۆ دەستیشت نەبێ هەر ئینسانی ئەبێ بلێن جەسەد و رۆحە ئەوە پێناسەی ئینسانە .

هەرپێناسەیەك ئەبێ وەکو خۆیی بێ نەبوونی هەرشتێك لەو پێناسەیە نەبوونی شتەکەیە.

لەبەر ئەوە ئەبێ ئاگاداربین کاتێك پێناسەی ئیمان دەکرێی ئەبێ بەشتێك پێناسە بکرێی کە هەریەك لەوشتانەی کە ئەم ئیمانەی پێ پێناسە کراوە نەبوونی ئەوشتە راستەوخۆ نەبوونی ئیمان دەرئەخات.

بۆیە کوتمان قەول و عەمەلە کەواتە نەبەبێ قەول دەبێ نەبەبێ عەمەلیش دەبێ معقول نیە بلێ قەول و عەمەلە دواتر عەمەلیشت نەبوو قەینا وەکو مورجیئەکانی ئەم زەمانەی ئێمە کەبەناوی سەلەفیەتەوە خۆیان دەرخستوە بەوعالەمە ! کە گەورەترین دەرگای شەری کردۆتەوە نوێژ مەکە و زەکات مەدە حەج مەکە رۆژوو مەگرە هیچ شتێك مەکە هەرچی واجباتە تەرکی بکەی !

هەتا بەداخەوە من گوێم لەیەکێکیان بووە کە خۆی بەعالمی ئێستا ئەزانی دێت حەدیسێك لەحەدیسەکان شەرح دەکا ئەدیسی ئەبو ذر(رەزای خوای لێ بێ) کەپێغەمبەری خوا ﷺ وتویەتی : ئەگەر زیناش بکا و هەرچی بکا ئەوە هەر ئیماندارە ! ئەو دێت وا شەرحی دەکا ! تەبعەن پێغەمبەر نەیوتوە ﷺ بە ئەبو ذر ئەگەر یەکێك ئەگەر ئیمانی بەخوا هەبێ هەرچی واجبات هەیە تەرکی بکا هەرچی موحەرەمات هەیە هەر هەمووی بکا ئەوە هەر ئیماندارە وای نەوتوە بەلام ئەو واشەرحی دەکا دەی ئەها وتویەتی (وإن زنا وإن سرق)کابرا نوێژ دەکا و رۆژوو دەگری و حەج دەکا هەموو کردەوەیەك دەکا بەلام دەکەوێتە زیناکەوە یاخود دزیەك دەکا ئەوە ئیماندارە بەلام ئەو دێت وا شەرحی دەکا هەرچی شتێکی پێ وتراوە لە ئەعمال تەرکی بکا هەرچیش حەرام هەیە بیکا منیش بەس بەخۆی دەلێم وەرە جەنابت نە نوێژ بکە نەرۆژوو بگرە و نەزەکات بدە و نەحەج بکە هەرچی واجبات و موستەحبات هەیە هیچی مەکە پاشان وەرە هەرچی خراپ و قەبیحەکان هەیە بیکە لەسەرووی هەموویانەوە دزی بکە وقەتل

بکە ئادەی بەس بزانم ئیمانی تۆ لەکوێدایە؟!ئایا پێغەمبەرﷺئاوای بە ئەبو ذر وت ؟! بەهەلە بەم شێوەیە ئاوەها شەرحی ئەم حەدیسە ئەکەن .

إبن القيم : نەقلی دەکا کەوا ئیجماعی صەحابەیە کەوا تاریکی نوێژ کافرە .

(، لابد من هذه الأمور الثلاثة) نابێت دەبێت ئیمان ئەم سێیانەیان لێ کۆببێتەوە بەلام ئاگادار بن ئێمە لەگەل خواریج و معتەزیلە جیاوازیەکەمان ئەوەیە :

خەواریج : تاکەتاکەی هەموو عەمەلەکان چ رووکن بێ و چ واجب بێ و چ موستەحەب بێ هەمووی بەرووکن دا ئەنێن .

ئەهلی سونە وجماعە : لەئیماندا عەمەلەکان ئەوەی رووکن بێ بەرووکنی دائەنێن وە ئەوەی واجب بی بەجواجبی دائەنین وە ئەوەی موستەحب بی بە موستەحەبی دائەنێن.

کەواتە لە ئەعمالدا رووکن هەیە کە نوێژ رووکنی ئیمانە .

(فإذا اجتمعت هذه الأمور الثلاثة صار الإنسان موحدا مؤمنا بالله ورسوله)ئەگەر ئەم سێیانە کۆبوویەوە لە ئینسانێکدا ئەبێ بە موحید و یەکخوا پەرست بروای بەخوا هەیە و بەپێغەمبەری خوا ﷺ هەیە (وإذا اختل واحد منها لم يكن مؤمنا ولا موحدا)یەك لەم سێیانە نەبوو ئەوا ئەو کەسە نەبرواداره و نەیەکخوا پەرستە .

(وهم في هذا أصناف) خەلکی لەمەشدا چەند بەشێکن :

١-بەشی یەکەم (الصنف الأول من يعتقد التوحيد بقلبه)کەسەکە ئیعتقادی هەیە بەیەکخوا پەرستی (ويعرف أنه لا إله إلا الله)وە ئەزانی هیچ پەرستراوێك نیە تەنها الله تعالى نەبی (وأن عبادة ما سواه باطلة)وە ئەشزانێ پەرستنی غەیری خوا باطله (ولكنه لا يعمل به بجوارحه ، ولا يقر به بلسانه ؛ لطمع دنيوي) بەس ئەم کەسە نایەت کار بەم تەوحیدە بکا(جا ئاگاداربە ئەلێ لايعل بە بجوارحه بۆیە کەسێك نێت بلێت مەبەستی شێخ محمدی کوری عبدالواهب عەمەلەی قەلبیە نەك عەمەلی جواریح لیرە شیخ دەست نیشانی کردو روونی کردەوە ) قەولی زمانیشی نیە بەهۆی تەمەعی دونیایەوە (فهذا كافر ، مثل فرعون)وەکو فیرعون کافرە (فإن فرعون كان معترفا بالتوحيد في قلبه وأن ما جاء به موسى هو الحق) ئەیزانی ئەمە حەقە ئەم تەوحیدەی هەبوو لەدلی خۆیدا وە ئەی زانی ئەوەی کە موسا پێی هاتوە

حەقیشە (ولكنە ترك العمل بە وتظاهر بخلافە وجحدە تكبرا وعنادا) لەبەر تەكبوری و عینادی ئەمەی تەرك كرد هەروەكو خوای گەورە دەفەرموویی : (وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ)[1] ئینكاری ئەو حەقەیان كرد تەبعەن (وَجَحَدُواْ بِهَا)بۆ موعجیزەكانی پێغەمبەر موسا دەگەرێتەوە نۆ موعجیزەكەی كە خوای تعالی باسی دەكا لەسورەتی النمل وە لەسورەتی الأسراء (فِي تِسۡعِ ءَايَٰتٍ إِلَىٰ فِرۡعَوۡنَ وَقَوۡمِهِۦٓۚ)[2] یاخود(وَلَقَدۡ ءَاتَيۡنَا مُوسَىٰ تِسۡعَ ءَايَٰتِۭ بَيِّنَٰتٖۖ)[3] كەبریتی بوو لە دەستی كە ئەیكرد بەناو باخەلیدا و رۆشەن ئەبوویەوە وە لە عەساكەی دەستی وە بریتی بوو لەوسالا نەهامەتیانەی كەوا فەقیری دروست دەبوو وە بەروبووم كەم دەبوو وە تۆفانەكە وە زۆربوونی كولە ئەمانە دەلیلبوون كە موسا پێغەمبەری خوایە (علیە السلام) ئەوان ئەیانزانی لە خواوەیە ئەم شتانە ئەوە بەساحیر ناكری ئەم شتانە ئەیانزانی موعجیزەیە كەچی دواتر ئینكاریان ئەكرد و ئەیانوت نەخێر تۆ پێغەمبەر نیت لەناخیشیان ئەیانزانی كەوا ئەم شتانە بەساحیر ناكرێی ئەمە إلا بەیەكێك دەكرێی كەوا خوای تعالی ئەمەی پێ دابێ كە پێغەمبەرە (وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ)لەنەفسی خۆیان یەقینیان بەمە هەبوو كەواتە ئەمان حەقیان ناسیوە لەبەر زولم كردن تەركیان كرد تەكبوریان ئەكرد (فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُفۡسِدِينَ)[4]دەبینە بزانە لەدوای ئەمە موفسید چی بەسەر دێت جا هەركەسێك وا بێ ئەمە عاقیبەتەكەی دەبێ فیرعەونەكانمان زۆر بینی كە رۆیشت وە زۆریش دەروا بەلام بەداخەوە زۆربەی زۆریان معتەبیرنین بەوەی كەوا رۆیشتوو نابێت بەدەرس بۆیان .

(وقال موسى علیە السلام لفرعون)موسا بە فیرعەونی وت (قَالَ لَقَدۡ عَلِمۡتَ مَآ أَنزَلَ هَٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ بَصَآئِرَ)[5] فیرعون تۆ چاك ئەزانی ئەم ئایەت و موعیزانە هی خوای تعالی یە ئەوە هی من نیە من ئەوەم پێ ناكرێی وەكو ئینسان ئەگەر خوا پێم نەبەخشێت (لقد علمت أي عرفت بقلبك ما أنزل هذه الآيات التي جئتك بها إلا رب السماوات والأرض بصائر

[1] :سورة النمل اية : ١٤
[2] :سورة النمل اية : ١٢
[3] :سورة الإسراء اية :١٠١
[4] :سورة النمل اية : ١٤
[5] :سورة الإسراء اية :١٠٢

للناس) چاو ڕۆشنی بۆ خەلکی بۆ ئەوەی بزانن دەلالەت بکا بۆ ئەوەی ئەبێ تەونها خوای تعالی بپەرسترێی ئەبێ ئەوانەی کەوا خاوەنی بینایین ئەمە بکەن بەلگە لەسەر ئەوەی کە تەنها خوای تعالی شایەنی پەرستنە ئەو خوایەی کەوا ئێمەی دروست کردوە ئەبێ ئەو بپەرستین ئەبێ بەقسەی ئەو بکەین.

(فهذا دليل على أن فرعون كان مستيقنا بقلبه صدق ما جاء به موسى عليه السلام) دەلیلە لەسەر ئەوەی کە فیرعون بەیەقین چاك دەیزانی کە پێغەمبەر ڕاست دەکا (وإنما جحد ذلك وتظاهر بجحده كحال كفار قريش) قوریشەکانیش وەکو فیرعونیان کرد (قال الله فيهم: قَدۡ نَعۡلَمُ إِنَّهُۥ لَيَحۡزُنُكَ ٱلَّذِي يَقُولُونَۖ فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ)[1] خوای تعالی دەفەرموویی ئێمە ئەزانین ئەی محمد ﷺ ئەوەی ئەوان بەتۆ دەلێن کە دەلێن درۆ دەکەی یان شێتە یاخود ساحیرە و بەدرۆت ئەخەنەوە ئەو بەدرۆخستنەوەی ئەوان بۆتۆ ئێمە ئەزانین ئەوە تۆ غەمبار دەکا (فَإِنَّهُمۡ لَا يُكَذِّبُونَكَ ) خوای تعالی تەئەکید بۆ پێغەمبەر دەکاتەوە ﷺ دەفەرمووی : والله لەناخی خۆیاندا وانیە (وَلَٰكِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ يَجۡحَدُونَ) بەلام ستەمکاران و کافران و موشریکان بەئایەتەکانی خوای تعالی ئینکاری ئەکەن لەدلیاندا ئەزانن کەوا حەقە .

واتا ئێستاکە پێویست دەکا بڕۆین و بەخەلکی بلێن بەتایبەتی سەرکردەکان وەرن ئەوە حەقە چاك ئەزانن هەموویان چاك ئەزانن لەبەر ئەوە تەرکیان کردوە إعزار هەیە ئەلێ سەرۆکاتیەکەم ئەڕوا حدودەکەم دەڕوا پارەکەم دەڕوا وناوبانگم دەڕوا و لەبەر تەماعی دوونیایی ، ئەی مامۆستایی ئاینی بۆ تۆ نایلێت ؟! دواتر دەرم دەکەن ئاخر لەمزگەوت ئەی بۆ پێغەمبەریان ﷺ لە کەعبە دەرنەکرد ! گەر حالەکە ئەوهابووبایە ئەبوایە لەپێش هەموویان ئەو بیوتایە کەوا مادەم دەرم دەکەن قەینا هیچ نالێم با دەرم نەکەن لەگەلیاندا موداهەنە دەکەم کێشە نیە یەکێك لەگەورەترین موصیبەت ئەمڕۆ موصیبەتی مامۆستای ئاینیە کەتۆ لەناو مزگەوتەکەدا نەتوانی (لا اله الا الله ) بەئەهلی مزگەوتەکەت بلێ ئیعتراف بەوە بکەی بلێ وەرن ئەمە ئیمانە ئەمە حەقە ئەوەی وانەبیت بەم شێوەیە ! هەتا ئەمریت و هەرکەسێك بەدواتەوە بێ ئیعتقادی هەبی بەمردوان و بەزیندووان ئیعتقادی بەخوای تعالی

[1] :سورة الأنعام اية : ٣٣

نەبێ بەوەی کەوا پەرستراوی راستەقینەیە بەتەنها تۆ کەسێکت بەدواوە بێ ئیعتقادی بەدیموکراسیەت و وجودیەت و ئەریکا و ئەوروپا هەبێ وابزانی رزگارکەری ئێمە ئەوروپا بێ ئەمە کەی تەوحیدە تۆ بلاوت کردۆتەوە ! یاخود یەکێك لەدواتەوە نوێژ بکا هەتا مردن هەر بلێ یارسول الله یا عبدالقادر یاهاوار ،، ئەمەی کەی تەوحیدە تۆ بلاوت کردۆتەوە .ئەلێ ئەگەر من لابەن کەسێکی خراتر دێنن من لەوێیم باشترێکە ئەوە یەکێکە لەگەورەترین عوزرەکانیان لەمرۆدا ئێ باشە تۆ جیاوازیت چیە لەگەل ئەودا !ئەویش نایکا تۆش نەت کرد هەردوولاتان کارتان بە تەوحید نەکرد جیاوازیتان نیە کەواتە زانین بەس نیە ئەبێ کردەوەشی لەگەلدا بێ (دلت الآية على أن كفار قريش يصدقون بالرسول بقلوبهم) کەواتە کافرینی قوریش باش ئەیانزانی کەوا پێغەمبەر راست دەکا ﷺ لەدلیاندا (ولكن يجحدون ذلك بظواهرهم وألسنتهم)بەلام بەزمان و بەکردەوەکانیان ئینکاریان ئەکرد .

(وكما قال الله سبحانه وتعالى في اليهود) هەروەکو لە حەقی یەهودا ئەلێت (ٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْرِفُونَهُۥ كَمَا يَعْرِفُونَ أَبْنَآءَهُمْ)[1] ئەوانەی کە ئێمە کیتابمان پێدان پێغەمبەریان چاك ئەناسی کەوا کە پێغەمبەری خوایە ﷺ ئەیانزانی کە ئەوە کە لەتەوارات و ئینجلدا باسکراوە هەموو سیفەتەکانی تیدابوو بەلام ئیمانیان پێ نەدەهێنا بابەتەکە ئەوە نەبوو کە نەیاندەزانی بەلکو دەیانزانی (يعرفون هذا بقلوبهم ويتظاهرون بالكتمان والجحود مع تيقنهم في قلوبهم بأن محمدا رسول الله، وأنه جاء بالحق من عند الله عزوجل ولكن منعهم الكبر والحسد من اتباعه)ئەوەی مەنعی ئەوانی کرد کەوا شوێنی بکەون کیبر و حەسەد حەزیان ئەکرد لە بنی ئیسحاق بێ لە بنی يعقوب بێ نەك لەبنی إسماعيل بێ (واعتقادهم بقلوبهم لا ينفعهم فهم كفار مخلدون في النار. ) ئیعتقادی ئەوان بەدلیان کەبروایان هەیە بەحەقیقەتی شتەکانی ئیمان هیچ سودێکیان پێ ناگەیەنی ئەوان کافرن بەهەتا هەتایی لەئاگری جەهەنەمن .

(وكثير من عباد القبور اليوم على هذا)ئەلێت گۆر پەرستەکانی ئێمەش ئاوان ئەمرۆ (يقولون : نعرف أن الذي تقولون هو التوحيد)ئێمە ئەزانین تەنها خوایە بەلێ راستە (ولكن ما نقدر أن نخالف أهل بلدنا لأن أهل بلدنا عندهم أضرحة واستغاثة بالأموات)ئێمە ناتوانین ئەمە

[1] :سورة البقرة اية : ١٤٦

مخالەفەی گۆڕپەرستی و یاسا پەرستی بکەین ئەوانەی لەگەل ئەوانەدا ئەڕۆن شتێکیان پیّ بلێن بلێن ئەوە هەلەیە و ئەوە شیرکە چونکە زۆربەی ئەهلی ولاتی ئێمە گۆریان هەیە یاخود ئێستا یاسا و پەیرەوەیان هەیە وە هانا بۆ مردوان ئەبەن (ولانقدر أن نخالفهم ؛ لأجل أن نعيش معهم)ئێمە ناتوانین مخالەفەیان بکەین بۆ ئەوەی بتوانین لەگەلیاندا بژین ئەمرۆ چ لەلایەنی سەرکردەکانی عالمەوە بیّ چ لەلایەنی خەلکیشەوە بیّ گۆر دەپەرسترێی و کراوەتە رەمز بەچاوی خۆمان ئەوشتانە ئەبنین . !

پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی رازی نەبوو بەهیچ شێوازێك داوای دەکرد لە خوای تعالی کەوا گۆرەکەی نەکرێی بەشوێنی پەرستن . کە ئێستا خۆتان ئەبنین کەوا خەلکی ئەچیتە ئەوێی ئەلیّ یارسول الله هاوار والعياذبالله ئینجا هی ئەو دروست نەبیّ هی غەیری ئەو چۆن دروستە !

ئەبیّ قەبری فلان کەس هەموو سالێك ئەبێت بچیتە سەری ئەگەر نەچین موچەکەمان دەبرێت بۆیە ناتوانین نەچین (ولا نقدر على مجابهة الناس فهم يوافقون الكفاروالمشركين على عقائدهم) کەواتە ئەوان موافەقەی ئەو کافرو موشریکانە دەکەن لەسەر عقیدەکەیان ئەوانیش وەکو ئەوان وان بابشزانی ئەوە کوفرە ، چەندین مامۆستای ئاینی هەیە ئەزانی کەوا ئەو گۆر پەرستیە حەق نیە کەچی ئەچیت و عوزر ئەهێنێتەوە عوزرەکەشی قبول نیە .

(إما أن يفعلوا مثل فعلهم وهم يعتقدون بطلان ذلك ، وإما أن لا ينكروا عليهم ولا يبينوا الحق) وەکو ئەوان ئەکەن و ئەشزانن کەوا ئەوشتەی ئەوان ئەی کەن باطلە بەلام لەگەلیان دەرۆن یاخود ئینکاری ناکەن لەسەریان (ولا يبينوا الحق بل ربما يدافعون عنهم) وەجارای واش هەیە دیفاعیشیان لیّ ئەکەن (وهذا هو واقعهم الآن)ئەمرۆ واقیعەکە وایە کەواتە شێخ ئەوانەی هەموو خستە بازنەی گۆر پەرستەکانەوە .

(ويقولون :لمن دعاهم إلى الحق) بەوکەسانە ئەلێن کەداوایان ئەکا بۆ حەق ( :هذا الرجل خارجي) ئەوە کەسێکی خواریجە ، ئەمە یەکێکە لەبابەتە گەورەکانی ئەمرۆ بەداخەوە زۆریش بەداخەوە کە پیّ ئەلیّ یەکخوا بپەرستە ئەو حاکمانەی کەوا بەدینی خوا حوکم ناکەن ئەو خەلکەی کەوا بەتەوحیدی خالص حوکم ناکا کاتێك ئەلیّ ئەمە شیرك و کوفرە ،پێت ئەلیّ ئەو تۆ خاریجی و ئەوکەسە خاریجیە نسبتە بۆلای خەواریج !

خواريج كێن ؟

ئەوكەسانەن كەوا بەتاوان و معصيەت خەلك كافر دەكەن نەك بە كوفر.

ئەگەر بەكوفر كەسێكت كافر كرد تۆ خاريجی نيت تۆ ئەهلی حەقيت و ئەهلی سونە و جماعەيت .

جياوازی لەنێوان (خواريج و ئەهلی سونە و جماعە)

*ئەهلی سونە وجماعە : سەيری هەلوەشێنەرەوەی سێيەم بكە لە هەلوەشێنەرەوەكانی ئيسلام (من لم يكفر المشركين أو شك في كفرهم أو صحح مذهبهم : كفَرَ إجْماعاً) تۆ بەعەكسەوە كافر دەبی ئەهلی سونە و جماعەت دەر ئەچی ئەگەر وانەكەی ئەو دەلێ تۆ خاريجيت .

جا دەبێ ئەمرۆ لەزۆربەی دانيشتنەكاندا بۆ خەلكی رۆشەن بكرێتەوە خەورايج و ئەهلی سونە و مرجيئە كێن . !ئەمرۆ زۆربەی ئەهلی وسونە بە خاريجی ناو ئەبرێت تەكفيری و خاريجی . ! ئەهلی سونە و جماعە تەكفيری نين ! ئەوەتا لە هەلوەشێنەرەوەی سێيەمدايە دە بيسرنەوە بلێن ئەوە هەلەی كردوە ئەگەر بە شديدی دا ئەنين بەلگە بهێنەوە كەوا هەلەيە بەلام شديد بووە لەسەر حەق وە كافری كردوە بەحەق .

بەلێ دەبێ شدەی لەسەر كوفر و شيرك بكا خۆ وەكو تۆ نيە موداهەنە بكا شلی بكەيتەوە ئەگەر ئيبليس خوای تعالی نەيوتايە كافر بەويشت نەدەوت كافر چونكە دەلێت (إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلۡعَٰلَمِينَ)[1] ئەلێ ماشاء الله موسلمانێكی بەهێزە ! لەخوا ئەترسێ .

پێی دەلێن (وهذا الرجل جاء بمذهب خامس)ئەوە مەزهەبی پێنجەمی هێناوە (وهم يعتقدون أن ما جاء به هو ما جاء به الرسول ﷺ وهو مقتضى الكتاب والسنة)چاكيش ئەزانن ئەوەی ئەو هێناويەتی لەكيتاب و سونە دەری هێناوە .

ئەگێرنەوە لەشوێنێك كەسێك هەر قسەی بە محمدی كوری عبدالوهاب وتوە هەر كيتابێكی بينبايی نوسرابا محمدی كوری عبدالوهاب ئەيوت فرێی بدەن ! دواتر چوون ناوەكەيان لەسەر كيتابەكە لادا بەس كيتابی تەوحيديان بۆ بردوە كە خوێندوويەتەوە لەو سەرتائەوسەر

[1] :سورة المائدة اية : ٢٨

وتویەتی جا خۆ ئەوە هەمووی قورئان و حەدیسە لەسەر سەرم وتیان پێ ئائەمەیە کە محمدی کوری عبدالوهاب نوسیویەتی .

کەواتە یعتقدون زۆریان هەیە ئەزانن کەوا ئەمە حەقە کەیە بەلام سەیردەکەی هەرناوی ئەم پیاوە هات تەواو ئەمە خاریجیە !

(وإنما حملهم الحسد أو الكبر أو الطمع في أمور الدنيا)چی وای لێکردن کەوا ئەم حەقە بلاو نەکەنەوە یاخود ئینکاری بکەن ؟ هەمووی حەسەد و کیبر و تەمەع و ئموری دونیایە وە هۆکاریش زۆرن باش بزانن .

وە یەکێك لە هۆکارەکان جەهلە یاخود شوێن کەوتنی هەوای خۆیەتی ئارەزووی خۆیی یاخود شوێنکەوتنی کوێرانەی علماء یان وە لەلای خۆی دژایەتی تەقلید ئەکا کەچی خۆیی کەوتۆتە گەورەترین تەقلیدەوە فلان عالم وای وت تەواو ! ئەمە خەتی سورە چۆن ئەبێ ئێمە بیشکێنین .

(لأنهم يظنون أنهم إذا وافقوا على هذا الحق وقبلوه سيخسرون رئاستهم ، ويخسرون أموالهم ، ويخسرون جاههم عند الناس. )ئەگەر موافەقەی ئەم حەقە بکەن زۆرشت لەدەست ئەدەن ! خەلکیان لێ دوورئەکەوێتەوە پارەی دونیایان لێ دوور ئەکەوێتەوە سەرکردایەتیان لێ دوور ئەکەوێتەوە خەسارەتی ئەمانەیان لێ دەکەوێت ! لەبەر ئەوە ئینسانی مخلیص و موحید وانیە ئینسانی مخلیص و موحید لەقورئاندا سەیریان بکە زۆربەی زۆریان لێدراو دەرکراو دەربەدەرکراو بەردە باران کراوبوون گوێیان نەداوەتە دونیا پێغەمبەران وانەبوون !.؟ صالحین وانەبوون؟! لەتاریخی قورئاندا سەیربکە لەباسی موشرکین و باسی موحیدین بزانە موشرکین دائیمەن لەئەهلی سونەیان داوە لەئەهلی حەق و تەوحیدیان داوە ئەوانیش کەوا موحیدن گوێیان نەداونەتێ و خوای تعالی بەنمونە هێناویەتیەوە سوتێنراو دەرکراون وە لێدراون .

٢-بەشی دووەم (والصنف الثاني من وافق في الظاهر) لەظاهیردا موافەقەی دەکا (ونطق بالتوحيد) ئەلێت (لا اله الا لله و محمد رسول الله)( وقال هذا هو الصحيح وهذا هو الحق) وەدەلێت ئەوە حەقە (وصلى وصام وصار مع المسلمين لكن في قلبه لا يعتقد هذا) وەکو

وتمان مونافقینی زەمانی پێغەمبەر ئاوابوون ﷺ لەترسا وابوون نەیان دەوێرا وانەبن (ویعتقد أن هذا خرافات ، وأنه تقاليد بالية ، فهو لم يعمل به ولم يتكلم به إيمانا ، وإنما عمل به وتكلم بهنفاقا ، كحالة المنافقين الذين هم في الدرك الأسفل من النار) وێنەی مونافقەكانی زەمانی پێغەمبەرن ﷺ (لأنهم يقولون بألسنتهم ما ليس في قلوبهم)بەزمان شتێك ئەلێن ئەوەی كەلەدلیاندایە ئەوە نیە.

خوای تعالی دەفەرمووی (إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ ١ ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً)[١].

(إِذَا جَآءَكَ ٱلۡمُنَٰفِقُونَ قَالُواْ نَشۡهَدُ إِنَّكَ لَرَسُولُ ٱللَّهِۗ)ئەگەر مونافیقەكان هاتن بۆلات ئەی محمدی ئەوانە شایەتی ئەدەن لای تۆ ئەلێن شایەتی ئەدەین كەوا تۆ رسولی خوای ! ئەمە لە رووكەشدا بەلام لەدلدا وانین لەدلیاندا رقیان لەپێغەمبەرە ﷺ رقیان لەخوایە بۆیە خوای تعالی دەفەرموی (وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ إِنَّكَ لَرَسُولُهُۥ)خوای تعالی ئەزانی كەوا تۆ پێغەمبەری ئەویی (وَٱللَّهُ يَشۡهَدُ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ لَكَٰذِبُونَ)خوای تعالی شایەتی ئەدا كەوا ئەوانە درۆ ئەكەن وە شایەتی دانەكەی خوای تعالی لەسەر ئەمانە لەسەر ئەوەیە كەوا مونافیقەكان درۆ ئەكەن لەوەی شایەتی ئەدەن و بەراستی وانالێن بەدلیان نیە بەس تەنها بەزمان ئەیلێن ٱتَّخَذُوٓاْ أَيۡمَٰنَهُمۡ جُنَّةً)[٢] ئەو سوێندەی كەوا دەیخۆن ئەلێن والله ئێمە موسلمانین ئەم سوێندەیان بۆ ئەوە بەكاردێنن بۆ خۆپاراستنە تاوەكو تۆ لێیان نەدەی یاخود ئێستا بۆ خۆ پاراستن بۆ زۆر شتی تر وەكو وتم ئێستا هەیبەتی موسلمان نەماوە مونافق بێت لەترسان موسلمان بێت هەیبەتەكەی ئەوەندە نیە لێ بترسێ ئەگەر وانەبم دەمكوژێی كەسەكان بە ئاشكرا كوفر دەكەن بەكەیفی خۆیی وتیشمان هەیە لەبەر خەلك دەلێت با بەچاویكیتر سەیرم نەكەن با خۆم ئاشكرا نەكەم بەدرۆ خۆی بەموسلمان دائەنێ لەدلیشدا كافرە بەس وەكو وتمان زۆربەیان ئەمرۆ ئەو نیفاقەیان بۆ هەلخەلەتاندنی موسلمانانە بۆئەوەیە كەوا خەلكی بروایان پێ بكەن كەوا ئەوانیش برواداربن ئەلێن خۆشمان ناگۆرینەوە بەهیچ موسلمانێك كەچی درۆش دەكەن گەر موسلمانی كوا كردەوەت كوا تەوحیدت !

[١] :سورة المنافقون اية :١-٢
[٢] :سورة المنافقون اية :١-٢

كەواتە ئەوانيش لەولايەنەوە كە دەيانەوێى ئەو ئيمانەى كەوا ئاشكراى ئەكەن بە حيسابى خۆيان هەندێك شت بەزمان ئاشكرا ئەكەن خۆيان پىٛ بپارێزن لەوەى كە خەلكى بەچاوێكيتر سەيرى نەكەن چونكە گەر ئيعلانى كوفر بكا زەرەر دەكا لەلاى خەلكى لەبەر ئەوە دەلێن ئێمە موسلمانين كە موسلمانيت كەوا تەوحيدت ؟!

(فالناس مع التوحيد ثلاثة أقسام: )ئينسانەكان لەگەل تەوحيدا سىٛ كۆمەلن :

١-كۆمەلەى يەكەم : (القسم الأول : من يعرفه ويؤمن به باطنا ويجحده ظاهرا وينكره. ) ئيمانى هەيە بەم تەوحيدە لەدليدا بەلام لە ظاهيردا ئينكارى دەكا .

٢-كۆمەلەى دووەم : (القسم الثاني : من يتكلم به ويعمل به ظاهرا وينكره ويكفر به باطنا، وهم المنافقون)لە ظاهيردا ئيمان ئاشكرا ئەكا بۆ خەلكى بەلام لەناخيدا ئيمانى پىٛ نيە ئەمەش مونافيقەكانن .

٣-كۆمەلەى سىٛ يەم : (القسم الثالث : من يعتقده باطنا ويعمل به ظاهرا وباطنا)هەيە لەناخيدا ئيمانى پىٛ هەيە لەدليدا وە كاريشى پىٛ دەكا لەظاهير و لەباطندا .

(والقسمان الأولان كافران خاسران والقسم الثالث مؤمن مفلح. ) كەواتە كۆمەلەى يەكەم و دووەم كافرن وە كۆمەلەى سىٛ يەم ئيماندارو سەرفرازە .

ئەوەى كەوا كار بە تەوحيد دەكا لەداخيلى و رووكەشدا ئەو ئيماندار و سەرفرازە .

شێخ محمدى كورى عبدالوهاب دەفەرمووى :

(ولكن عليك بفهم آيتين من كتاب الله) پێويستە لەسەرمان كەوا دوو ئايەت لەقورئان ئێمە لىٛ تىٛ بگەين ئايەت زۆرە لەقورئاندا وە قورئان هەمووى باسى يەكخوا پەرستى و تەوحيدە هەرچ ئايەتێك ئەهێنى دەلالەتە لەسەر تەوحيد و يەكخوا پەرستى دەلەلات لە لا اله الا الله ئەكا وە دەلالەت لەوە دەكا كەوا دەبىٛ تەنها خوا بپەرسترێى وە ئێمە بىٛ بڕواين بەرامبەر بە هەموو شتێك تەنها الله نەبىٛ .

*یەکەم ئایەت : (أولاهما ما تقدم من قوله: لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ)[1] واتا ئێوە عوزر مەهێنەوە ئێوە کافربوون لەدوای ئەوەی کەوا ئیمانتان هەبوو ئێستا کافربوون بەهۆی ئەو کوفرەی کەوا کردتان .

ئەمەباسی (فإذا تحققت أن بعض الصحابة الذين غزوا الروم مع رسول الله ﷺ كفروا بسبب كلمة قالوها على وجه اللعب والمزح ، تبين لك أن الذي يتكلم بالكفر أو يعمل به خوفا من نقص مال أو جاه أو مداراة لأحد ، أعظم ممن تكلم بكلمة يمزح بها . )ئەگەر تۆ بۆت روون بوویەوە کەوا هەندێك لە صەحابەکان کەوا لەگەل پێغەمبەردا ﷺ کاتێك کەوا کە چوون بۆ غەزووی رۆم غەزوەی تەبوك لەکاتی گەورانەوەیاندا کەهاتنەوە لەرێگادا هەندێك گالتە و گەمیان کرد کۆمەلێکیان . وتەکانیان ئەوە بوو کەوا وتیان : گەوایە پێغەمبەر و صەحابەکان ﷺ ئەمانە سك برسین و درۆزنن وە ترسنۆکن ئەمەیان لە گالتە و گەمە وت لەنێوانی خۆیاندا ئابەم کەلیمەیە کافربوون (كفروا بسبب كلمة قالوها على وجه اللعب والمزح)بەگالتە و گەمە ئەمیان وت هەتا ئەیانوت ئێمە باوەرمان وانیە .

بۆت رۆشن دەبێتەوە (تبين لك أن الذي يتكلم بالكفر) ئەی ئەو کەسەی ئەزانی کەوا ئەمە کوفرە ئەیکات (أو يعمل به خوفا من نقص مال)کوفر ئەکا لەترسی ئەوەی کەوا مالی کەم نەبێ یاخود قەدری لەلای خەلکی نەشکێی یاخود موداهەنەی خەلکی دەکا (أعظم ممن تكلم بكلمة يمزح بها)حالی ئەم خراترە لەحالی ئەمانەی پێشوو کە ئەوان بە تەحقیق کافربوون (لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ)[2]) عوزر مەهێنەوە بەهیچ شێوازێك دیفاع لەخۆتان مەکەن ئێوە کافربوون بەم کەلیمەیە .

خالێکی زۆر گرینگ هەیە لێرەدا باسی ئەکەین ئەویش بابەتی کوفری ظاهیرە(ئاشکرا)یە.

کوفری ظاهیر لەهەرکەسێك هاتە جێ ئەوە ئەوکەسەی پێ کافر دەبێ هەتاوەکو جەهل بەم کوفرەشی ناخوا عوزری جەهلیشی بۆ نیە کەسێك کە تەوحیدی نەبوو کەسێك کە کوفری کرد ئەوە کافرە .

[1] :سورة التوبة اية : ٦٦
[2] :سورة التوبة اية : ٦٦

بەداخەوە ئەمرۆ كەسانێك هەن ئەگەر كەسێك جوێن بە خوا و بە پێغەمبەر بدا ﷺ ئەلێن ئەبێ بزانی كەوا ئەمە ئیعتقادی بەدل هەیە یاخود نا واتا دەبێ ئێمە بچین لەو خەلكە بپرسین بزانین كەتۆ جوێن بەخوا وبەپێغەمبەری خوا ﷺ ئەدەی لەدلدا ئەزانی ئەمە حەرامە یاخود حەرام نیە !؟ ئەگەر وتت حەرام نیە ئینجا پێ كافر دەبی !! ئەگەر بلێ ئەمە حەرامە بەلام من هەر جوێنی پێ ئەدەم ئەوە كافر نابی! سەیری ئەم بێ عقلایەتیە بكە سەیری ئەم مەزهەبە گومرایە بكە .

من پرسیارێك دەكەم ئەو كەسەی كەدێتە ناو دینەوە بە مەرجەكانی لا اله الا الله دێتە ناو دینەوە ئەبێ بزانی خوا چەند گەورە و بەرێزە وە ئەبێ بزانی لەو زیاتر نابێ بپرسترێی وە پێغەمبەر محمد ﷺ چەند بەرێزە نابێ دەنگی لەئاستیدا بەرز بكرێتەوە چ جای جوێنی پێ بدرێی ! ئەبێ ئەمانە بزانێ ئینجا هاتۆتە ناو ئیمانەوە ئەگەر ئەمانە نەزانی نەهاتۆتە ناو ئیمانەوە !

كەواتە ئەم خەلكە یان نەهاتۆتە ناو ئیمانەوە یاخود كە هاتوە بە هەلوەشێنەرەوەیەكی ئاوا راستەوخۆ كافر دەبێت .

ئەبو جهل كاتێك كە جوێن بەلات و منات و عوزا بدرایە شێت دەبوو ! لەبەر ئەوەی الاه ئەبێ گەورە بكرێی مەبەستمان هەركەسێك شتێك بكا بە خوا بۆخۆی بەگەورەی بكا ! ئێستا بێ عقلی وامان هەیە خۆشەویستەكەی بەخوا و بە پێغەمبەر نا گۆرێتەوە قسەیەكی پێ بوترێی خۆی لەسەر بەكوشت ئەدا هەمووشتێك وایە ئەوكەسەی تۆ بەگەورە رای ئەگریت ئەبێ حورەمەت ورێز و بەگەورەی دابنێ ئێمە كە خوای تعالی بە گەورە را دەگەرین لەدوایدا تۆ بێت جوێنی پێ بدەیت ئەمە واتای چی ! ئەگەر بلێن بابێن ئەمە بەحەلال دابنی و یاخود بەحەلال دانەنێن تاوەكو كافری بكەین ئەمە بێ عەقلی نیە ئەم قسەیە! پەنا ئەگرین بەخوا لەم بێ عەقلیە ! لەم كافربوون و گومرایەتیە .

كەواتە كوفر هەیە ظاهیرە وە كوفر هەیە خەفیە ئەو كوفرەی كەوا ظاهیرە لێ راناوەستین شوبهاتی زۆر هەیە لەسەر وتەكانی شێخ محمدی كوری عبدالوهاب كە زۆربەیان وەلام دراوەنەتەوە هەتاوەكو شوبهات هەیە لەسەر وتەكانی شێخ الاسلام ابن التیمیە كە گەوایە ابن التیمیە معین (دیاری كراو) كافر ناكا ! ئەمەیە یەكێكە لە فیتنەكانی ئەمرۆ كە بەناو

سەلەفیەكانیەكان بلاوی دەكەنەوە یاخود عیبارات دەهێنن لە ابن التیمیە و ابن القیم یان شیخ محمدی كوری عبدالوهاب یان ئەولاد و ئەحفادەكانی كەوا ئەوان موعینیان كافر نەكردوە ! دێن ئەو حەقیقەتە دەپچڕێنن كەوا ئەوان مەبەستیان پیێ لەكافرنەكردنی ئەو حالەتانەیەكە كوفرێكی خفیە و شاراوەیە نەك كوفرە ظاهیرەكان لەبەر ئەوە لەلای شێخ محمدی كوری عبدالوهاب وەلەلای شێخ الاسلام ابن التیمیە یان هەركەسێكیتر لە علماء یان ئەلێن ئەگەر بێتوو كەسەكە شیركێكی ظاهیری كرد بە شیركەكەی كافر دەبێ وەكو بلێ : یارسول الله یاعبدالقادر ، یاخود شوێنی یاسا دەستكردەكان بكەوێی و پەیرەو وبەرنامەی غەیری ئیسلامی قبول بكاو شوێنی بكەوی ئەمە گومانی تێدا نیە ئەمە كەسە موحید نیە .

من موناقشەیەك لەگەل ئەو بەناو سەلەفیانە ئەكەم ئەلێم : ئەگەر كەسێك بلێ یارسول الله ئەمە لەلای خواتعالی موحیدە !؟ ئەگەر وتی :بەلی ، من دەلێم درۆ ئەكەی موحید نیە . ئەگەر وتی : نەخێر ، ئێمەش دەلێن تەواو ئێمەش هەر ئەوەندەمان وتوە كەواتە ئەگەر موحید نەبێ موشریكە ئیتر بۆخۆت گێل دەكەی ! ناوێرم بلێم ئەوە موشریكە ! قەولەكەی شیركە بەس خۆیی موشریك نیە ! ئەم شوبهە گەورەیان هەیە ئەم هەندێك كەس لەم زەمەنەی خۆماندا وتویانە بەلام ئەوە هەندە خۆ پێغەمبەر نیە ﷺ تۆ بلێ خەتی سورە نابێ بیشكێنی بە پێچەوانەوەی چەندەها كەسیتر لە علماء وتویانە نەخێر ئەوە شیركە لەبەر ئەوە دەبێ وریابین .

هەتاوەكو كەلامی شێخ محمدی كوری عبدالوهاب یان هێنا كە گەوایە ئەلێ : ئێمە خەلكی كافر ناكەین دواتر كەلامەكەی دەپچڕێنن ئەلێ ئەمە لە ئموری خەفیدایە هەتاوەكو پیێ نەلێن ، ئەما ئەگەر شتەكە ئاشكرا بوو هیچ دەقەیەك لەسەری راناوەستین كافری دەكەین .

إبن التیمیە دەفەرمووی : هەركەسێك ئەگەر خوای نەپەرست ئەوە موشریكە ئەوە موحید نیە ئەو كەسە .

ئی باشە ئەگەر موحید نەبوو تۆ چۆن دەیخەیتە دائیرەی ئیمانەوە !؟

بەلام ئەوەی پێویستە بزانین ئەم كەسە یان ئەم حالەتەی زانیوە یاخود نەیزانیوە :

*ئەگەر زانی :ئەوە ئەو كەسە لەسەر ئەم كوفرەی موعذب دەبێت .

*ئەگەر نەیزانی بێ :ئەوە ئەمری بۆ خوای تعالی بەلام لەلای ئێمە موشریکە واتا خوای تعالی تاقی دەکاتەوە لەرۆژی قیامەت

*دووەم ئایەت : (والآية الثانية قوله تعالى: مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١٠٦ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ)[1] .

الله تعالی دەفەرمووی (مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ)هەرکەسێك کافربێ بە خوای تعالی لەدوای ئەوەی کەوا ئیمانداربووە مەگەر کەسێك کە بەزۆرە ملەیی بە ئیکراه کوفری پێکرابێ وە لەدلیشدا ئیمان هەبێ .

ئیکراه :

جۆری هەیە ئیکراهێك ئەگەر بێتوو ببێتە هۆکاری کوشتن وەکو لەسەرت ئەلێ ئەتکوژم ئەگەر وانەلێت لێت ئەدەم و هەموو رۆژێك بیست دارت لێ ئەدەم واتا تەهدیدەکە محقق بێ ، بەلام ئەگەر تەهدیدەکە محقق نەبێ بەس قسەیەك بێ یاخود ترسی خۆت بێ وەکو دەلێ ئەگەر وابکەم لەلای خەلکی رێزم نەمێنی ئەگەر وابکەم زۆربەی ئەم خەلکە پشتم تێ ئەکەن یاخود رەنگە کەسێك تەهدیدی بکا بەلام هیچی لێ نەکا بەس بیترسێنی علماء یان ئەفەرموون ئەمە ناچێتە خانەی ئیکراه و تەهدیدەوە ئەبێ تەهدیدەکە محقق بێ بیگریت و لێبدرێت هەتاوەکو علماء یان باسی سجنیان کردوە ئەلێن سجنەکە تەعزیب و ئازار و نارەحەتیەکانی لەسەربێ ئەما هەر گرتنێکی بەسیطبێ نابێ و ناچێتە ئەو خالەوە ئیمام احمد یەکێك بوو لەوانە سجن کراوە .

لێدان علماء یان ئەیکەن بەدوو بەشەوە :

بەشی یەکەم : ئەلێن ئەگەر کەسەکە پێشەنگ بوو نابێ قبولی بکا نابێت ئەم ئیکراهە قبول بکات و کوفرەکە بکا با لێدان بخوا وبابچێتە زیندانەوە ئەوەتا ئیمامی أحمد وای لێهات لەبەر ئەوە ئیمامی أحمد لەگەل یەحیای کوری معین قبولی ئەوەی کرد کەوا وەکو ئەوان بلێ لۆمە یەحیایی کرد ئیمامی احمد .

[1] :سورة النحل اية : ١٠٦-١٠٧

بەشی دووەم : كە عەوامی خەلكییە تەحەمولی لێدان ناكا باشترین شت بۆئەوان بریتیە لەوەی كەوا لە پێناوی خوادا بروات و قبولی داواكاری ئەوان نەكا بەلام كاتێك قبولی ئەوەشی كرد ئەوەی ئەوان داوای لێدەكەن بەمەرجێك لەدلیدا ئیمانی تەواوەتی هەبێ وە تنازول نەكا لەدلی خۆیدا ئەوكاتە ئەبێتە عوزرێك (إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَٰنِ)خۆ ئەگەر لەدلیدا لەوكاتە پێ خۆشبێ ئەوە كافر دەبێ نابێ وابێ لەدلیدا ئەبێ زۆر رقی لەوشتە بێ كە ئەوان پێ دەلێن چونكە كەس ناتوانی لە خوا زیاتر كەوا ئیكراهی دل بكا ئیكراهی قەول ئەكرێی یاخود كردەوە بەلام ئیكراهی دل ناكرێی تەنها خوای تعالی پێ دەكرێی .

شێخ ئەلێ (فلم يعذر الله من هؤلاء إلا من أكره مع كون قلبه مطمئنا بالإيمان)خوای تعالی كەسی مەعزور نەكرد تەنها ئەوانە نەبێت كەوا ئیكراهیان پێدەكرێی لیدان و كوشتن و سجن كردن و تەعزیبدان ئەوانیتر خەلكی تری معزور نەكرد ئەگەر هاتوو تەوحید نەبا بەرێوە بەهەر هۆكارێك بی (وأما غير هذا فقد كفر بعد إيمانه سواء فعله خوفا أو مداراة)غەیری ئەو ئیكراهە ئەو كەسە كافر دەبێ پێ لەترسا وەكو ئەوەی ئەلێ ئەترسم ریش بهێلەمەوە وەكو ئیسلام بم یان ئەگەر ژنەكەم عەبا وپەچەی پێ ئەترسم ئەم ترسە ناخوا ! ئینجا ئەگەر تۆ وانەكەی و من وانەكەم دەبێ هەموومان دەست بەرەلا بكەین تەوحید مەخوێنە و هەركەس لەمالی خۆی ! خوای گەورە وای وتوە یاخود فەرموویەتی (قُمْ فَأَنذِرْ ۝ وَرَبَّكَ فَكَبِّرْ)[1] بەخۆشەویسترین كەسی خۆیی وتوە كە پێغەمبەرە ﷺ هەلسە دامەنیشە . وە ئەم هەلەسە دامنەشیەش لەكاتێكدا بووە كەوا لەوپەری تەعزیب و ئازاردان و نارەحەتیدا بووە .

(فعله خوفا أو مداراة)ئەمرۆ ئەم ترسە هەیە كەوا ترسێكی وەهمیە خۆ ئەگەر ترسەكەش هەبێ لەحالەتێكدا تۆ ئەگەر بشگیرێت لەسەر ئەم دین و ئیمانە بۆكوێی ئەچێ ! بەداخەوە ئەوەندە تەماعی دونیا خۆشبوە لەژێردانماندا ئەوەندە تەمەن خۆشەویستبوە كەوا تۆ بژیت ئەچیتە فیردەوس نەخێر هەر ئەبێت بمریت ئەو ترسەیە وای لەئێمە كردوە حەقیقەت نەلێن و ئیمان بلاو نەكەینەوە كەسانێكم لێ پەیا ئەبن ئەگەر وابلێن وادەبێ ئەگەر وابكەین وا دەبێ

[1] :سورة المدثر اية : ٢-٣

!؟ ئی وایە کاکە دین وایە بۆخۆیی ! دین ئەبێت بیگەیەنیت والله لەپێناویشدا ئەبێ شەق بخۆیی و بکوژرێیی ، ئی خۆ خوای تعالی باسی کردوە لە قورئاندا .
کەچی ئەوان دەڵێن ئەگەر تۆ وابکەی ئەوکاتە خەڵکانێك تووش دەبن تۆ مەسئول دەبی لێیان کەواتە پێغەمبەری خوا ﷺ مەسئول بووە لەهەموو ئەو صەحابانەی کەوا کوژراون کە لێدراون وئەزیەت دراون و دەربەدەر کراون کەواتە گوناهبار بووە لەسەر ئەمە حالەتانە !!

(أو مداراة أو مشحة بوطنه أو أهله أو عشيرته أو ماله) دیسانەوە باسی موداهەنەی کرد ئەمانە هەمووی عوزرن کەوا کەسەکان دەیهێنەوە و هیچیشی نابێت بە عوزر بۆیی .
(وأما غير هذا فقد كفر بعد إ يمانه سواء فعله خوفا أو مداراة أو مشحة بوطنه أو أهله أو عشيرته أو ماله أو فعله على وجه المزح أو لغير ذلك من الأغراض إلا المكره)خوای تعالی ش لەوەی زیاتری دەرنەکرد بەهەر موناسەبەیەکیتر تۆ ئەم دین و تەوحیدە تەرك بکەی و نەگەیەنیت تۆ لێت قبول ناکرێی لەلایەن خوای تعالی وە .
(والآية تدل على هذا من جهتين) ئایەتەکە لە دوولان دەلالەت لەمانە دەکا :
١-( الأولى من قوله: إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ ) فلم يستثن الله إلا المكره )[1]إلا ئەو کەسەی کە بەزۆر کوفری پێدەکرێی ئەمە خوای تعالی ئەوی دەرهێناوە (ومعلوم أن الإنسان لا يكره إلا على العمل أو الكلام) ئینسان ئیکراهی لەسەر ناکرێی لەسەر دل بۆیە زانراوە ئیکراه تەنها لەسەر قەول وکردەوە دەکرێی ئەگەر پێت بلێ بەدل وابلێ ئەو نازانێ تۆ وادەڵێت یاخود نا بەلام بە قەول و کردەوە دەزانی ئەگەر وانەلێت لێت ئەدا ئەتکوژی (وأما عقيدة القلب فلا يكره أحد عليها. )هیچ کەسێك لەسەر عقیدەی دل ئیکراهی لەسەر ناکرێی .
٢-( والثانية قوله تعالى: ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّواْ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْأَخِرَةِ)[2]لەبەر ئەوە کافربوون (فصرح أن هذا الكفر والعذاب لم يكن بسبب الاعتقاد أو الجهل أو البغض للدين أو محبة الكفر ، وإنما سببه أن له في ذلك حظا من حظوظ الدنيا فآثره على الدين)ئەوەکەسە بۆیە کافربوو لەبەر ئەوە بوو کەوا دونیایی هەلبژارد بەسەر ئاخیرەتدا .

[1] :سورة النحل اية : ١٠٦
[2] :سورة النحل اية : ١٠٦-١٠٧

ئەمرۆ زۆر ئەبیستینەوە کاکە من چومەتە ناو حیزبی فلانەوە خۆ باوەریشم پیٚ نیە بەس لەبەر پارەکەیە لەبەر ژیانەکەم ئەوەتا خوای تعالی دەفەرمووی (ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ)[1]( ٱشۡتَرَوۡاْ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلٗا)[2] (والله سبحانه وتعالى أعلم والحمد لله رب العالمين ، وصلى الله على محمد وآله وصحبه أجمعين. )شێخ محمدی کوری عبدالوهاب کۆتایی بەریسالەکەی هێنا .

شێخ(صالح) دەلیٚ :

(نعم إذا عرفت هذه القاعدة وهي معرفة ما يحصل به الإيمان الصحيح فإنه يجب أن تعرف ما يضادها من الأقوال والأفعال) ئەگەرتۆ ئەم قاعیدە گرینگەت زانی کە ئەویش ئەوەیە کەوا ئیمانی صەحیح بەچی دەست دەکەوێت ئەبیٚ بزانیٚ کەوا بەچی ئەم ئیمانە لەدەست ئەچیٚ لە قەول و کردەوە .

(ومن ذلك الكلام الذي يتكلم به الإنسان وه من نواقض الإسلام)ئەم خالە زۆر گرینگە واتا تۆ هەر ئەوەندە نیە بلیٚ بروادارم ئیتر پەیوەندیم نیە بەکوفرەوە ونابێت بزانم بەچی ئەو ئیمانە هەلدەوەشێتەوە ، پێویستە لەسەرت بزانی بەچی ئەوئیمانەت هەلدەوەشێتەوە . هەزار جار ئیماندار بی کە تۆ هەلوەشێنەرەوەیەکت بەسەردا هێنا ئیمانەکەت هەلدوەشێتەوە (لكنه يمزح به فإنه يكفر ، ولو كان ليس جادا في كلامه) جاری واهەیە تۆ قسەیەك دەکەی بەگالتە وگەمە پیٚ کافردەبی ، ئەمرۆ چەند لەم شتانە ئەبیستی لە کۆمەلگای ئێمەدا گالتە بە ریش ئەکا و گالتە بە حیجاب ئەکا گالتە بەنوێژ دەکا گالتە بەزەکات دەکا گالتە بەهەمووشتەکان دەکا لەدیندا خۆشی بەموسلمان ئەزانی بە حیسابی خۆیی هەر بەفشە هەمووشتێکی بردوە بەرێوە ئەوکاتە پێت دەلێن تەواو تۆ کافری و دەرچووی لەدینی ئیسلام ئەبیٚ ئاگاداری خۆت بی (فالدين ليس فيه مزح) دین گالتە و گەمەی تێدا نیە دین ئەبیٚ بەجدی بگیرێی (يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖ)[3].

(والدليل على ذلك قصة هؤلاء النفر الذين خرجوا مع رسول الله ﷺ في غزوة تبوك لغزو الروم لما بلغ الرسول ﷺ أن الروم يجمعون على غزو المسلمين)کاتێك کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ پیٚ

[1] :سورة النحل اية : ١٠٦-١٠٧
[2] :سورة التوبة اية : ٩
[3] :سورة مرم اية : ١٢

راگەیشت کەوا رۆمەکان لە مەدینە غەزووبکەن ئەویش خۆیی ئامادە کردو ئەورۆیشت بۆیان (من ئەوەندە ئەلێم رۆم زیاتر بوون یان ئەوانەی لەگەل پێغەمبەری خوا بوون ﷺ!؟ لەپێناوی خوا ئەچیتە دەرەوە لێرەشدا کەمینە و لاوازی نابیتە بەلگە لەسەر ئەوەی کەوا هیچ نەکەین هیچ کاتێك نەبوە پێغەمبەری خوا ﷺ کەم نەبێت بەرامبەر بەکافران . ئەوخالەش گرینگە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ لەمەککەدا ئەمری پێنەکراوە هەتاوەکو خباب وە غەیری ئەوان کاتێك کەوا باسی ئەوە دەکرا بۆ ئێمە هەلنەستین ئەیوت ئەمرمان پێنەکراوە جارێی ! ئەگەر ئەمرم بکرێی کەمیش بیت ئەبێ بڕۆیت (كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ ٱللَّهِ)[1] یانی پێغەمبەری خوا ﷺ کەلەبەدەردا سەرکەوت بەشەجاعەتی خۆیان بوو ! (وَمَا رَمَيْتَ إِذْ رَمَيْتَ وَلَٰكِنَّ ٱللَّهَ رَمَىٰ)[2] بەئیزنی خوا بووە ومەلائیکەی بۆ ناردن وە مەسەلەکە مەلائیکەش نەبوو ئەوە بەشارەتیك بوو بۆیان ئەگینا خوای تعالی کارەکە دەکا با ئێستا سەیربکەین ئەگەر خوا لەپشتمان بێ و حەق بین یەك بین و دوان بین و هەرچەند بین بەرامبەر بە ملیۆنەها ناتوانین بجەنگین ئەگەر خوا لەگەلمان بێ ! ئەوە ئیمانە صەحابە ئەوها شەریان ئەکرد ئەمرۆ ئەوە نەماوە !ترس و خەوف پاشان خۆشەویستی دونیا ترس لەمردن و خۆش ویستنی دونیا وای لەموسلمان کردوە هەرزەلیل بن هەتا ئێمە ئەو دووسیفەتەمان تێدابێ هەر ئەبێ دابنیشین و زەلیل بین .

(فالنبي ﷺ بادر في وقت الحر وشدة القيظ)پێغەمبەری خوا ﷺ لەوپەری گەرمایەتیدا چوو (والصيف ووقت طيب الثمار والمسافة بعيدة من المدينة إلى توبك)تۆ بەس بیخە بەردەمی خۆت ئەم مەسافە دوورە لەم گەرماییە ئەم کەمیەتیە و زۆریەتی ئەوان (وإن ناسا من الذين خرجوا مع الرسول ﷺ جلسوا في مجلس يمزحون) بەمەرجێك ئەوان لەگەل پێغەمبەر دەرچوون ﷺ بۆ جیهادەکە و هاتوونەتەوە موجاهیدیشن ئینجا ئەم کەلیمەیان لەدەم دەرچوە ئینجا خوا کافری کردن ئەصلن ئێستا کابرا جیهاد بەحەرام ئەزانی بەتیرۆرستی ئەزانی هەروتت جیهاد کەلیمەیەکە وەکو شەیطان وایە لای خەلکی کەچی ئەوان وانەبوو لایان چوون بەس بەکەلیمەیەك کافربوون کە لەکاتی هاتنەوەکەیاندا وتیان (قال واحد منهم :

---

[1] :سورة البقرة اية : ٢٤٩
[2] :سورة الأنفال اية : ١٧

ما رأينا مثل قرائنا هؤلاء أرغب بطونا ، ولا أكذب ألسنة ، ولا أجبن عند اللقاء يعنون رسول الله ﷺ وأصحابه)ئەوانە نەوسنن و درۆزنن ئەوانە ترسنۆكن بەم شێوەیە بە پێغەمبەر و صەحابەیان وت ﷺ (وكان في المجلس غلام من الأنصار فأنكر عليهم وقال: كذبت ، ولكنك منافق ، لأخبرن رسول الله ، فلما ذهب هذا الفتى ليخبر الرسول ﷺ وجد الوحي قد سبقه)صەحابەیەك ئاگای لەم بابەتە بوو وتی : والله تۆ مونافقی ئەم قەسەیەت كرد سەیركەن ڕاستەوخۆ وتی تۆ مونافقی ! مونافیقیش ئاشكرایە واتا كافرە ! لەكافریش خراپتر وە معین بوو كەچی ئەمرۆ دەڵێن نابێ تەكفیری معین بكرێی چۆن تەكفیری معین ناكرێی كەسێك كەوا هەڵوەشێنەرەوەی ئیمانی هێنا كەسێك كەوا كوفری كرد و چوە ناو بازنەی كوفرەوە تۆچۆن پێ نالێ كافر ! ئەی هەڵوەشێنەرەوەی سێ یەم نالێت ئەوەی كەوا كافر كافر نەكا خۆی كافر دەبێ .، ئەو ڕاستەوخۆ پێ وت تۆ مونافقی هەروەها دەلیلی تریشمان هەیە ئیمامی عومەر(ڕەزای خوای لێ بێ )بەحاطبی وت: مونافق بەپێغەمبەری وت (دَعْنِي أَضْرِبُ عُنُقَ هذا المنافق، )[١] ئی خۆ ئەوە معین بوو وە دیاریشی كرد ئەمانە لەگەل پێغەمبەریشدان ﷺ ئەمانە لەناو بازنەی ئیمانیشدان لەپێش چاوی خەلكیدا (، فلما ذهب هذا الفتى ليخبر الرسول ﷺ وجد الوحي قد سبقه) كە ئەو دەچی وەحی هاتۆتە خوارەوەی خوای تعالی بەپێغەمبەری وتوە ﷺ كەئەمانە ئەم قسەیان كردوە .

(ونزل على الرسول ﷺ قوله تعالى: وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ )[٢]

(وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ )ئەگەر پرسیاریان لێ بكەی بۆچی ئەمەتان وت دەڵێن ئێمە بەگەمە و گاڵتە وامان وت ڕێگە درێژ و مەشەقەت بوو ویستمان بیبرین و چەند كەلیمەیەكی سوبعەت پێ كەنین بكەین . خوای تعالی پێیان دەلێ (قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ)تۆ پێیان بلێ هیچ نەماوە گاڵت و گەمەی لەسەر دابمەرزینن خوا و ئایەتەكانی و پێغەمبەری خوا نەبێ ﷺ ئێوە هیچ

[١] : الكتب » صحيح البخاري» كتاب المغازي» باب غزوة الفتح وما بعث حاطب بن أبي بلتعة إلى أهل مكة يخبرهم بغزو النبي صلى الله عليه وسلم

[٢] :سورة التوبة اية : ٦٥-٦٦

عوزرێك مەهێننەوە ئێوە کافربوون بەو قسەی کەوا کردتان ، ئینجا لەدوای ئەوە دەبیٚ ئەم کەسە تەوبە بکا ئەگەر تەوبە نەکا ئەوە بەردەوامە لەسەر کوفرەکەی و کافرە ئەگەر داوای تەوبەی لێکرا تەوبەی کرد ئەوە گەرایەوە ئەگەرنا ئەبیٚ حەقی خۆیی وەربگرێت لەناو دەولەتی ئیسلام !

(فجاء هؤلاء إلى الرسول ﷺ يعتذرون ويقولون : يا رسول الله ما قصدنا إلا المزح)هاتن وتیان ئێمە لەدل و باوەرمان نەبووە قسەکە ئێمە بەس گەمە و گالتەمان کردوە (حديث الركب نقطع به عنا الطريق ، ولا يزيد الرسول ﷺ على تلاوة الآية ولا يلتفت إليهم)پێغەمبەر ﷺ هیچی نەدەوت هەر دەیوت (لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ)[1] هەر عوزرێکیان هێنایەوە قبول نەبوو چونکە ئەمە کوفری ظاهیرە نەیوت بزانم لەدلتانەوەیە ! وەکو ئەمرۆ مورجیئەکان وا ئەلێن (فإذا كان هؤلاء كفروا بالله وارتدوا)ئەگەر ئەمانە کافربوون و هەلگەرانەوە لەدین (وقد كانوا مسلمين من قبل بسبب كلمة قالوها على وجه المزح واللعب) پێشتر موسلمان بوون لەگەل پێغەمبەردا و نوێژیان دەکرد جیهادیان ئەکرد کاتێك کەلیمەیەکیان وت بەهۆی ئەم کەلیمەیەوە پیٚ کافر بوون کە بەسوبعت و گالتە و گەمەش وتیان (فكيف بمن يقول كلام الكفر لا من باب المزح وإنما من باب المحافظة على ماله وعلى جاهه وعلى مكانته)ئەگەر کەسێك لەبەر سوبعەتی نەبیٚ بەلکو من ئەو کوفرە ئەکەم من ئەو شیرکە ئەکەم با مالەکەم بپارێزم پیٚ با قەدر و جاهی خۆم بپارێزم (وهذا شر من المازح)ئەمە لەوەیتر خراپترە (لأنه اشترى الحياة الدنيا بالآخرة) لەبەر ئەوی دونیای کری وە ئاخیرەتی کرد بە نرخەکەی چوو گۆرانگاری کرد بەس دونیام بدەنی ئاخیرەتم ناوێی وا دەلیٚ !

(فالحاصل أن الذي يتكلم بكلمة الكفر لا يخلو من خمس حالات: )ئەو کەسەی کەوا کوفر دەکا لە پێنج حالەت دەرناچیٚ :

١–حالەتی یەکەم (الحالة الأولى : أن يكون معتقدا ذلك بقلبه فهذا لا شك في كفره. )کەسەکە بەدل وابلێت ئەوە هیچ گومانی تێدا نیە ئەو کەسە کافرە .

[1] :سورة التوبة اية :٦٦

٢-حاڵەتی دووەم (الحالة الثانية : أن لا يكون معتقدا ذلك بقلبه)لەدڵيدا باوەری بەو كوفرە نيە (ولم يكره على ذلك)ئيكرهيش نەكراوە لەسەری (ولكن فعله من أجل طمع الدنيا) بەس بۆ دونيا ئەويەوی دونياكەی خۆيی بەسەر بەرێت ئەگەر موحيدی راستەقينە بێ دونيايی دەست ناكەوێی لەبەر دەڵێ نا بادونيام لەدەست دەرنەچێ (أو مداراة الناس وموافقتهم)موداهەنەی خەڵك دەكا ياخود موافەقەی خەڵكی دەكا (فهذا كافر بنص الآية) ئەوەش كافرە بە نەصی ئايەتەكە كە دەفەرمووی ((ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسْتَحَبُّوا۟ ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَا عَلَى ٱلْـَٔاخِرَةِ)[1] جا ئەم لەم شتە زۆر ئەبنين كاكە من ئەزانم ئەوانە كافرن و وەكو ئەبو لەهەب وان چەندجارمان بيستوە لەم قسانە بەس لەبەر دونياكە ناروات بەم شێوەيە .

٣-حاڵەتی سێ يەم (الحالة الثالثة : من فعل الكفر والشرك موافقة لأهله وهو لا يحبه ولا يعتقده بقلبه)دێت موافەقەی ئەهلی شيرك ئەكا خۆشيشی ناوێن وە بەدڵيش لەگەڵياندا نيە (وإنما فعله شحا ببلده أو ماله أو عشيرته. )لەبەر ئەوەی حەز ناكا ماڵ و عەشيرەت و ولاتی خۆيی بەجێبهێڵێ دێت لەگەڵ ئەواندا موافەقەيان دەكا ئەزانێ كەوا هەڵەيە ئەويش هەر كافرە .

٤-حاڵەتی چوارەم (الحالة الرابعة : أن يفعل ذلك مازحا ولاعبا) بەگاڵتە و گەمە ئەوكوفرو جوێن و سوكايەتيان بلێ (كما حصل من النفر المذكورين ، وهذا يكون كافرا بنص الآية الكريمة. )هەروەكو ئەوانەی پێشوو باسمان كردن بەنەصی ئايەتەكە كافربوون .

٥-حاڵەتی پێنجەم (الحالة الخامسة : أن يقول ذلك مكرها لا مختارا)ئەمە بەزۆر پێ ئەكرێی (وقلبه مطمئن بالإيمان)وە دڵكەی پريەتی لە ئيمان (فهذا مرخص له في ذلك دفعا للإكراه)ئەمە ئەتوانی بەس ئەگەر نەيكات باشترە گەر بشمريت بەشەهيدی ئەچيتەو بۆلای خوای تعالى بەس ئەگەر كوفر ياخود فعلە كوفريەكەشت كرد تۆ لەم حاڵەتە عوزرت پێدراو وەكو باسمان كرد دەبێ ئيكراهێكی محقق بێ و نابێ ئيكراهێكی خەيالی بێت ترسێكی وەهمی هەبێ ئەمە نا شتەكە لە سەتا سەت وابێ ئەو كەسەی كەوا ئيكراهت دەكا لەسەر ئەو قەول و كردەوە كوفرييە ئەبێ دەسەلاتی هەبێ دەسەلاتی نەبێ نابێ و نابێت بەئيكراه

[1] :سورة النحل اية : ١٠٦-١٠٧

حالەتێکی تر هەیە ئەبنیین لەم ڕۆدا ئەو ئیکراهانەی کەوا دەکرێی بەس ترسە کەسەکە ئەترسێنن ئەگەر وانەکەی وات لێدەکەین کەچی ناشی کەن بەس ئەیترسێنن کەچی ئەویش بە ترسەکە تەسلیم ئەبێ (وأما الأحوال الأربع الماضية)غەیری پێنجەم کە باسمان کرد کە ئیکراه دەکرێی چوارەکەی پێشوو (فإن صاحبها يكفر كما صرحت به الآيات)کافر دەبێ وەکو چۆن ئایەتەکان باسیان کردوە .

(وفي هذا رد على من يقول إن الإنسان لا يحكم عليه بالكفر ولو قال كلمة الكفر أو فعل أفعال الكفر حتى يعلم ما في قلبه)ئەمە رەدە بۆ ئەوکەسانەی کەوا دەلێن کەسەکە بەکافر دانانرێی ئەگەر کەلیمەی کوفریش بلێ و کردەوەی کوفریش بکا هەتا ئێمە لەدلی نەپرسین !بزانین بە دل إستحلالی کردوە یاخود إستحلالی نەکردوە ! کوفر إستحلالی بۆچیە خۆ ئەمە معاصی نیە زینایەکەی کرد یاخود نەزەرێکی کرد بلێن ئاوەرە حەلالت کرد یان حەرامت کرد ئەوکاتە بلێن کافری ئەمە کوفرە إستحلالی بۆ چیە مجرد کردنی کوفرەکە بۆخۆیی کوفرە وەکو ئەو ئایەتەی شێخ هێنایەوە ((لَا تَعۡتَذِرُواْ قَدۡ كَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡۚ))[1] پێغەمبەر هیچی لێ پرسین ﷺ بەلکو بەپێچەوانەوە ئەیانوت بەدلماندا نەهاتوە ئەم شتە حیساب نیە مادەم بەزمان وتوتانە.

کوفر سەربەخۆیە هەمانە بەدل هەمانە بەزمان هەمانە بە کردوە ئەوانە کوفرن (وهذا قول باطل مخالف للنصوص وهو قول المرجئة الضلال. )ئەوە قەولی مرجيئە ضالە لادەرەکانن ئەوانەی خەلکیش لەحەق لائەدەن ئەمرۆ زۆرە لەم گروپانە ئەگەر بلێ کابرا ئەوە جوێنی بەخوا داوە ئەوە کافربووە ئەلێ کاکە کافری مەکە ئەوە جاهیلە ! جوێندا بە خوا و بە پێغەمبەری خوا ﷺ جەهل تێدا مقبولە ؟! والعياذبالله .

(وذكر الشيخ رحمه الله قاعدة عظيمة في الإكراه الذي يعذر به والذي لا يعذر به حيث قال)ئینجا ئەلێ : قاعیدەیەکی گەورەی باسکردوە لەو ئیکراهەی کەوا عوزرتێدا مقبولە (ومعلوم أن الإنسان لا يكره إلا على العمل أو الكلام ، وأما عقيدة القلب فلا يكره أحد عليها) هیچ کەسێك ئیکراه ناکرێی لەسەر دل وەکو وتمان دەبێ ئیکراهەکە محقق بێ .

---

[1] :سورة التوبة اية ٦٦

لێرەدا وەلامی چەند شوبهەیەکی تر ئەدەینەوە لە کیتابی (التوضيح والتتمات علي كشف الشبهات شيخ علي خضيري) کەوا لەم کیتابەدا (فصل في التتمات) باس دەکا شێخ .

شێخ(على خضيري)دەلێ : (وقبل الانتقال إلى القسم الاخير نذكر التتمات التي فيها شبهات والرد عليها) هەندێك شوبهات دەهێنێتەوە کەوا دەکرێت بخرێتە پال شوبهاتەکانی شێخ محمدی کوری عبدالوهاب لەریسالەی کشف شوبهات هێناویەتی وە رەدی لێ ئەداتەوە .

یەکەم :

(الشبهات التي في كتاب مفيد المستفيد في كفر تارك التوحيد للشيخ محمد بن عبدالوهاب والرد عليها) ئەم کیتابی (مفيد المستفيد فى كفر تارك التوحيد)یەکێکە لە کیتابەکانی شێخ محمدی کوری عبدالوهاب کە پێویستە بخوێنرێیی بەراستی زۆر لەقوتابیانی عیلم بێ ئاگابیە لەم ریسالەیە کە لەم ریسالەدا زۆر بەئاشکرایی باسی ئەوە دەکا کەوا ئەگەر کەسێك تەرکی تەوحیدی کرد بەتەئەکید ئەو کەسە کافرە .

تەوحیدیش وەکو ئاشکرایە :بریتیە لە یەکخوا پەرستی چ لە ربوبیەتیدا وە چ لەالالوهیەتیدا وە چ لە ئەسماء وصيفاتيدا .

ئەوانەی کەوا پەیوەستە بەوکەسەی کەوا ئەو تەوحیدە تەرك بکا ئەو تەوحیدە ظاهیرەیە کەوا ئەگەر مخالەفەی بکا . واتا تەوحید کە بەرامبەرەکەی کە شیرکە ئەگەر هەر شیرکێك کرا شیرکەکە ظاهیر بوو ئەوکەسە لێ قبول ناکرێی لەلای خوای تعالى جا ئەگەر بزانی یاخود نەزانی چونکە ئەم کەسە بەهیچ جۆرێك لەناو دائیرەی تەوحیدا نەمایتەوە .

کەسێك کە شیرکێکی ظاهیر بکا پێ دەوترێی موحید ؟ نەخێر پێناسە ناکرێی بە موحید کەواتە ئەمە موشریکە .

بۆیە لەم ریسالەیەدا کە نوسیویەتی بۆ ئەهلی زەمانی خۆیدا بلاوی کردۆتەوە ئەفەرمووی : کافرە ئەوکەسەی کەوا عیبادەتەکان بۆ غەیری خوا بگەرێنێتەوە مخالەفەی تەوحیدی ظاهیربکا واتا شیرکی ظاهیری هەبێ .

(والرد عليها ومن الشبهات التي كشفها المصنف وفندها)واتا شێخ محمدی کوری عبدالوهاب یەك لەو شوبهاتانەی کەوا لەم کیتابەدا باسی دەکا کەوا موشریکەکان دەلێن وە گەر ئێمە سەیر بکەین زۆربەی کەسانی ئێستاش هەر ئەمە دەلێن بەتاییەتی ئەوانەی کەوا خۆیان بەسەلەفی دەزانن کاتێ خۆی ئەوانەی کەوا رەدیان لە شێخ محمدی کوری عبدالوهاب ئەدایەوە هەرچەند زۆر کەیفیان بە ابن تیمیە نەدەهات ئەگەران بەدوای کیتابەکانی ابن تیمیە تاوەکو بزانن و شتێکی تێدا بدۆزنەوە کە بۆخۆیان چۆن لێ تێگەیشتوون بچن و نیشانی بدەن و بلێن ئەوەتا ابن تیمیە کەتۆ دەلێ درێژکراوەی عقیدەی ابن تیمیەم ئەوەتا خۆ ئەو وا نالێ ! ئەهاتن بەوە دەیان ویست رای بوەستێنن ئەیانوت مورشریکەکان (قولهم): (إن ابن التيمية لا يكفر المعين) ابن تیمیە تەکفیری معین ناکا واتا بە عموم تەکفیر دەکا بەلام کەسی دەست نیشانکراو تعین ناکا بۆ ئەوەی پێ بوترێی کافر ! ئەمە یەکێك بوو لە شوبهاتەکان ئێستاش ئەم شوبهاتانە هەیە .

(ولذا قال المصنف (وأنا أذكر لفظه(أي ابن التيمية)الذي احتجوا به على زيغهم ثم ذكره فقال)ئەم کەلامە کەلەلای ابن تیمیە وە هاتوە بزانین چیە (قال ابن التيمية :أنا أعظم الناس نهيا أن ينسب معين إلي تكفير أو تبديع أو تفسيق أو معصية) ئەمە ئەهێنن و ئەلێن ابن تیمیە وتویەتی من لە هەموو کەسێك زیاتر خەلکی نەهی دەکەم لەوەی کەوا کەسێکی دیاری کراو بدرێتە پال ئەوەی کەوا کافر بکرێی یان تبدیع بکرێی یان تفسیق بکرێی یاخود بدرێتە پال معصیتەوە و بوترێی ئەو کەسە فاسقە بەو معصیەتەوە (إلا إذا علم أنه قد قامت عليه الحجة الرسالية التي من خالفها كان كافرا تارة وفاسقا اخرى وعاصيا أخرى انتهت كلام ابن التيمية)ئەلێ إلا مەگەر زانرا کەوا ئەم کەسە حوجەی ریسالەی لەسەر ئیقامە کراوە وە ئەم کەسە پێی ناسێنراوە وە ئەم کەسە لەجەهالەتدا نەماوە مەگەر ئەو کەسە مخالەفەی بکا ئەوکاتە ئەبێ بەکافر ئەگەر شتێکی هێنا کەپێ کافربێ یان ئەبێ بەفاسق ئەگەر شتێکی هێنا کە پێ فاسق بێ یان ئەبێ بەعاصی .

نەصی عیبارەتەکە ئاوایە بەلام ئەوان هاتوون کەلامی ابن تیمیەیان پچراندوە هەر ئەوەندەیان هێناوە (قال ابن التيمية :أنا أعظم الناس نهيا أن ينسب معين إلي تكفير) یانی بەهیچ شێوەیەك ئەو کەسی دەست نیشانکراو تەکفیر ناکا !

(هذه هي الشبهة التي تمسكوا بها وبنوا عليها أن إبن التيمية لايكفر المعين) ئەمە ئەو شوبهەیە کەوا دەلێن إبن تیمیه کەسێکی دەست نیشانکراو کافر ناکا (وأخذوا صدر كلامه (أنا أعظم الناس نهيا أن ينسب معين إلي تكفير)وتركوا ما بعدها )هەرئەوەندە هەروەکو لە پێشتر باسمان کرد کەوا کەلامی شێخ محمدی کوری عبدالوهاب ئەهێنن کەوا وتویەتی ئەگەرکەسێك کە بکەوێتە کوفرەوە ئێمە کافری ناکەین هەر ئەمەندە بەلام شێخ دەفەرمووی ئەمە لەمەسائیلە خفیەکاندایە نەك مەسائیلە ظاهیریەکاندا کەچی ئەوە دەپچڕێنن و ئەوە ناهێنن .

شێخ (عەلی )دەفەرمووی (وهذه الشبه موجودة في وقتنا الحاضر)ئەم شوبهەیە ئەمڕۆ لە کاتی ئێمەشدا هەیە (فيوجد من يمنع عن تكفير المعين وإنما يكفر النوع ويقول إن هذه هو قول إبن التيمية)ئەلێ کاکە ئێمە ئەبێ جۆرەکە کافر بکەین نەك کەسەکە واتا دەبێ بلێن کەسێك کە هاواری کردە غەیری خوا بلێن ئەوە شیرکە بەس کەسەکە کە هاواری کردوە موشریك نیە ! ئەمڕۆ ئەمە زۆرە لەناو خەلکیدا .

شێخ (عەلی )دەلێ (أما كشف المصنف لهذه الشبهة فقال ما ملخصه:)ڕەدی ئەم شوبهانەی داوەتەوە بەم خالانە :

١-(إن كلام ابن التيمية قبل أن تبلغه الحجة لقوله(إلا إذا علم أنه قد قامت عليه الحجة الرسالية التي من خالفها كان كافرا تارة) کەلامی شێخ پێش ئەوەی کەوا کەسەکە حوجەی لەسەر قیام بێ واتا پێ بوترێی و پێ بناسێنرێی .ئەمەش زۆر جار باسی ئەوەمان کردوە وتومانە بابەتی ئیقامە حوجە لەسەر کەسانێك کەوا نەزانن بۆ تەعزیب دانیانە لە کوفرە ظاهیریەکان واتا معذبیش دەبن لەسەری ئەمە پێش ئەوە هەر موشریك و کافرن بەلام معذب نابن .

٢-(رد المصنف الثاني: أن كلام ابن التيمية السابق في المسائل الخفية)ئەوەیە کەوا لەمەسئەلە خەفیەکاندایە (وليس في المسائل الظاهرة التي يعلمها الخاصة والعامة المسلمين)کە هەموو کەسێك لەوەی تایبەت بێ و لەوەی عەوامی خەلکی بێ واتا ئەهلی عیلم بێ یان عەوامی خەلك بێ ئەیزانن کەوا ئەمە کوفرە (ثم ذكرنصا لابن التيمية مأخوذ من كتابه (نقض المنطق)ذكر فيه مثالا على ذلك فى ردة أحد المتكلمين وذكر اسمه لما صنف في دين

المشركين، ووجد الدلالة أنه لم يقل حتى تقام عليه الحجة، بل لا يتصور ذلك لأنه مات قبل عصر ابن التيمية)لێرەدا لە کیتابی (نقض المنطق) شێخ الاسلام ابن تیمیە نمونەیەك ئەهێنێتەوە کەئەلێ شێخ (عەلی) دەربارەی کافرکردنی یەکێك لە موتکەلیمەکان[1] باسی رازی دەکا کەوا لەوێدا کافری کردوە وە نالێت (حتى تقام عليه الحجة)چونکە ئەو لەپێش ابن تیمیەوە بووە مردووە ئیقامە حوجەی چی لەسەر بکا کەسێك کە لەپێش ئەودا مردوە وە تەکفیریشی کردوە .

٣–( الرد الثالث ذكر نصوصا لابن التيمية تدل على أنه يكفر المعين)یانی شێخ محمدی کوری عبدالوهاب لەو کیتابەدا باسی ئەوەی کردوە ابن تیمیە بەلێ لەکیتابەکانیدا واريد بووە معینی تەکفیر کردوە (مثل تكفير فيمن غلا في علي بن طالب) وتویەتی هەرکەسێك غلوی هەبێ لە عەلی کوری ئەبی طالب ئەو کەسەی بە معین کافر کردووە (أو الصالحين أوالمسيح عليه السلام )یان لە پیاو چاکان یان لە عیسا (علیە السلام) (وجه دلالة على التعين قوله يستتاب )بۆیە ئەزانین کەوا معینی کافر کردوە وتویەتی ئەوکەسەی ئاوەها بکا و هاواری ئیمامی عەلی بکا یان هەر صالحێك لە صالحین یاخود پێغەمبەر عیسا(علیە السلام) ئەلی يستتاب واتا تەوبەی لێ داوا دەکرێ ! کەواتە بۆ تەوبەی لێ داوا دەکرێ ئەگەر نەکەوتبێتە کوفرەوە ؟!

کێ داوای تەوبەی لێ دەکرێ و پێ بوترێ وەرە تەوبە بکە ؟! ئەوەی کەوا کافر بووە .

(ولا يقال يستتاب إلا المعين) وە معین و دەست نیشانکراو نەبێ پێ ناوترێ تەوبە بکە تەوبە بکە فلان کەس . فلان کەس دەست نیشانکراوە کە تەوبەی لێ داوا دەکرێ (وما ذكر من قتال المرتدين وتكفيرهم ، وهم معينون، ومن تكفير ابن سيناء وهو معين )یان مورتەدەکان کە تەکفیرکراون ئەمانە معینن یاخود تەکفیری ابن سینای کردوە کە ئەمەش معینە (ومن تكفير رازي وهو معين) تەکفیری رازی کردوە ئەوەش موعینە .

*شوبهەی دووەم:

[1]: ئەوانن کەوا خۆیان بە عیلمی کەلامەوە سەرقال کردوە

شێخ (عەلی ) دەڵێ :

(شبهة أخرى ذكرها المصنف أثيرت على ابن القيم ناتجة عن سوء فهم لترتيب كلام ابن القيم فقالوا إنه يقول إن الذبح والنذر لغير الله من الشرك الأصغر)شوبهەیەکی تریان هێناوە وتویانە : کە ئێوە دەڵێن ئەوەی بۆ غەیری خوا سەربڕێی کافرو موشریکە ئەوەی بۆ خوای گەروە نەزر بکا ئێوە بە شیرکی أکبری دائەنێن و بەکافرو موشریکی دائەنێن ئەوەتا ابن القيم بە شیرکی بچوك (الأصغر)ی داناوە کەواتە ئەم شتانە ئینسان ناکا بەکافر وموشریك بەکوفر و شیرکی گەروە .

ئەڵێ ئەم شوبهەیە لەوەوە هاتوە کەوا تەرتیبی وتەکەی ابن القيم یان نەزانیوە کە حیسابی بۆ بکەن لەکیتابەکەدا (وذلك أن ابن القيم في فصل في كتاب مدارج السالكين)لە بەشێکدا لە کیتابی مدارج السالكين دا نوسیویەتی (ذكر أمثلة للشرك الأكبر)لەپێشدا هەندێك نمونەی بۆ شیرکی گەورە باس کردوە (ثم قال فصل أما الشرك الأصغر)بەشێکیتر هێناوە وتویەتی بەلام شیرکی أصغر بچوك کە ئەمانەیە باسی کردوە دوای ئەوەی کەوا لێ بۆتەوە (ثم ذكر له أمثلة ثم قال)ئینجا نمونەی بۆ شیرکی أصغر باس کردوە ئەمەش تەواوبوو دواتر هاتۆتەوە سەر بابەتی شیرکی أكبر وتویەتی (ومن أنواع هذا الشرك سجود المريد والنذر لغير الله والتوكل على غير الله وطلب الحوائج من الموتى) شەم شتانەی باسکردوە ئەوانیش وتویانە دیارە ئەوەش پەیوەستە بە باس کردنی شیرکی أصغرەکەوە .

وەلامەکەی :

شێخ (عەلی )دەڵێ (فظن أهل الباطل أن هذا الكلام يتبع الشرك الأصغر)ئەهلی شیرك و باطل وایانزانیوە یاخود وایان لێکداوەتەوە کەوا ئەم قسەی ابن القيم هەر پەیوەستە بە مەسەلەی پێشوو کە بریتیە بووە لە مەسەلەی شیرکی أصغرەکەوە (فبنوا عليه أن ابن القيم يعتبرأن النذر لغير الله ...الخ من الأصغر) وایان داناوە کەوا نەزر و سەربرین بۆ مردوان لە شیرکی أصغرە (فبين لهم المصنف أن هذا الكلام في الشرك الأكبر)باسی کردوە کەوا نەخێر ئەمە لەشیرکی أكبردایە (وليس الأصغر ، وهذا يقع في الوقت الحاضر لبعض الناس فيفهم من كلام العلماء مالم يقصدوه) خەلکانێك لەکەلامی علماء واتێ دەگەن ئەو مەبەستەی کەئەو وتویانە ئەوەنیە کە ئەو لێی تێ گەیشتووە و بلاوی کردۆتەوە (ولم يكن ممارسا لكلامهم ، ومعتادا

على ألفاظهم فيخطئ الفهم)كەواتە كەسەكە بەهەلە لە قسەكە تێ دەگا دێت ئەوە ئەداتە پاڵ ابن القيم كەوا ئەو مەبەستی نەبوو چونكە هەموو كەسێك دەزانی ئەگەر كیتابەكانی ابن القيم بخوێنیتەوە بەتەئەكید ئەزانی كەوا نەزرو سەربرین لە شیركی أكبرە .

دووەم :

شێخ (عەلی ) دەلێ :

(الشبهات التي في كتاب تيسير العزيز الحميد للشيخ سليمان بن عبد الله بن محمد بن عبد الوهاب) شێخ سليمان مردوو نەیتوانی كیتابەكە تەواو بكا بەداخەوە شەهید كرا ان شاء الله خوای تعالی دەرەجەی شەهیدی پێ دەبەخشێت كەوا بەدەستی عوسلمانیەكان كوژرا كاتێك درعیەیان داگیركرد لەتەمەنی ٣٣سالیدا كوشتیان(تقبل الله) .

شێخ (عەلی) دەلی:( قال الشيخ سليمان في باب من الشرك أن يستغيث بغير الله ص ٢٠٧ ) شیخ سلیمان لەبەشی ئەوەی كەوا هەركەسیك ئیستغاثەبكا بەغەیری خوا ئەوە شیركی كردوە (قال (ولكن لعباد القبور شبهات) بەلام گۆر پەرستەكان شوبهاتیان هەیە (ذكر المصنف ( يقصد جده الشيخ محمد بن عبد الوهاب)ئەلێ باپیرم باسی كردوە (كثيرا منها في كشف الشبهات)لە كشف الشبهات زۆری باسكردوە (ونحن نذكر هنا ما لم يذكره)شێخ سلیمان ئەلێ : ئەمرۆ ئێمە هەندێك شت باس دەكەین لێرەدا كەوا لەوێدا باسی نەكردوە (ثم ذكر ذلك على النحو التالي : )شوبهاتەكانی هێناوە ئێستاش شوبهاتە لەلای ئەهلی گۆرپەرستەكان:

شوبهەی یەكەم :

(أن عباد القبور احتجوا بحديث رواه الترمذي في جامعه) گۆر پەرستەكان حەدیسێكیان هێناوە لە جامعی ئیمامی ترمذی وە ئاگاداربن ئەم جۆرە كەسانە بەبەردەوام ئایەت و حەدیس دەهێنن بۆ پالپشت كردنی بۆچوونەكانی خۆیان ئەگەر چی ئەوەشی تێدا نەبێ كەخۆیان مەبەستیانە یەك لەوانە ئەو حەدیسەی ئیمامی ترمذی كە پیاوێكی نابینا هاتە لای پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێكرد كە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ بكا كەوا چاوی چاك

بێتەوە ئەویش وتی ئەگەر دەتەوێت ئارام بگری ئەوە ئارام بگرە  ئەگەرنا دوعات بۆ ئەکەم چاوت چاك بێتەوە پاشان وتی نامەوێت دوعام بۆ بکەیت چاوم چاك بێتەوە ئەویش وتی برۆ دەست نوێژ بگرە دەست نوێژێکی باش پاشان دوعا بکە و بلێ (اللهم إني أسألك وأتوجه إليك بنبيك محمد نبي الرحمة إني توجهت به إلى ربي في حاجتي هذه لتقضي اللهم فشفعه)ئەمە یان هێناوە ئەلێن ئەوەتا دەلیلە لەسەر ئەوەی کەوا داواکردن لە مردووان بەجاهی ئەوان و بەداوا کردن لەخودی خۆیان بۆ ببیت بە موشریك ئەوەتا لێرەدا حەدیسی لەسەرە .وە ئەوەی گرینگە لەم  حەدیسەدا کەهاتوە دەلێ (اللهم إني أسألك وأتوجه إليك بنبيك )ئەی خوای پەروەردگار من تەوجه دەکەم بە تۆ بە پێغەمبەر محمد ﷺ! (وهذه اللفظة هي التي تعلق بها المشركون وليست عند هؤلاء الأئمة قالوا فلو كان دعاء غير الله شركا لم يعلم النبي ﷺ الأعمى هذا الدعاء الذي فيه نداء غير الله)ئەگەر ئەمە شیرك بایە پێغەمبەر ﷺ ئەم دوعایەی فێر نەئەکرد ! کەداواکردنی غەیری خوای تێدایە !

وەلامەکەی :

شێخ (سليمان) ئەلێ :

بەسێ شێواز وەلامی ئەم شوبهەیە ئەداتەوە :

١-(ـ تضعيف الحديث) حەدیسەکە صەحیح نیە (حيث ناقش الترمذي في تصحيحه)شێخ سلیمان هاتوە لەکیتابەکەیدا موناقەشەی کردوە کە لەکیتابەکەی ئیمامی ترمذی هاتوە کەوا بەصحیحی هێناویەتی هاتووە موناقەشەی ترمذی کردوە لەوەدا کەوا نەخێر صەحیح نیە .

٢- با تەنازول بکەین ئەگەر حەدیسەکە صەحیح بێ .

شێخ(سليمان) ئەلێ : (أنه في غير محل النزاع)لەو جێگایەدا نیە کە ئێمە موناقەشەی ئەوانەی لەگەلدا بکەین ئەمە داواکردنی مردوو نیە !ئەو صەحابەیە هاتووە لە پێغەمبەری زیندوو داوا دەکا ﷺ خۆ ئەگەر حەدیسەکەش صەحیح بێ ئەمە کەی لەوەدایە کە ئێمە باسی دەکەین کەوا داوا کردن لە مردووان شیرکە ! یاخود لە زیندوویەکی غائیب کەچی لەوێدا پێغەمبەری خوا ﷺ مەوجودە نەمردوە وە نەغائیبیشە .

(. أنه في غير محل النزاع فأين طلب الأعمى من النبي ﷺ أن يدعو له وتوجهه بدعائه مع حضوره من دعاء الأموات)ئەمە پێغەمبەری خوایە ﷺ کە زیندووە ئەویش داوای لێ دەکا

کەوا دوعای بۆ بکا ئەمە کەی کێشەیە ؟! (والسجود لهم ولقبورهم والتوكل عليهم والالتجاء إليهم في الشدائد والنذر والذبح لهم وخاطبهم بالحوائج من الأمكنة البعيدة يا سيدي ويا مولاي افعل كذا)ئەگەر کەسێك لەشوێنێکی دوور دوور بێت تۆ هاواری بۆ بکەیت بلێت یا فلان کەس ئەوەم بۆ جێ بەجێ بکە ئەمە ئەوە نیە و پێغەمبەری خوا ﷺ لەبەردەمی دایە یاخود ئەمە مردوو نیە تاوەکو بلێت ئەمە دەلیلە بۆئەوە هیچ دەلیلێکی تێدا نیە .

(فحديث الأعمى شيء ودعاء غير الله تعالى والاستغاثة به شيء آخر)حەدیسی ئەعماکە شتێکە وە داواکردن لە مردوو شتێکیترە (فليس في حديث الأعمى شيء غير أنه طلب من النبي ﷺ أن يدعو له)با ئێمە سەیری حەدیسەکە بکەین داوا دەکا کە پێغەمبەر داوای بۆ بکا ﷺ (ويشفع له فهو توسل بدعائه وشفاعته)کەواتە تەوسولە بە دوعا و بەشەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ چونکە زیندووە وە هیچ کێشەیەکمان نیە ئێستا تۆ برۆیت بۆلای کەسێکی زیندوو بلێت دوعام بۆ بکە کەس نەیوتوە ئەمە شیرکە یاخود بلێ ئەمە دروست نیە ئەمە یەکێکە لە وسیلە مشروعەکان (ولهذا قال في آخره اللهم فشفعه فيّ) وتویەتی خوایە بیکەی بە شەفاعەت کارم .

(وفي رواية أنه طلب من النبي ﷺ أن يدعو له فدل الحديث على أنه ﷺ شفع له بدعائه وأن النبي ﷺ أمره هو أن يدعو الله ويسأله قبول شفاعته فهذا من أعظم الأدلة أن دعاء غير الله شرك) بەپێچەوانەوە حەدیسەکە دەلیلە لەسەر ئەوەی کەوا داواکردن لە غەیری خوای تعالی شیرکە چونکە ئەو داوای کرد و پێغەمبەری خوا ﷺ داوای لێکرد کەوا داوا بکا لە خوای تعالی وە داوای قبولی شەفاعەتی پێغەمبەری لێبکا ﷺ (لأن النبي ﷺ أمره أن يسأل قبول شفاعته فدل على أن النبي ﷺ لا يدعى ولأنه ﷺ لم يقدر على شفائه إلا بدعاء الله له) یانی خودی پێغەمبەر داوای لێ ناکرێ ﷺ وە هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمری کرد بەم صەحابەیە کە داوا بکا لەخوای تعالی کە شەفاعەتی پێغەمبەری خوای ﷺ ی بۆ قبول بکا وەداوا بکا لەوەی کەپێغەمبەر ﷺ ناتوانی شیفا با إلا ئەبێت داوا لە خوا بکا بەهەردووکیان چ نابینایەکە وە چ پێغەمبەر ﷺ خۆیی هیچیان توانای ئەوەیان نەبوو کەوا شیفا بێنن إلا شیفا لەلای خوایە کەواتە ئەم شیفایە بەدوعای هەردووکیان دەکرێ ئەم داوا دەکا لەخوا

پێغەمبەری بۆ بکا بە شەفیع ﷺ پێغەمبەریش ﷺ داوا دەکا لەخوای تعالی کەوا چاوی چاك بکاتەوە کەواتە ئەصلی دوعاکە لەخوای تعالی یە لەخودی پێغەمبەر نیە ﷺ .

(فأين هذا من تلك الطوام ، والكلام إنما هو في سؤال الغائب أو سؤال المخلوق فيما لا يقدر عليه)کەواتە لە غائیبێك داوای بکەی شیرکە یاخود لەکەسێك کەوا توانای نەبێ (فيما لا يقدر عليه إلا الله أما أن تأتي شخصا يخاطبك فتسأله أن يدعو لك فلا إنكار في ذلك على ما في حديث الأعمى فالحديث سواء كان صحيحا)ئەگەر حەدیسەکە بلێن ڕاستە و صەحیحە (أو لا وسواء ثبت قوله فيه يا محمد أو لا)یان ئەو قەولەی کە دەلێ (یامحمد) ئەگەر ڕاست بێ یان نا (لا يدل على سؤال الغائب) دەلالەت ناکا لە داواکردن لە کەسێکی غائیب (ولا على سؤال المخلوق فيما لا يقدر عليه إلا الله بوجه من وجوه الدلالات ومن ادعى ذلك فهو مفتر على الله وعلى رسوله ﷺ)هەرکەسێکیش ئیدعای غەیری ئەمە بکا ماناوایە کەوا ئەوە ئیفترایی کردوە بەخوا و بەپێغەمبەری خوا ﷺ داواشی لەپێغەمبەری خوا کردبێ ﷺ داوای لێ کردوە لەشتێك کەلەتوانای دا هەبێ توواناکەش ئەوەیە کەوا دەلێ خوایە چاوی چاك بکەرەوە ئەوەی لەتوانا هەیە نەك چاوی کەسەکە خۆی چاك بکاتەوە (وهو أن يدعو له وهذا لا إنكار فيه وإن كان توجه به من غير سؤال منه نفسه فهو لم يسأل منه وإنما سأل من الله به سواء كان متوجها بدعائه كما هو نص أول الحديث وهو الصحيح)شێخ سليمان زۆر لەسەر ئەمە دەڕوا کەوا ڕەدی ئەم شوبهەیە ئەداتەوە کەوا ئێستاش بەدەستی کەسانێکی زۆرەوە هەن کەوا ئەم حەدیسە ئەهێنەوە .

لێرەدا سەرنج ئەدەین بۆ بابەتێك ئەوەیە کەوا خودی حەدیسەکە هەندێك لە علماء یانی ئەهلی سونە ئەیهێنەوە بەدەلیل بۆ ئەوەی کەوا ئینسان ئەتوانی وەکو وەسیلەیەك بەجاهی مخلوق داوا بکا وەکو ئیمامی شەوکانی .تەبعەن لێرەدا ئەو کەوتۆتە هەلەوە چونکە لێرەدا داواکە بەجاهی پێغەمبەر نیە ﷺ ڕۆیشتبێ ئەگەر وابێ بۆ دێتە لای پێغەمبەر ﷺ ئەگەر وابوایە صەحابەکە بۆخۆیی لەمالی خۆیی دائەنیشت ئەیوت خوایە بۆخاتری پێغەمبەر چاوم چاك بکەیتەوە نەدەهاتە لای پێغەمبەر ﷺ کەهاتۆتە لای بۆ ئەوە هاتوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ دوعای بۆ بکا .

کەواتە کە وتویەتی خوایە من لەتۆ دەپاڕێمەوە بە پێغەمبەر ﷺ مەبەستی ئەوە نەبووە بەجاهی پێغەمبەر مەبەستی ئەوە بووە کەوا من داوا دەکەم لەتۆ بەدوعای پێغەمبەر ﷺ کە دوعام بۆ بکا .

٢-(الرد الثالث أن قوله يا محمد إني أتوجه الخ لم تثبت في اكثر الروايات)شێخ ئەڵێ لەزۆربەی ریوایەتەکاندا ئەم کەلیمەیە نەهاتووە (وبتقدير ثبوتها لا يدل على جواز دعاء غير الله)ئەگەر لەحالەتێکدا ثابتیش بووبێ ئەوە لەوکاتەدا دەلالەت ناکا لەسەر جائیزی داوا کردن لەغەیری خوای گەورە (لأن هذا خطاب لحاضر معين يراه ويسمع كلامه)بۆ کەسێکە کە زیندووە لەبەردەمی دایە ئەیبیستی و ئەیبینی (ولا إنكار في ذلك فإن الحي يطلب منه الدعاء كما يطلب منه ما يقدر عليه) زیندوو داوای دوعای لێ ئەکرێی وە هەرشتێکیتر کە لەتوانایدا هەبێ کەوا بیکات (فأين هذا من دعاء الغائب والميت لو كان أهل البدع والشرك يعلمون)ئەگەر ئەهلی بیدەع و شیرك ئەمەیان بزانیبایە ئەمە لەکوێی و ئەوە لەکوێی ! .

شوبهەی دووەم:

شێخ(سليمان) ئەڵێ : عبدالله ی کوری مسعود وتویەتی : (إذا انفلتت دابة أحدكم بأرض فليناد يا عباد الله احبسوا)ئەگەر هاتوو کەسێك لەئێوە ولاخەکەی ونبوو لەدەشتێکدا رۆیشتوو لەدەستی ونبوو تۆهاوار بکە بلێ ئەی عەبدەکانی خوا بیگرنەوە بۆم تەبعەن ئەمەش داوا کردنە دواکردنیش ئەگەر شیرك بێ ئەمە چۆن دروستە ! (هكذا في كتاب ابن السني وفي الجامع الصغير) لەم دووکیتابەدا ئەم حەدیسە هاتووە (فإن لله عز وجل في الأرض حاضرا سيحبسه عليكم)کەسێکی ئامادەبوو هەیە لەعەبدەکانی خوا بۆت ئەگرێتەوە تاتۆ ئەچیت ئەیگریتەوە . ئەمە یەکێکە لەشوبهەکان .

وەلامەکەی :

شێخ (سليمان )دەڵێ : (ثم أجاب عن هذه الشبة فقال :)وەلامەکان بەم شێوەیە دەبێ :

١-ئەم حەدیسە صەحیح نیە ئەم حەدیسە موضوعە و دروستکراوە بەلام بەداخەوە لەولاتی ئێمە بەتایبەتی بابەتی عیلمی حەدیس زەعیف و موضوعە نیە زۆربەی زۆری هەروتی (قال رسول الله ﷺ) ئیتر تەواو !ناگەرێنەوە بۆ راستی و دروستیەتی حەدیسەکە .

ئەگەر گریمان حەدیسەکە صەحیحە !

٢-شێخ دەڵێ هیچ دەلیلێکی تێدا نیە ئەمە چونکە تۆ وتت (فإن لله عز وجل في الأرض حاضرا)تۆ دوعای حاضرت کردوە خۆ دوعای غائیبت نەکردوە کەوا باسی غائیبی تێدایە کەوا باسی مردووی تێدایە خۆ نەتوتوە ئەی مردوەکان کە مردوون لەعەبەدەکانی خوا یاخود ئادەی پێغەمبەران بۆم بگرنەوە خۆ لە نەصەکە واناڵێت ئەڵێ (فإن لله عز وجل في الأرض حاضرا)جا لێرەدا شێخ ئەڵێ (وبتقدير ثبوته لا دليل فيه لأن هذا من دعاء الحاضر) وەئامادەبوونیش خۆ شیرك نیە (فيما يقدر عليه كما قال فإن لله في الأرض حاضرا سيحبسه عليكم)کەواتە بەهەر شێوازێك برۆن دەلیلیان نیە .

شوبهەی سێ یەم :

شێخ (سليمان ) دەڵێ : حەدیسێك ئەهێنی لە ئەبو ئومامەی سەهلی کوری حەنیف (أن رجلا كان يختلف إلى عثمان بن عفان في حاجة له فكان عثمان لا يلتفت إليه)ئەڵێ پیاوێك ئیشی کەوتۆتە لای عوسمانی کوری عەفان ئەویش هەر ئاوری لێ نەئەدایەوە عوسمانی کوری عەفان(رەزای خوای لێ بێ ) (ولا ينظر في حاجته)لەئیشەکەی نەدەپێچایەوە چی دەوێی ئەویتریش هەر دەیوت ئیشێکم هەیە ئەویش سەیری ئیشەکەی نەئەکرد بزانی چیە (فلقي ابن حنيف فشكا إليه ذلك فقال له عثمان بن حنيف) عوسمانی بینی شکوایکرد عوسمانیش وتی :برۆ دەست و نوێژ بگرە دواتر برۆ بۆ مزگەوت دوورکات نوێژ بکە دواتر بڵێ ئەمەیە قسەکە (اللهم إني أسألك وأتوجه إليك بنبينا محمد نبي الرحمة يا محمد إني أتوجه بك إلى ربك ليقضي لي حاجتي) ئەمە لەدوای وەفاتی پێغەمبەری خوایە ﷺ و لەزەمانی ئیمامی عوسمانە .

وەلامەکەی :

شێخ(سليمان) دەڵێ: بەچەند خاڵێك وەلام ئەدەینەوە :

١-( أن راوية طاهر بن عيسى ممن لا يعرف بالعدالة)لەسەنەدەکەدا ئەم راویە طاهیرە مەشهور نیە بەسیقە واتا حەدیسەکە صەحیح نیە ئەمە مجهولە ئەم کەسە بۆخۆتان ئەزانن کەوا ئەگەر لەعیلمی سەنەدا مەجهول هەبوو ئیعتبار دانانرێی بۆ مەتنەکە .

٢-(قوله عن أبي سعيد المكي أشد جهالة من الأول)ئەم ئەبو سەعید مەککییە کە لەسەنەدەکەدا هەیە لەویتریان واتا نەناسراوە چۆن دەکرێی سەندێك نەناسراو مجهولی تێدابێ پێ بلێن ئەوە راستە .

ئەگەر حەدیسەکە صەحیح بوو!

٣-دەلیلی تێدا نیە لەسەر داواکردن لەمردووان و غائیبان (غاية ما فيه أنه توجه به في دعائه)بەدوعاکەی خۆیی دوعای کردوە و داوای کردوە داوای لەمردوو نەکردوە (توجه به في دعائه) وتویەتی خوایە لەبەر خاتری پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ بکە ! نەك بلێ ئەی پێغەمبەر ئەوەم بۆ بکە جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەمانە ئەگەر بلێ ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەوەم بۆ بکە ئەوە شیرکە ئەگەر بلێ خوایە بۆ خاتری پێغەمبەر ئەوەم بۆ بکە ﷺ ئەوە بیدعەیە وەکو لەپیشتر دا باسمان کرد خۆ ئەگەر ئەوانەشی کەوا دەلێن بیدع نین ئەمە خودی داواکردن نیە لە مردووەکە تۆ داوات لەخوا کردوە خۆ داوات لە پێغەمبەرەکە نەکردوە ﷺ لەم حالەتەدا . لەلای ئەوانەی کەوا دەلێن جائیز نیە کەوا بەجاه تۆ داوا بکەی بەقەردی مخلوقین و بەحەقی مخلوقین داوا بکەی ئەلێن جائیز نیە نالێن شیرکە جیاوازە تۆ لەخودی کەسەکە بپارێتەوە یان لەخوا بپارێتەوە بەخودی ئەو کەسە شێخ ئەلێ ئەمەی کەتێدایە داواکردنە لەخوای تعالی بە خاتری پێغەمبەری خوا ﷺ کەواتە هێشتان ئەوەی تێدا نیەکەوا ئەوان دەیانەوێی بلێن دوعای مردوو کە ئەمە شیرك نیە چونکە لێرەدا ئەبنین دوعاکان هەموویان ئیخلاصی دوعایان کردوە بۆ خوای تعالی وتویانە خوایە ! داوایان لەخوا کردوە.

٤-( أنهم زعموا أنه دليل على دعاء كل غائب وميت من الصالحين الصالحين فخرجوا عما فهموه من الحديث بفهمهم الفاسد إلى أنه دليل على دعاء كل غائب وميت صالح ولا دليل فيه أصلا على دعاء الرسول ﷺ بعد موته موته ولا في حياته فيما لا يقدر عليه)وتویانە کەوا ئەمە دەلیلە لەسەر ئەوەی کەوا جائیزە داوا بکەی لەسەر هەر غائیبێکی تر ئەگەر پێغەمبەریش نەبێ و پیاوچاکێکیش بێ وە هەر مردوویەك بێ لەصالحین ، کەواتە ئەمانە بەهەلە لەمە تێگەیشتوون ئەگەر صەحیحیش بێ ئەم حەدیسە(ولا دليل فيه أصلا على دعاء الرسول ﷺ) لەم حەدیسەدا دەلیلی تێدا نیە بۆ داواکردن لەخودی پێغەمبەر ﷺ (ولا في حياته فيما لا يقدر عليه)لەژیانیشدا ئەوەی کەوا توانایی نیە بەسەریدا (ثم لو كان فيه دليل على ذلك لم

يكن فيه دليل على دعاء الغائب والميت مطلقا لأن هذا قياس مع وجود الفارق وهو باطل بالإجماع إذا ما ثبت للنبي ﷺ من الفضائل والكرامات لا يساويه فيه أحد فلا يجوز قياس غيره عليه)هەتا ئەگەر واش بێ وەكو ئەوان ئەڵێن قياسی غەيری پێغەمبەر ناكرێی لەسەر پێغەمبەر ﷺ ئەگەر ئەمە داوای لەپێغەمبەر كردوە كوا داوای لەغەيری پێغەمبەر كردوە ﷺ!؟ ئەمە ئەگەر تنازول بكەين بە قياسی ئەمان (وأيضا فالقياس إنما يجوز للحاجة ولا حاجة إلى قياس غيره عليه فبطل قياسهم بنفس)ئينجا ئەم سێيەی كە ئێمە وەلاممان دانەوە ئەم سێ حەديسە ئەويتر هەمووی موضوعە و خۆيان دايانناوە .

بۆنمونە : (إذا أعيَتكم الأمور فعليكم بأصحاب القبور)ئەگەر هەرشتێك ماندوو و نارەحەتی كردن يەكسەر هاوار بكەنە مردوانە ! يان دەلێن (وقولهم لو حسن أحدكم ظنه بحجر لنفعه)ئەگەر ئيعتقادی بەبەردێكيش هەبوو ئەوە سودی پێ دەگەيەنی . ئەمانە هيچی صەحيح و ثابت نيە هەمووی موضوعە (قال ابن القيم وهو من وضع المشركين عباد الأوثان)ئەلێ ئەمە هەمووی لەدانراوی دەستی موشريكەكانە ئەوانەی كەوا گۆر دەپەرستن مەبەستی لەوانەی ئيمەيە كەلەگەل ئيمەدا ئەژين و ئيدعايی ئيسلامەتی دەكەن .

شوبهەی سێ يەم :

شێخ (عەلی ) دەلێ :

(الشبهات التي في كتاب الانتصار لحزب الله والرد على المجادل عن المشركين للشيخ عبد الله بن عبد الرحمن ابا بطين و من الشبهات) هاتوە شێخ هاتووە كيتابی (الانتصار لحزب الله والرد على المجادل عن المشركين) هێناوە ئەمە ناوی كيتێبەكەيە ئەم كيتابە هی شێخ عبدالله كوری عبدالرحمن ی ابا بطين كەوا موفتی دياری نجدی بووە لەدوای شێخ محمدی كوری عبدالوهاب وە لەزەمانی شێخ محمدی كوری عبدالوهاب دا ئەم پياوە تەمەنی كەم بووە دوای وەفاتی عيلمێكی زۆری وەرگرتوە لەداهاتوودا بوە بەموفتی دياری نجدی .

شێخ ابا بطين چەند شوبهەيەكی هێناوە :

*يەكەم :

شێخ (ابا بطين) دەڵێ : (قول بعضهم إن ابن تيمية أحيانا يذكر كلاما وحكايات تدل على أن دعاء الأموات ليس شركا ثم ذكر بعضها) هەندێك دێن ئەڵێن ابن التيميه جارو بار باسی ئەوەی کردوە کەوا حیکایەتێك نەقل دەکا کە دوعای مردووان شیرك نیه دواتر هەندێك باسی دەکا .

*دووەم:

شێخ(ابا بطين) دەڵێ : (قالوا إن ابن تيمية في اقتضاء الصراط ذكر أن المتأول في الشرك والكفر والجاهل والمخطئ والمقلد مغفور له ما ارتكبوه من الشرك والكفر) گوایە ابن تیمیە وتویەتی لەکیتابی اقتضاء الصراط المستقيم ئەوکەسەی کە بە تەئویل شیرك بکا یاخود کوفر بکا یان جەهلی هەبێ والمخطئ والمقلدبێ خوا لێ خۆش دەبێ .

وەلامەکەی :

شێخ (ابا بطين)دەڵێ : (ورد عليهم بأن ابن تيمية قال ذلك في سياق بعض البدع ولم يقله في الشرك ولا الكفر)ئەڵێ ابن التيميه لە بابەتی هەندێك بیدعەدا وای وتوە نەك لەمەسەلەی شیرك و کوفردا (ثم ذكر سياق كلام ابن تيمية بنصه ، انتها ملخصا)

شێخ (عەلی )دەڵێ : (وفي وقتنا الحاضر من يردد هذه الشبهة بأن ابن تيمية يعذر بالجهل في الشرك الأكبر)لەکاتی ئێمەدا گوێمان لێ دەبێ لەزۆربەی ئەوانەی کەوا خۆیان بە سەلەف ئەزانن ئەڵێن ابن تیمیە وتویەتی کەسێك ئەگەر شیرکی أکبریشی هەبێ بەو جەهلە معذورە (ويستدل بكلام لابن تيمية قاله في سياق البدع أو المسائل الخفية كبدع المرجئة أو الخوارج والاشاعرة ونحوهم ، ثم ينزل ذلك على من فعل الشرك الأكبر)ئەمە دائەبزانین بەسەر ئەوە کەسەی کەوا شیرکی أکبر بکا ئەڵێن ابن تیمیە مەبەستی لەوە بووە ! تەبعەن ابن تیمیە مەبەستی لەوشتانە نەبووە لەشیرکی خەففیی بووە یاخود لەوبیدعانەبووە .

*سێ یەم :

شێخ (ابا بطين) دەڵێ : (قال الاحتجاج بقصة الرجل الذي أوصى أهله أن يحرقوه)لەم بارەی ئەم چیرۆکەوە زۆر پرسیارمان لێ دەکرێی کەسێك وەصیەت دەکا ئەگەرمن مردم بم سوتێنن بم کەن بەتۆز و بەبادا ئەڵێن ئەصلن ئەمە کافربووە بروای بەزیندوو بوونەوە نەبووە !.

وەلامەکەی :

شێخ (ابا بطين) دەڵێ :بەچەند شێوازێك وەلامی ئەدەینەوە:

١-( أن هذا الرجل جاهل لأنه لم تبلغه الحجة)ئەڵێ ئەمە نەزان بووە حوجەی پێ نەگەیشتووە لێرەدا بەمانای ئەوە نیە کەوا کافر نەبووە وەکو وتمان ئەوانەی کەوا حوجەیان پێ ناکا معذورن لەلای خوای تعالی لەعەزاب .

٢-( أن جهله كان في باب الصفات أي جهل بعض الصفات ، وليس في باب الشرك الأكبر وبينهما فرق)ئەڵی ئەمە لەبابی سیفاتدا بووە دێتە ناو شیرك وکوفری خەففی نەك ظاهیرەکان چونکە لەئەصلدا ئەم پیاوە بروایی بەزیندوو بونەوە هەبووە هەرلەبەر ئەوەش بوو وتویەتی من ئەگەر مردم ئاوام لێ بکەن چونکە خوا عەزابم ئەدا زانیویەتی کە زیندوو ئەبێتەوە نەك لەئەصلدا بروای بەزیندوو بونەوە نەبێ ئینجا ئا ئەمە وایی لێکردوە کە ئەو قسەیە بکا لەترسی خوای تعالی ئاگایی لەخۆیی نەماوە بەشێك لەعلماء یان وادەڵێن بەشێکیتر ئەمە خەففی بووە لەسەری (وليس في باب الشرك الأكبر وبينهما فرق ، ثم ذكر كلاما لابن تيمية في تكفيره في الشرك ولم يعذر بالجهل)شێخ (ابا بطين) کەلامی ابن تیمیە ئەهێنێتەوە کە لەشیرکدا خوای تعالی عوزری بەکەس نەداوە .

٣-( رد بلوازم باطلة)ئەگەر ئەمە وابێت ئەوکاتە ئەوە دەگرێتە خۆی ئەم قسەیە (إذا عذرنا بالجهل في الشرك الأكبر منها يلزم عذر جهال اليهود والنصارى والرافضة ونحوهم ،و يلزم عذر من جهل البعث ورسالة الرسول ﷺ ، و يلزم اعذار كل أحد)ئەگەر وابێ کەواتە گریمان ئەودەیلێت وایە و لەشیرکی گەورەدایە وە کەسەکە معذورە کەواتە هەرشیرکێکیتر أکبر خەلك پێ معذورە با یەهود و نەصاراش معذورەبێ ئایا ئەمانە معذورەن؟! نەخێر معذورەنین .

هەتاوەکو ئەگەر ئینکاری زیندوو بونەوەش بکا تۆ ئەڵێ ئەوەتا ئینکاری زیندووبونەوەی کرد و کافر نەبوو ! باشە ئێمەش دەڵێن با ئێستا خەلکی ئینکاری زیندووبونەوە بکەن و بلێن کافر نیە ئەگەر بەجەهل بێ ؟! چۆن ئینکاری زیندووبونەوە نیە ئەوەتا نەصی قورئانمان هەیە کە ئەڵێ کابرا وتویەتی من بروام نیە کە زیندوو ببمەوە (وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا)[1] یەکسەر کابرا پێ وت (أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ )[1] تەکفیری کرد

[1] :سورة الكهف اية :٣٦

ئەمە ئەوەی لێ وەر دەگیری ئەگەر ئێمە وابلێین (و يلزم اعذار كل أحد ، فمن هو إذا الذي يعذر).

*شوبهەی چوارەم :

شێخ (ابا بطين)دەلێ : (أنهم لا يرجون قضاء حاجاتهم من الميت ونحوه إنما من الله)شوبهەيەكيتريان ئەوەيە ئەلێن : خۆ ئەو داوا دەكا لەم مردووە مەبەستی ئەوە نيە كەوا مردووە كە بۆی جێ بەجێ بكا ئەبێ خوا بۆی جێ بەجێ بكا بەس بەواستەی ئەمەوەيە .

وەلامەكەی :

شێخ(ابا بطين)دەلێ : (يقوله هذه مكابرة بل يرجون من الميت)نەخێر وانيە بەلكو داوا لەخودی مردووەكە دەكا كە داوا لەو ناكەن بۆ يەكسەر داوا لەخوا ناكەن (بل يرجون من الميت سواء استقل بذالك أو هو واسطة إلى الله كله سواء في الاسم والحكم)بلێ واستەمە و لەخۆييم داوا كرد هەمان شتە چونكە تۆ داوا لەخودی مردووەكە ئەكەيت هەتا بەواستەبوونيشی كەواتە تۆ داوات لەو كرد كە ئەو ئاگای لەتۆ نيە (ثم رد على من سماه نداء وليس دعاء للأموات)رەدی ئەوانەی داوتەوە كەوا دەلێن ئەمە ندائە نەك هاوار كردن بۆ مردووان بريتی نيە لەعيبادەت كردن و دوعابۆ كردن لە مردووان نداء يكە لەمردووەكە ! ئەمەش وانيە .

*شويهەی پێنجەم :

شێخ (ابا بطين)دەلێ : (دعواهم أن الشرك هو الصلاة والسجود لغير الله فقط)ئەوان ئەلێن شيرك ئەوە نيە كەتۆ باسی دەكەی بەلكو شيرك بريتيە لەوەی كەوا تۆ نوێژ بۆ غەيری خوای تعالى بكەی ياخود سوجدە بۆ غەيری خوای تعالى ببەيی ئەوە شيركە تەنها ئەو دوانەيە شيرك !؟.

وەلامەكەی :

[1] :سورة الكهف اية : ٣٧

شێخ (ابا بطين)دەلیٚ: (فرد عليهم بأن الشرك أوسع من ذلك بل يشمل الدعاء والنذر والذبح ...الخ ،) شێخ ڕەدیان لیٚ ئەداتەوە کەوا شیرك تەنها ئەوەندە نیە بەلکو لەدوعا کردن و نەزر و سەربریندایە ، ئەمڕۆش ئەگەر ئێمە سەیری بکەین هەندێك کەس شیرك تەنها تایبەت ئەکا بەو دوو حالەتی کەوا وتمان. شیرك زۆر زۆرفراوانە کەسەکە تەشریع دابنیٚ بۆ خەلکی هەتا داوا لەمردووش نەکا و عیبادەتەکانی تریش تەنها بەخالصی بۆ الله تعالی بکا وەکو وتمان شیرك بکا لەحوکمدا هەروەکو ئیمامی شنقطی دەفەرمووی : شیرك لەحوکمدا نەفسی حوکمی هەیە لەشیرك لە عیبادەتدا هەردووکمی هەرشیرکە .

کەواتە فروانترێکە ، ئێمە ئێستا باسەیری عامەی خەلکەکە بکەین لەم شوبهەیە زۆربەی خەلکی تیٚ کەوتوە یانی کاتێك کەپیٚ دەلیٚ کەتۆ نوێژ دەکەی نوێژەکە بۆ پێغەمبەر دەکەی ﷺ ؟! ئەلیٚ نەخێر ، کە ڕۆژوو ئەگرییی ڕۆژوەکە بۆ پێغەمبەرە ﷺ ئەلیٚ نەخێر ، هەمووشیان ئیشارەت بەنیەتەکە دەکەن لەنیەتەکانیادا ئەلێن نوێژی نیوەڕۆ ئەکەین بۆ خوا پیٚ بلیٚ بۆ پێغەمبەر ئەلیٚ نابێت ئەزانێت کە ئەمە شیرکە ئیٚ ئەوە عیبادەتە ئەویتریش هەر عیبادەتە دوعا و نەزریش ئەمانە هەمووی هەر عیبادەتن ئەم عیبادەتانە ئەبیٚ هەمووی بۆ خوا بیٚ نابیٚ بۆ غەیری خوا بیٚ جا ئەمان دێن ئەلێن بەس نوێژ و سوجدە ئەوانیتر دانانێن بە شیرك ئەوەش یەکیکە لە شوبهەکانیان و تۆش ئەبێت پێیان بلێت ئەمانەش هەمووی عیبادەتن نابیٚ صەرف بکرێی بۆ غەیری خوای تعالی .

*شوبهەی شەشەم :

شێخ (ابا بطين)دەلیٚ: (قولهم إن ابن تيمية يعذر بالجهل في الشرك الأكبر ، وسبق أن تكلم عن ذلك لكن أعاده نظرا لأهميته)ئەلێن ابن تيميه شیرکی گەورەی بە عوزر داناوە ئەگەر کەسەکە جەهلی هەبوویٚ لەئێستاو داهاتووش ئەم شوبهەیە باسکراوە وە دووجار لەم کیتابەدا شێخ (عەلی )باسی کردوە ئەم شوبهەیە ئەمەش دەلالەت لە گرینگی ئەم بابەتەدەدا (أعاده نظرا لأهميته وكثرة الاشتباه في هذا)تەبعەن لەئێستادا زۆربەی ئەوانەی ئەم شوبهەیە بەریوە دەبن و دەیگرن بەدەستەوە ئەوانەن کەوا خۆیان بەسەلەفی دەزانن کاتی خۆی ئەوانەی کەوا دوعاکردن و پارانەوە لە مردووانیان پیٚ جائیز بووە کەلامی ابن تيميه یان

هێناوە نەكوە خۆشیان لە ابن تیمیە بێ بەلكو ویستوویانە ڕەدی ئیمە بدەنەوە بە قسەی خۆمان وەكو ئەوەی دەلێ ئەوە لەخۆتانە ڕەدیشتان لێ ئەدەینەوە

وەلامەكەی :

شێخ (ابا بطين)دەلێ : (لكن هنا توسع وذكر أمثلة أخرى تدل على أنه لا يعذر ولا يقيده بالجهل) نەخێر لێرەدا وتویەتی عوزر نیە لە جەهلدا وەتقید نەكراوە بەوە (وجعل ذلك في فصل مستقل هو الفصل الخامس وهو أطول فصل ذكره) لەوكیتابەدا باسمان كرد درێژترین فصل تیدا قسەی كردوە (ثم ختم المصنف الكتاب بذكر المنع من التقليد في التوحيد وأصول الدين والأدلة في ذلك)دواتر كۆتایی كیتێبەكەی بەوە هێناوە كە لەمەسەلەی تەوحید دا نابێ ئێمە تەقلید بكەین مقلید و چاولێكەر خوا لێ قبول ناكا لەمەسەلەی تەوحید دا و ئیماندا ئیمان دەبێ هەركەس ئیعتقادی خۆیی هەبێ نابێ لەبەر ئەوەی فلان وایی وت منیش وا دەلێم .

شوبهەی چوارەم :

شێخ (عەلی ) دەلی :

وەلام دانەوەی شێخ عبدالطيف كوری عبدالرحمن لەكیتابی (منهاج التأسيس والتقديس في كشف شبهات داود بن جرجيس) ئەم كیتابە لەبەر چاوان نیە زۆربەی زۆری خەلك نەیبیستووە .

داودی كوری جرجیس كەسێكی عێراقی بوو لەزەمانی شێخ محمدی كوری عبدالوهاب ئەهات كیتابێكی دانا ناوی (صلح الاخوان) لەوكیتابەدا (ذكر فيه من الشبهات أن ابن تيمية وابن القيم يعذران من ينادي أهل القبور ويستغيث بهم يعذرانه بالجهل أو التقليد أو الاجتهاد) لەوكیتابەدا زۆر شتی هێناوە كە إبن تیمیە و إبن القيم وتوبێتیان كەسێك جاهیل بێ ئەوا معذورە ئەگەر نەزانێ لە مەسەلەی شیرك و تەوحیدەوە لێ ناگیریی !

(فذكر داود بن جرجيس في الباب الأول خمسين موضعا في عدم تكفير من استغاث ودعاء غير الله)لە پەنجا شوێن لەكیتابەكەیدا باسی ئەوە كردوە كەوا هەركەسێك هاوار كاتە غەیری خوا ئەو كەسە كافر نابێ !

وەلامەکەی :

شێخ(عبدالطیف)دەلی : (وخلاصة رد الشيخ عبد اللطيف على هذه النقولات)خولاصەی ڕەدەکەی شێخ ئەمانەیە:

١–( . أن غالبها حرفه هذا العراقي)زۆر بەی قسەکان کەوا هێناویەتی لە ابن تیمیە و ابن القیم تەحریف و دەستکاری کردوە تەصەروفی بەزیادە و نەقص کردوە ئەمەش حالەتی ئەهلی بیدەعە بەبەردەوام ئەهلی بیدەع کەلام ئەپچڕێنن وەکو خۆیی نایهێنن .

٢–( . التعسف في حمله على دعواه)زۆر خۆیی ماندوو کردوە لەوەی کەوا بەزۆر ئەو قسەیە بخاتە سەرمەبەستەکەی خۆیی کەچی وتەکانی ابن تیمیە و ابن القیم ئەوە ناگەیەنی کەچی ئەو هاتووە بەزۆر دەیخاتە سەر مەبەستەکەی خۆیی .

٣–( وبعضها لم يفهم مراد ابن تيمية)وە زۆرێك لەو وتانەی کەوا هی ابن تیمیە هێناویەتی تێ نەگەیشتووە مەبەستی چیە ابن تیمیە کەچی داود هاتووە بە مەبەستی خۆیی وتویەتی کەوا ئەوهایە و بەم شیوەیەیە .

٤–( . وهو أهم الردود)گرینگترین ڕەدانەوەکانە کە ئەمەیە (أن كلام ابن تيمية في العذر إذا عذر هو في المسائل الاجتهادية أو مسائل البدع وليس في أصول الدين)کەلامی ابن تیمیە هاتووە لەمەسەلەی عوزردا کەداویەتی لەمەسەلە ئیجتهادیەکاندایە و لەمەسەلە بیدعەکاندایە نەك لەمەسەلەی ئصولی دین (والتي من أهمها التوحيد فان ابن تيمية لا يعذر بالجهل به ، واستغرق رد المصنف على الشبهات من ص ٩٥ ، إلى ص ٣٢٠) لە نێوان لاپەرە ٩٥تا ٣٢٠ ڕەدی ئەوەی داوەتەوە کەوا ابن تیمیە عوزری دابێتە جاهیل شیخ عبدالطیف ئەوەندە لەسەری ڕۆیشتوە کەوا ابن تیمیە لەمەسەلەی تەوحیدا عوزر نادا بەکەس .

شێخ(عبدالطیف)دەلێ : (القسم الثاني من الكتاب رد على خمسين دليلا في جواز دعاء الصالحين والاستغاثة بهم وطلب الحوائج منهم على أنهم واسطة) بەشی دووەمی کیتابەکە ڕەددانەوەیە لەسەر پەنجا دەلیل لەسەر دروستیەتی پارانەوە لەپیاوچاکان و هانابردن بۆیان داوای ئیشەکانی خۆتیان لابکەی چونکە ئەوان واستەن (فذكر داود بن جرجيس أمورا يظنها أدلة على جواز الشرك الأكبر ؟ )داودی کوری جەرجیس لەکیتابەکەیدا چەند شتێکی باسکردوە کەوا ئەزانێ کەوا دەلیلە لەسەر جائیزیەتی شیرکی أکبر ؟!

وەلامەكەی :

شێخ(عبدالطيف)دەڵێ : (فرد عليه المصنف الشيخ عبد اللطيف ، ابتداء من ص ٣٢١ إلى ص ٣٩٥) رەدی داوەتەوە لە كیتابەكەیدا لەم مەصافەیەدا كەهاتووە (رد على أحد عشر دليلا فقط ، إلا أن المصنف الشيخ عبد اللطيف وافته المنية) لەم ٥٠ دەلیلە ١١ی وەلامداوەتەوە بەلام وەفاتی كرد پێش ئەوەی كیتابەكەی تەواو بێ شێخ عبدالطیف كوری عبدالرحمن ال الشیخ ئەویش لەنەوەی شێخ محمدی كوری عبدالوهابە بەلام ئەم كیتابە شێخ محمود شكری الالوسی تەواوی كرد ناوی نا (فتح المنان في الرد على صلح الإخوان) ئەم كیتابەی تەواو كرد و هەموو بەلگەكانیتری پوچەل كردەوە .

شوبهەی پێنجەم :

شێخ (عەلی ) دەڵێ : (كتاب خاتمة كشف الشبهات)ئەم كیتابە هی (للشيخ عبد الرحمن بن محمد الدوسري)لەكۆتایی كیتابی كشف الشبهاتدا كۆتاییەكی نوسیوە (حيث جعل خاتمة على كتاب كشف الشبهات للشيخ محمد بن عبد الوهاب)هاتووە خاتیمەیەكی داناوە بەسەر كیتابەكەدا (كشف فيه رحمه الله أستار الوثنية الجديدة والشرك المعاصر)ئەمرۆ لەزەمانی ئێمەدا بتپەرستەكانی ئەمرۆ ئەوانەن كە شیركی معاصری پێ دەلێن هاتووە ئەمەی باس كردوە شێخ (كما كشف الشيخ محمد بن عبد الوهاب الشرك المعاصر له) شێخ محمدی كوری عبدالوهاب معاصرەی ئەو شیركەی كردوە ئەوەی بەیان كردوە شێخ عبدالرحمن هاتووە كە ئەو شیركەی ئەو معاصری بووە كە باسی دەكەین هاتووە ئەوانەی كشف كردوە .

شێخ(عبدالرحمن الدوسری )دەڵێ : (إن الشيخ محمد بن عبد الوهاب في كتابه كشف الشبهات عالج شرك التخريف بصورته المتمثلة في دعاء الأموات والغائبين وتقديس القبور) شێخ محمدی كوری عبدالوهاب داوا كردن لەمردوان و غائبین و بەپیرۆز راگرتنی گۆرەكانی هەموو پوچەل كردەوە بەكیتاب و بەسونە ئەوكاتە شێخ معاصەرەی ئەو كاتەی كردوە (ثم حدثت ضروب من الشرك برزت بأسماء وألقاب ينخدع بها الجهلة ويتعلق بها المغرضون والحاقدون)بەلام ئەمرۆ شتێك دروست بووە لەو شیركانە كەس زۆر كەس خۆیانی پێوە مەشغول دەكەن پێ

خەڵەتاوە (ثم قال إن الذي تولى كبره هم اليهود والمجوس)يەهود و مەجوس ئەمانەی لەناوماندا دروست کردوە (لما خافوا من البعث الإسلامي الصحيح الذي ندب إليه الشيخ محمد بن عبد الوهاب وقام به مع أعوانه) خەڵکی کەزیندوو کردەوە لەتەوحید و شارەزای کردن لەتەوحید کەسانێکی زۆر گەڕایەوە بۆ خوا پەرستی دیسانەوە ئەوان هاتن زانیان هەر بەئەمانە ناتوانن خەڵکی هەڵبەخەڵەتێنن و توشی کوفر و شیرکیان بکەن هەڵسان جۆرێك لە شیرك و کوفری معاصریان دروست کرد کەلەلای زۆر کەس ئێستا بیٚ ئاگان لێی نمونەی دیموکراتیەت و علمانیەت ئەو مەزهەبانەی ئەمرۆ پەرلەمان و دەستور دانان ئەمانە هەمووی بونتە شوبهە و کیشە کەوا ئایا پیٚ کافر دەبی یاخود نا لەبەر ئەوە ئەمرۆ کەسانێك هەڵدەستن خەڵکی ئاگادار ئەکەنەوە ئەمەش هەمان شتە جۆرێکیترە لە جۆرەکانی کوفر و شیرك و ئیلحاد با ناوەکەشیان ئیسلامی بیٚ وەکو دیموکراتیەتیان ناوە شورا دیموکراتیەت کەناونرا بە شورا هەرهەمان شتە کاتێك دوعا کردن و هانابردن بۆ مردوان ناونرا بە وەسیلە ئەڵێن خوا لەقورئاندا باسی وەسیلە ئەکا ئێستاش خەڵکانێك نین بڵێن دیموکراتیەت شورایە ئەوەتا خوای گەورە نیە لەقورئاندا شورای باس کردوە !؟شتەکان ئەبنین و ئەبیستن چۆن ئەگۆڕێن .

شێخ (عبدالرحمن) دەڵیٚ : (وفي هذا الوقت كسبوا أنصارا من بني جلدتنا فألهبوا حماس الجهلة بنعرات العصبيات القومية في كل أمة إسلامية)یەك لەوشتانەی کەوا توانیان ئومەتی ئیسلامی تێدا پارچە پارچە بکەن مەلەسەی نەتەوایەتی کورد با هەر کورد پەرست بیٚ و عەرەب با هەر عەرەب پەرست بیٚ شیرازەی ئومەتی ئیسلامیان تێکدا کەپێویستە ئومەتی ئیسلامی یەکپارچەبیٚ یەکێکە لە هۆکارەکانی سەرکەوتن کەس بیر ناکاتەوە کەوا ئومەتی ئیسلام سەربکەوێی هەمووی بیردەکاتەوە کەوا قەومەکەی سەرکەوێی (فظهرت الوثنية الجديدة وعبادة المادة والشهوات وتقديس الأشخاص)ئەمانە دروست بوو پەرستنی مادە و پەرستنی هەوا و ئارەزووەکان کەسەکە پیٚرۆز کراون بەناوە دینەکەیانیشیان نا بەڵکو بەهۆی مادەوەیە کەسی واهەیە لەلای خەڵکی پیرۆزە کەچی سەیری دەکەی هیچ خزمەتێکی قورئان و حەدیسی نەکردوە بەڵکو تەنها خزمەتی قەومی کردوە خزمەتی دار و بەردی کردوە (بحجة الجنسية والوطنية ،حتى تكونت في المحيط الإسلامي والعربي خاصة ردة

جديدة)لەدەوروبەری موسلمانانیدا بەتایبەتی لەناو عەرەبدا ریدەیەکی تر دروست بوو (بما انتحلوه من مبادئ وطنية ومذاهب مادية مزخرفة بألقاب ظاهرها الرحمة وباطنها العذاب)ئەمەیان دروست کرد بیرۆکەکەی لە رووکەشدا رەحمەتە بۆ ئیمە ئەمانەی باسمان کرد بەلام لە ئەساسدا هەمووی عەزابە بۆ ئێمە (وبعد هذه المقدمة تكلم الشيخ عبد الرحمن الدوسري عن معنى الألوهية وأصولها وهما أصلان ) دوای ئەم موقەدیمەیە هاتووە باسی ئەوەی بۆ ئێمە کردوە کە مانای الالوهیەت مانای چیە کە تۆ ئەلێ (لا اله الا الله ) ئەم الالوهیەتە مانای چیە

ئەفەرمووی شێخ کەوا دوو ئەصلن :

١–(الكفر بكل معبود ) ئەبێ تۆ بزانی کەوا تۆی موسلمان (لا اله الا الله) کەی تۆئەوەیە (لا اله) (الكفر بكل معبود). کافر بوونە بە هەموو پەرستراوێك بەناحەق.

٢–(إفراد الله بالعبادة والاستسلام لحكمه) وە مانای بەشی دووەمی (لا اله الا الله ) کە (الا الله ) یە واتا (إفراد الله بالعبادة والاستسلام لحكمه) بەتەنها عیبادەت بۆ خوای تعالی بکەی وە تەسلیم بیت بە حوکمەکانی .

ئەگەر ئینسان وانەبێ بەئەتەکید موسلمان نیە ئەو کەسە ئەبێ ئەم دوو خالە هەبێ لە هەرکەسێکدا کەوا موسلمان بێ هەرچ عیبادەتێك بکەی مادەم ئەم دووخالەت تێدا نەبێ ئەوا تۆ موسلمان نی ئەم دووانەت تەحقیق نەکرد هیچ سودێکی نیە ئەبێ هەمووماں لەوە تێ بگەین .

شێخ (بن باز )باس دەکا لە کشف الشبهاتدا ئەلێ : (أن المسلم مصل الصائم إذا أتا بمكفرا لم يعذركانه مصلی )ئەگەر شتێکی هێنا پێ کافر بوو با نوێژ کەریش بێ هەر کافرە (لم يعرف كفره كونه مصل وينتسب إلاسلام يكون بالكفر الجديد مرتددا وتبطل الاعماله )هەموو کارەکانی بەتال ئەبێتەوە با نوێژ و رۆژوو عیبادەتیشی هەبێ بەردەوامیش بێ لەسەری خۆی لەناو کەعبەشدا نوێژ بکا هەروەکو ئەبو جهل چۆن لە کەعبەدا تەواف دەکرد موشریك بوو تۆش لەکەعبەدابی مادەم شتێکت هێنا پێ کافر دەبێ کافری شێخ ئایەتەکە

ئەهێنێتەوە (وَقَدِمْنَآ إِلَىٰ مَا عَمِلُواْ مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَٰهُ هَبَآءً)[1] ئایەتەکەش اسپاتی عەمەل دەکا هەرعەمەلێکیان کردبێ خوای گەورە ئەلێت ئەی کەین بەتۆزی بادراو . شێخ حەدیس دەهێنێتەوە کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی (من بدل دینه فاقتلوه)[2] تۆ کاتێك ئەو دینە بەدل دەکەی بەرە و دوعای مردوان ئەرۆیی دینەکەت بەدل کرد بەرە و دیموکراتیەت و لیبرالیەت وعلمانیەت ئەرۆیی دینەکەی خۆت بەدل کرد و گۆریت یاخود بەرە و قەومیەت ئەرۆیی بەهەمان شێوە با هەر نوێژیش بکەیت و رۆژوو بگریت تۆ دینەکەت بەدل کرد (وهذا باب معروف باب حکم المرتد فهو المسلم یکفر بعد الاسلامهم) ئەم بابە دیار و ئاشکرایە کەوا موسلمان کافر دەبێ لەدوای موسلمان بوونی بەم شتانە (ولوکان من أعبد الناس) چەند موهیمە ئەم کەلیمە کەچی ئەمرۆ ئەوەی بۆتە رێگر لەوەی بلێن فلان کەس کافرە چونکە کوفر و شیرکی هەیە ئەلێن کاکە نوێژ دەکا کاتێك دوعا دەکا کافر فرمێسك بەچاوی دێتە خوارەوە تۆچۆن پێ دەلێ کافرە پێت ئەلێ هەموو قورئانی لەبەر تۆچۆن پێ دەلێ کافرە .

شێخ دەلێ (أعبد الناس)ئەوکەسەکە (ثم سب الله ورسول وأتخذ الالة من دون الله یدعوهم أو یستغث بهم أو جاء أحد وجب الصلاة أوجاء أحد وجب الزکاة وجحد تحریم الزینا )بەویستی خۆیان ئینکاری حەرامیەتی زینا دەکەن ئەمرۆ هەمانە لەم جۆرانە ئەلێ با بیکات و رێیان لێ مەگرن ئازادییە کە وتی ئازادییە لەگەل پێغەمبەردا بیت تۆ کافریی بەم کەلیمەیە وەك ئەبو جهل وایت و هیچ جیاوازیەکت نیە . چۆن ئازادییە خوای تعالی ئازادی بۆ ئێمە دانەناوە بەلکو بەندایەتی و عەبدایەتی بۆئێمە داناوە (أو جحد تحریم الخمر أوما أشمە ذلك من هذه الزئیات بطلت الأعمال کلها ) هەمووی بەتال ئەبێتەوە (وکفر بهذا شيء وصارت الأعمال کلها باطلا )کردەوەکان هەموی باطل دەبێ لەگەل ئەو شیرك و کوفرەدا (فمن أتا بمکفرین بطة الأعماله وصارت هباء منثورا ) هەروەکو الله تعالی دەفەرموویی (وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)[3] هەموو پێغەمبەران ئەگەر بێتوو شیرکێك بکەن هەموو عەمەلەکەیان پوچەل دەبێتەوە هەروەکو الله تعالی دەفەرمووی (وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ

[1] :سورة الفرقان اية : ٢٣
[2] :رواه البخاري
[3] :سورة الأنعام اية : ٨٨

لَيَحۡبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ)[1] خواى گەورە بەهەموو پێغەمبەرانى وت وە بەپێغەمبەر محمد ﷺ دەڵێ شيركێك بكەى هەموو كاروكردەوەت پوچەل دەبێتەوە لەلاى خواى گەورە تەوحيد و شيرك هەيە .

جا لێرەدا با ئاگايەمان لەشتێك بى زۆربەى كەس لێرەدا جورئەتى نيە بۆ حوكمدان بەسەر موشريكدا ئەڵێ كاكە ئەوە دەڵێ (لا اله الا الله ) و نوێژ دەكا تۆچۆن كافرى دەكەى ئەگرى و ئەپارێتەوە ئەڵێ تۆچۆن كافرى ئەكەى ئەم شتانە باس ئەكەن ئێمە ئەوەمان نيە بەلكو پەوەيست بوون بەتەوحيدەوە ئەوە تۆ موسلمانى پەوەيست نەبوون بەتەوحيدەوە و هێنانى يەك شيرك لە شيركەكان كە شيركى ظاهيرە پێ ئەبيت بەكافر .

شێخ ئايەت ئەهێنێتەوە (وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ)[2] هەر كەس ئيمانى هەبێت و كافر بێت دوايى خواى گەورە هەموو كارو كردەوەكانى پوچەل دەكاتەوە لە دۆراوان دايئەنێى .

شێخ دەڵێ : (فالواجب على كل مسلم أن يحذر مانهى الله عنه جمع المعاصى وأن يكون حذره من شرك أشد) ئەبێ خۆى لە هەموو معاصى بپارێزى بەلام لەشيرك لەهەموويان ورياتر بێ ئەوەتا پێغەمبەر ئيبراهيم وتويەتى (وَٱجۡنُبۡنِي وَبَنِيَّ أَن نَّعۡبُدَ ٱلۡأَصۡنَامَ)[3]( ولا يقول أنا فهمة التوحيد )مەڵێ من لە تەوحيد تێگەيشتووم ئيتر پێويستم بەهيچ نەما (أنا فهمة الإسلام لا بأس لايأمن أن بعض الناس يقول التوحيد فهمنا وهو جاهل لايفهمه) زۆر كەس ئەڵێ من لەتەوحيد تێگەيشتووم بەس تێ نەگەيشتووى ئەگەر تێ بگەيشتيتايە نەئەچووى تەشريعى غەيرى خواى تعالى دابنێ بۆ خەلكى بلێت خەلك ئازادە ! (ولوا فهمه لتبصر به فلحذر ولايأمن) با ئاگادارى تەوحيد و ئيمان بێ و لێشى تێگەيشتبێ با ئەمين نەبێ لەخۆيى و حەزەر لەخۆى بكا (ويسئل ربه ثبات ) شێخ دەڵێ با تێش بگا بەس گرينگ ئەوەيە ئيستقامەى هەبێ لەبەر ئەوەى چەندين كەس تێگەيشتبوون بەلام لاياينداوە .

شێخ(عبدالرحمن)دەڵێ : (ثم تكلم عن حقيقة العبادة والحب في الله وبغض أعداء الدين) باسى حەقيقەتى پەرستنى خواى گەورە و خۆشەويست ى و رق لێبوونەوەمان تێ ئەگەيەنێ شێخ

---

[1] :سورة الزمر اية : ٦٥
[2] :سورة المائدة اية :٥
[3] :سورة إبراهيم اية : ٣٥

رق لێبوونەوەی دووژمنانی دێن کە ئەمڕۆ رق لێبوونەوەی دووژمنانی دین هەر نەماوە بەکەمی نەبێ یانی ولاء براء نەماوە لەلای زۆربەی خەلکی ئەبێت باش ئاگاداری ئەمە بین .

(ثم تكلم عن حقيقة ملة إبراهيم)باسی دینی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکا خوای گەورە چەند جەختی کردۆتەوە لەدینی پێغەمبەر ئیبراهیم لەقورئاندا کە ئەبێت مولتەزیم بین پێوەیی (وقال وبه تعرف مدى ما انغمس فيه غالب المحسوبين على الإسلام من الوثنية الجديدة)ئا بەمە تۆ ئەزانیت حەقیقەتی دینی میلەتی ئیبراهیم تێگەیشتی کە یەکخوا پەرستیە ئەبێ کافربی بەهەمووشتەکانیتر غەیری یەکخوا پەرستی بەمە ئەزانی کەوا چەند زۆر لەوانەی کەوا لەسەر ئیسلام حیساب کراون بەمانای ئەوە لەناو خەلکدا موسلمانن ئەوە حیزبی ئیسلامییە ! چۆن رۆچوون لەکوفردا لەم (الوثنية الجديدة)ئەمرۆ رۆچوون و چونەتەناویەوە (وما استجلبوه من مبادئ الغرب ومذاهبه المادية فجعلوا حدود الوطن فوق حدود الله) یەك لەوشتانە سنوری نیشتمان لەسنوری خوای تعالی فراوانترە ئێستا بەم شێوەیەی کەوا سنوری نیشتیمانیان خۆستۆتە پێش وگرینگ ترە لەسنورەکانی خوای تعالی سنورەکانی خوای گەورە دەشکێنرێی کێشە نیە لەلای بەس نابێت سنوری نیشتیمان بشکێنرێی (وجعلوا لأنفسهم الخيرة فيما يشرعون وينظمون خلافا لما قضى الله ورسوله)هاتوون ئیختاریان بۆخۆیان داناوە بەکەیفی خۆیان چی دائەنێن و چی تەشریع ئەکەن چی گەورە دەکەن بەکەیفی خۆیان چۆنیان بوێی وادایی ئەنێن غەیری ئەوەی کە خوا و پێغەمبەری خوا وتوێتی ﷺ (واتبعوا ما يمليه رجال تألهوهم بالحب والتعظيم وجعلوهم أندادا من دون الله)هاتوون پیاوانێك بوون نوسیبوویانەوە کەوا ئەوانەی هێناویانە بپەرسترێن و شوێنیان بکەون (وجعلوهم أندادا من دون الله)کردونیانن بەهاوبەش لەگەل خوای تعالی دا وەکو (كالقومية والوطنية وما يستلزمها من المذاهب المادية)قەومیی و نیشتمان و ئەوانیتر لە مەزهەبە مادییەکاندا ئەمانە هەموی لەدەستکردی ئینسانەکانە خوای تعالی بەمە رازی نیە .

(ثم ذكر من جعل الوطن ندا لله) هەیە وەلاتەکەی کردوە بەشەریکی خوای گەورە !.

شێخ شیعرێکی هێناوە کەوتویانە :

( بلادك قدمها على كل ملة ............ ومن أجلها أفطر ومن أجلها صم)

(بلادك قدمها على كل ملة)ولاتەکەی خۆت بخەرە پێش هەموو دینێکەوە ،( ومن أجلها أفطر ومن أجلها صم)لەپێناوی ولاتەکەت بەرۆژووبەو بەرۆژوو مەبە .مەبەستیانە کەوا عیبادەت بۆ ولاتەکەت بکەی ، عیبادەتی خوای گەورە لابراوە ئەم ناوانە خراوەتە پێشەوە .

شێخ(عبدالرحمن)دەلێ : (وجلبوا موالاة أعداء الله بحجة الجنس والوطن ، وتعطيل الشريعة بحجة التطوير الفاسد)هاتوون مولات و دۆستایەتیان لەگەل دووژمنانی خوادا کردوە بەحوجەی جنسیەی بەشەرەکان و رەگەزایەتی ئینسان ئەوەتا ئەلێن ئێمە هەموو مرۆڤین یاخود نیشتمان و ولات لەناو ولاتەکەدا ئەلێن گرینگ ئەوەیە لەناو ولاتەکەی خۆماندا بین گرینگ ئەوەیە فلان نیشتمانی بین بۆنمونە ئەلێن ئێمە هەموومان عێراقین گرینگ نیە تۆ چ دینێکی یەهودی و نەصرانی یاخود مجوسی هەرچ بی گرینگ ئەوەیە تۆ عێراقی! وە شەریعەتی خوای گەورەیان راگرتوە و پەکیان خستووە .

کەواتە ئێستا خوا پەرستی ناخوێنرێتەوە وە ئەم خوا پەرستیە نابێتە سنگی محەك و میزان بۆ جیاکردنەوەی موتەقی و غەیری موتەقی ئەو شتانە نەماوە ئێستا بابەتەکە هەمووی بویتە ئەوەی ئێمە هاولاتین ! خەلکی یەك ولاتین ئیتر هەرچیەك دەکەی کەیفی خۆتە ئەبێ هەمووومان وەکو یەك وابین ئەبێ یەکسان بین ! ئاخر چۆن دەبێ خوای تعالی دەفەرمووی (أَفَنَجۡعَلُ ٱلۡمُسۡلِمِينَ كَٱلۡمُجۡرِمِينَ ۝٣٥ مَا لَكُمۡ كَيۡفَ تَحۡكُمُونَ )[1] خوای تعالی وا دەلێ کەچی ئەوانیش دەلێن نەخێر نابێ لەسەر ئەساسی دین تەفەرقە و جیاوازی هەبێ هەرکەس دینی خۆی بۆخۆیی ئەمە هەمووی (الوثنية الجديدة)باش بزانن هەرکەسێك ئەوە بلێ هەرچی عیبادەت هەیە بیکا لێ قبول ناکرێی و کافرە .ئینجا هەیە ئەترسێ ئەلێ کاکە ئاخر ئەوە نوێژ دەکا ئێمە وەلامی ئەوانەمان هەمووی دایەوە .

شێخ(عبدالرحمن)دەلێ : (وعبادة كل طاغوت في سبيل ذلك كقولهم)وە عیبادەتی طاغوت (الدين لله والوطن للجميع) ئەلێ دین بۆ خوا ئەوە نێوانی خۆت و خوایە بەلام نیشتمان و وەطەهی هەمووومانە ! نابێ تۆ لەسەر ئەساسی دین تۆ حوکم بکەی .

[1] :سورة القلم اية : ٣٥-٣٦

(وكقولهم ( الدين علاقة بين العبد وربه فقط لا شأن له في الحياة)ئەوەش قسەیەکیتریانە کە دەڵێن دین عیلاقەیە لەنێوان ئینسانەکان و خوای گەورە بەتەنها پەیوەندی بەژیانمانەوە نیە .

(وكقولهم ( إرادة الشعب من إرادة الله)ئەلێن ئێمە چیمان بویست خواش ئەوەی دەوێت ! .

(وذكر أنه لا يزال خريجو المدارس الاستعمارية يركزون هذه المفاهيم في طبقات الأمة الإسلامية)شێخ باس دەکا کەوا ئەوانەی کەوا تەخروجیان کردوە لەو خوێندنگایانەی کەوا ئیحتلالین شێخ وتویەتی استعماری بەلام ئەوان درۆدەکەن ئیمە نوێی ناکەنەوە بەلکو وێرانمان دەکەن و تێکمان ئەدەن ئەو خوێندنگایە ئەمریکی و ئەوروپیانەی کەدێتە ناومانەوە چ لێرە بن چ لەلای خۆیان بن کە خەلکانی ئێمە ئەچنە ناویان ئەمشتانەیان لەناو بیرو هۆشتدا ئەچەقێنن کەوا ئەم تێگەیشتنانە وەربگرن کە نیشتیمانی و رەگەزیی و ئیمە هەموومان هاولاتین و مرۆڤین ئینجا بۆ ئەمشتانەش ئایەت ئەهێنەوە ئەلێن خوای گەورە دەفەمووی (وَلَقَدۡ كَرَّمۡنَا بَنِيٓ ءَادَمَ)[1]کاکە خوا رێزی گرتوە ئەوە یەهودە و نەصارایە موهیم ئەوەیە ئینسانە خوا رێزی گرتوە تۆش ئەبێ رێزی لێ بگریی. ئاخر تۆ بێ عقلی خوای گەورە دەفەرمووی (إِنَّ أَكۡرَمَكُمۡ عِندَ ٱللَّهِ أَتۡقَىٰكُمۡ)[2] ئەوە بەنی ئادەمە کە خوای تعالی رێزی لێناوە بەمەرجی ئیمان رێزی لێناوە ئەگەر ئیماندار نەبوو خوای تعالی رێزی لێ نەناوە خوای تعالی دەفەرمووی (ثُمَّ رَدَدۡنَٰهُ أَسۡفَلَ سَٰفِلِينَ ۞ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ )[3] دواتر خوای گەورە دەفەرمووی (إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ)[4] ئەی بۆ باسی ئەوە ناکەی کەوا ئینسانیەت هەمووی لەخەسارەت مەندی دایە ! ئەو ئینسانەی کەتۆ باسی دەکەی ئەوەتا خوای گەورە فەرمویەتی (إِنَّ ٱلۡإِنسَٰنَ لَفِي خُسۡرٍ ۞ إِلَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلۡحَقِّ وَتَوَاصَوۡاْ بِٱلصَّبۡرِ )[5] تەنها ئەوانە نەبن کەوا کاری چاك دەکەن .

شێخ دەلێ (وقال إن المدارس هي أول ما فرض الاستعمار علينا ثقافته بواسطتها)ئەم خوێندنگایانەی کە ئەوان دایانناوە یەکەم شت کەوا فەرزی کرد لەسەر ئێمە کە تێگەشتن و

[1] :سورة الإسراء اية :٧٠
[2] :سورة الحجرات اية: ١٣
[3] :سورة التين اية : ٥
[4] :سورة العصر اية :٢
[5] :سورة العصر اية :٢-٣

ڕۆشەنبیری ئەوان بەڕێوە ببەین . ئەوەتا لەناو خوێندنگاکاندا کە خۆتان ئاگادارن دین و ئیمانی تێدا نەماوە وە تێشی نەبووە تا تێدا بێت ! ئەگەر هەندێکی تێدابووبێ کاتی خۆیی ئێستا ئەوەشی نەماوە هەموو مندالەکان لەسەر ئەساسی دین فێریان ناکەن لەسەر ئەساسی نیشتمان پەروەریی فێریان دەکەن یان پێکەوە ژیان وەکو دەڵێن لەناو ولاتمان نەصرانیەت هەیە یەزیدیەت هەیە هەرچ دین هەیە ئەبێ ئێمە ڕێزییان لێ بنێن منال فێری ئەمە ئەکەن ، جا مندال چۆن پەروەردە دەبێ کە ئەم بیرو هۆشەی تێدایە و تێدا ڕوواوە ! ئەمە دیفاع لەدینی خوا ئەکا ! بروای بەدینی خوا دەبێ ! ئەوان ئاوا خەریکی ئێمەن و هەر لەمندالیەوە تێکمان ئەدەن کەچی تازەش هاتووە کابرا کە خۆی بە سەلەفی دەزانی ریشێکی لەسەر سونەت بەرداوەتەوە کە نازانی نرخی ئەم ریشە چیە وە خۆی مقید کردوە بەهدیی پێغەمبەرەوە ﷺ لەظاهیردا بەلام لەناوەرۆکی دینەکە تێ نەگەیشتووە کەپێویستە ئێمە هەردووکی بەرین بەڕێوە ناوەرۆك و ظاهیریش ئێمە وەکو ئەو کەسانەناکەین کە تەعلیق ئەدەن کە کابرا سیمای ریش ناشرین ئەکەن کە باسی ریش دەکەن لەم جۆرەکەسانە بەناشرینی باسی ریش دەکەن ئێمە واناکەین ئەمیش قسە وتنە بەدین نەخێر کاکە مادەم تۆ هەدیکی ظاهیرت هەیە خوا جزات بداتەوە وەرە بەتەواوی لەدینەکە تێ بگە بزانە خەلك خەرکی چیە بزانە کافران چیان لەئێمە کردووە لەماوەی رابردووەدا ئەم ئومەتەیان چۆن هەلوەشاند لەیەکتریدا کەوا تێدا ولاء و براء نەمێنی ئەوەشتانەی کەوا واجبە لەدینی ئیسلام بە حەرام بزانرێی ئەوەی حەرامە بەواجب بزانرێی .

(ثم قال : فعلى المسلمين شيبا وشبانا وحكومات وشعوبا أن يقاوموا هذا الشرك الجديد والوثنية الجديدة)لێرە کە شێخ دەلێ پویستە لەسەر حوکمات ئەوشتانە ڕێگری لێ بکا حوکمات کوا شتی وا دەکا ئێستا خۆی ئەو شتانە دەهێنی کەواتە خەلکەکەی کە بەخۆی دەلێت موسلمان زۆربەی زۆری ئاگای لێ نەماوە ئەبێ خۆمان تێ بگەیەنین لەدینی خوای تعالی هەرکەس لەجێگایی خۆیەوە ئیشارەت بەم شتانە بدا کەمترین شت ئەوەیە کەتۆ لەگەلیاندا نەبی ئێمەش کە ئەوە دەنوسین و دەخوێنین بۆئەوەی لەداهاتوو دا ببین بە بەردی بناغەی ئومەتێك کەوا ولاء وبراء ی هەبێ دیفاع لەدینەکەی بکا بە ئیزنی خوا ئەگەر چی ئەزانین بەتەئەکید ئەم ڕێگەیە قورسترین ڕێگایە بەئاسانی ناتوانی بەسەریدا برۆیی

ئەگەر ئیستقامەت نەبێ هەتا یەکێك تێ ئەگەیەنیت یان دووان عومرێکی زۆرت ئەروا وە چاویشمان لەوە نیە عومرمان ڕۆیشت و نەگەیشتینە نەتیجە گرینگ ئەوەیە هەول دەین تۆ ئەم دینەی خوای تعالی بگەیەنی خەلك تێ دەگا یاخود تێ ناگا لەوە لەلایەن خوای تعالی وەیە بەس ئەبێت هەریەکێکمان لەلای خۆیەوە هەول بدا بۆ ئەم دینە نابێت کەمی کەسەکان وات لێ بکا خاو ببیەوە هەول دەی وەسیلەی غەیر شەرعی بگریتە بەر نەخێر وەسیلەکەت شەرعی نەبێ جائیز نیە .

## هەلوێستی هەردوو شێخ ئیسلام لەسەر کافرکردنی کەسێکی دەست نیشانکراو

یەکێك لەو شوبهانەی کەوا لەناو واقیعی ئێمەدا هەیە ئێستا ئەوەیە کەوا ئەلێن بەکافرکردن ئیشی گەورە علماء یان نەبووە هەتاوەکو حەقیان تێ نەگەیەنن لەئێستادا حەقیشیان تێ بگەینن هەر دەلێ کافر نیە چونکە ئێمە عالم نین !

واتا مەسەلەی کافرکردن مەسەلەیەکە کەوا تێگەیشتنەکەی هەتا بلێ زۆر قورسە لەسەر فکری خەلکی نازانین ئەم بابەتە چۆن تێ بگەن یاخود کە ئەلێ کافرکردن بەلایانەوە ئەوەندە قورسە یان نازانن لە بابەتەکە یاخود هەر خۆیی لێ نادەن وە ناچن مەوقیفی علماء بخوێنەوە بۆئەوەی بزانن علماء مەوقیف و هەلوێستیان چیبووە لەبەکافرکردنی خەلیکیدا هەمووتان باش ئەزانن کەوا لە کیتابە فقهیەکاندا باب حکم المرتدی تێدایە کە باسی ئەوە دەکا کەوا ئینسان بەچی مورتد و کافر دەبێ ئەوەتا علماء یان بەچەندەها خالیان باس کردوە کەوا ئینسانی پێ کافر دەبێ .

جا ئەوەی ئێمە کارمان پێیە لێرەدا هەلوێستی هەردوو شێخ ئیسلام(ابن التیمیە ومحمدی کوری عبدالوهاب) وە ابن القیم باسیان دەکەین بزانین چۆنە چونکە هەندێك دەقیان هەیە بۆتە هۆی ئیشکال و ناروونی لەلای زۆربەی زۆری ئەوکەسانەی کەوا بەخۆیان دەلێن سەلەفی دەلێن ئەوەتا (محمدی کوری عبدالوهاب یان ابن التیمیە) ئەلێ ئێمە کەس کافر ناکەین هەتا ئیقامە حوجەی لەسەر نەکەین ئەمە باوە ، بەس بزانین ئەوکافرکردنە چۆن بووە کە ئەوان

مەبەسیتان بووە یاخود بزانین ئایا موشریك کێ یە وە ئەوکەسەی شیرك بکا موشریکە یاخود نا وە بەچ شیرکێك کافر بووە وە چەند خالێك باس دەکەین ان شاء الله .

## موشریك بەهیچ شێوەیەك لەریزی موسلمانانددا نیە

(المشرك ليس بأعداد المسلمين)ئینسان کە موشریك بوو موسلمان نیە .

لەم بابەتە ئەبین سەیربکەین بزانین پێناسەی علماء یان بۆ ئینسانی موسلمان و موشریك چیە پێناسەی علماء یان بۆ ئیسلام ئەوەندە روونی دەکاتەوە کە موشریك لەناو موسلماندا نیە .

ابن التيميه دەفەرمووی :

(وأيضاً فإن التوحيد أصل الإيمان، وهو الكلام الفارق بين أهل الجنة وأهل النار، وهو ثمن الجنة، ولا يصح إسلام أحدٍ إلا به.)تەوحید ئەصلی ئیمانە کە یەکخوا پەرستیە سەیری ئەم کەلیمەی کۆتایی بکەن (ولا يصح إسلام أحدٍ إلا به)یانی ئیسلامی هیچ کەسێك صەحیح و دروست نیە و نەهاتۆتە جێگا إلا بەم تەوحیدە نەبێ ، وە دەلێ ئەو کەلامەیەکەوا لەنێوان ئەهلی بەهەشت و دۆزەخدا جیاوازی ئەخاتە نێوانیان شێخ لێرەدا ئەلێ (وهو ثمن الجنة،)علماء یان باسی ئەوە ئەکەن کە بەهەشت بەئەعمالی ئێمە دەست ناکەوێی بەلکو مەبەستەکەی سەبەبی ئەعمالەکەیە وەکو دەلێن کەس بە ثەمەنی عەمەلەکەی ناچێتە بەهەشت واتا بەسەبەبی ئەعمال ئینسان ئەچێتە بەهەشت .

وە ئەوەی کەوا مەبەستمانە لەکەلامەکەی شێخدا ئەوەیە کە دەلێ (ولا يصح إسلام أحدٍ إلا به) کەواتە کەس ئیسلامیەتیەکەی دروست نیە إلا بەم تەوحیدە نەبێ کابرای موشریك نیەتی .)[1]

وە دەفەرمووی شێخ (الذي ارتضاه الله وبعث به رسله هو الاستسلام لله وحده، فأصله في القلب هو الخضوع لله وحده بعبادته وحده دون ما سواه) ئەلێ دینی ئیسلام ئەوەی کە خوای گەورە پێی رازییە و پێغەمبەرانی پێ ناردووە (عليهم الصلاة والسلام)ئەوەیە کە

[1]:مجموع فتاوي شيخ الإسلام ابن التيمية –ج٢٤-الفقه٤-تابع الصلاة-الجنائز ص٢٣٥

ئیسنان تەسلیم بیّ بە خوای گەورە بەتاك و تەنها وە ئەصلی ئەم دینەش لەناو دلدایە كە بریتیە لە ملكەچی بۆ خوای تعالی ئەبیّ عیبادەتی بكەی لەدلدا وە تەواوی خشوع وخضوعت بۆی هەبیّ كە تەنها خوای تعالی بپەرستی و كەسیتر نەپەرستی (فمن عبده، وعبد معه إلهاً آخر، لم یكن مسلماً) هەركەسێك خوا بپەرستیّ وە لەگەل خوادا خوایەكیتر بپەرستیّ بەلام دەبیّ بزانین كەوا مەبەستی شێخ لە خوایەكیتر چیە چونكە زۆربەی خەلكی تێی ناگا كە ئەلیّ خوایەكیتر بپەرستیّ بەمانای ئەوەنیە كەوا بلیّ خوایەكتر لەگەل الله دا ئاسمانەكان و زەویی دروست كردوە بەلكو مەبەستەكەی بەقسە كردنە خضوع و خشوع و ملكەچی بۆ كردنە واتا تۆ چ لەعیبادەتدا یان لەحوكمدا غەیری خوای تعالی بپەرستی یاخود پەیرەویی لەبەرنامەیەی غەیری خوای تعالی بكەی تۆ موشریكی تۆ نەبووی بە موسلمان (فمن عبده، وعبد معه إلهاً آخر، لم یكن مسلماً)شێخ ئەلیّ موسلمان نیە ئەوكەسە .

كەواتە لەلای شێخ ئیسلام هەركەسێك ئەگەر بێتوو خوا بپەرستیّ وە لەگەل خوای گەورەشدا كەسانیتر پەیرەویی لیّ بكا ئەو كەسە موسلمان نیە (ومن لم یعبده بل استكبر عن عبادته لم یكن مسلماً) ئەوكەسەشی خوا نەپەرستی بەلكو ملهوری بكا وە تەكبور بكا لەعیبادەتی خوای گەورە ئەوكەسەش موسلمان نیە . كەواتە ئیسلام (والأسلام هو الاستسلام لله) ئەوەیە كەوا تۆ بەتەنها تەسلیمی خوای گەورە بی .)[1]

ابن القیم دەفەرمووی :

(وأنه لیس هو المعرفة فقط)ئیسلام ئەوەندە نیە تەنها تۆ بیناسی بەو مانایەیی ناسین نیە بەتەنها (ولا المعرفة والإقرار فقط)وەناسین و ئیقرار پێكردنیش نیە تەنها بەم دووانە ئەلیّ ئەزانم ئیسلام چیە وە دانیشی پیّ ئەنیم (بل المعرفة والإقرار، والانقیاد، والتزام طاعته ودینه ظاهرا وباطنا)بەلكو ئیسلام ئەوەیە كەوا تۆ بیناسی وە ئیقراری پیّ بكەی وەپاشان ملكەچ بی و فەرمانەكانی جیّ بەجیّ بكەی لەظاهیر وباطندا ئەوەیە ئیسلامەتی ئەوەی ئەمەی نەبیّ نابیّ . كەواتە كەسێك موشریك بوو ئەمەی نابیّ )[2] .

[1]:الایمان لإبن تیمیة جزء ١ص٢٠٧
[2]:زاد المعاد :٣\٦٣٨

وەشێخ دەفەرمووی : (والإسلام هو توحيد الله وعبادته وحده لا شريك له، والإيمان بالله وبرسوله)ئیسلام بریتیه لە یەکخوا پەرستی و عیبادەت کردنی خوای تعالى بەتاك وتەنها وە عیبادەت ملکەچی بۆ کردنە وە پەیروەی لەفەرمانەکانی بکەی (والإيمان بالله وبرسوله واتباعه فيما جاءَ به، فما لم يأْت العبد بهذا فليس بمسلم)هەر عەبدێك و بەندەیەك ئەمە نەكا موسلمان نیە کەواتە نابێ ئەم خەلکە بەخۆیی بلێ من موسلمانم ئەبێ پێناسەی ئیسلام لەخۆی بکا و بزانی بەراستی ئیسلامی جێ بەجێ کردوە و موسلمانە !

ئیسلام و موسلمانیەتی پێناسەکەی ئەوەیە : کەوا تۆ تەسلیم بی بەخوای تعالى وە ئینقیاد بکەی بە تاعەتەکانی وە بەقسەی بکەیت و نابێ کەسیتر لەگەل ئەو خوای تعالى دا بپەرستی وە پەیرەویی لێ بکەی حوکمێك لەحوکمەکان پێچەوانەی حوکمی خوا بێ لەسەر ئەم زەوییەدا تۆ پەیرەویی لێ بکەی تۆ شیرکت کرد لەگەل عیبادەتەکەی خوادا .

(وإن لم يكن كافراً معانداً فهو كافر جاهل) سەیری ئەم عیبارەتەش بکە ئەلێ ئەگەر کەسەکە کافرێکی معانید نەبوو ئەو کافرێکی جاهیلە بەو مانایەیی ابن القيم کافری کرد بەدوو بەشەوە معانید و جاهیل ، واتا جاهیلیش هەر کافرە .

جائەوەی لێرەدا مەبەستمان ئەوەیە کە زۆر کەس دەلێ ئەگەر ئینسان جەهلی هەبوو بەم جەهلە عوزری هەیە نەخێر هیچ عوزری نیە بەلکو ابن القيم دەفەرمووی ئەگەر کافری معانید نەبوو ئەوە کافری جاهیلە .

کەواتە کافرمان هەیە معانیدە و کافرمان هەیە جاهیلە ، جاهیلە بەتەوحید )[1]

محمدی کوری عبدالوهاب دەفەرمووی :

(اعلم رحمك الله أنّ هذه الكلمة هي الفارقة بين الكفر والإسلام، وهي كلمة التقوى)شێخ دەلێ بزانە رەحمەتی خوات لێ بێ ئەم کەلیمەیە کە کەلیمەی (لا اله الا الله) جیاکەرەوەیە لەنێوان کوفر و ئیسلام وە ئەو کەلیمەیەش تەقوایە کەلیمەیەکە کەوا خۆتی پێ دەپارێزی لەعەزابی خوای گەروە لەهەتا هەتایی دۆزەخدا (وهي العروة الوثقى، وهي التي جعلها إبراهيم عليه السلام كلمة باقية في عقبه لعلهم يرجعون.)بریتیە لەو دەسکە پتەوەی کەتۆ ئیمان و ئیسلام و

[1]:طريق الهجرتين وباب السعادتين .جزء-١ ص٤١١

ئیحسانی پیٚ دەگریی ئەگەر ئەوە نەبیٚ ئەوا هەموو کارەکانت بەبلاش ئەروات و پوچەل دەبێتەوە وە ئەم کەلیمەیە کە باوکە ئیبراهیم جێهێشت لەناو نەوەکانیدا هەتا دوایی وە وەصیەتی لەسەر کردن وە پێغەمبەران وەصیەتی مندالەکان و نەوەکان و گەلەکانی خۆیانی لەسەر کردوە لەسەریی برۆن .

وەشێخ دەلیٚ (وليس المراد قولها باللسان)تەنها مەبەستەکە ئەوە نیە بەزمان بوترێی کەچی ئەمرۆ زۆربەی زۆری تەنها بەزمان ئەیلیٚ (مع الجهل بمعناها)کە بیٚ ئاگایە لەماناکەی (فإنّ المنافقين يقولونها وهم تحت الكفار في الدّرك الأسفل من النار، مع كونهم يُصلون ويتصدقون) کەچی مونافیقەکان ئەم کەلیمەیان ئەوت کەلەکاتێکدا لەسزادا لەژێر کافرەکانیشەوەن لە ئەوپەری خواری دۆزەخەوە لەکاتێکدا نوێژیشیان ئەکرد و خێریشیان ئەکرد ، ئەمانە لێیان وەرناگیری چونکە تەوحیدەکەیان نیە .

شێخ دەفەرمووی (ولكن المراد قولها مع معرفتها بالقلب ومحبتها ومحبة أهلها وبغض ما خالفها ومعاداته)سەیری ئەم کەلیمەیە بکەن مراد لەم (لا اله الا الله)یە ئەوەیە کەوا دەبیٚ تۆ بیناسی بەدل وە ئەبیٚ خۆشت بوێی وە ئەهلی (لا اله الا الله) ت خۆشبوێی وەرقت لەهەرشتێك بیٚ کە پێچەوانەی ئەم (لا اله الا الله)بیٚ و ئەبیٚ دژایەتیشی بکەی .

هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی : (من قال لا إله إلاّ الله مخلصا » ، وفي رواية « خالصا من قلبه)[1] هەرکەسێك بلیٚ (لا اله الا الله ) ئەچێتە بەهەشتەوە ئەبیٚ بەموخلیصی بیٚ وە ئەبیٚ ئەو کەسە تەواو موخلیص بیٚ بۆ خوای تعالی

موخلیص: یانی کەسێك بەتەواوی ئەم فەرمانرەواییەی بۆ خوای تعالی پوختە کردو شیرکی بۆ ناکا لەعیبادەتەکانیدا .

(وفي رواية « صادقا من قلبه)وە لەریوایەتێکتردا هاتووە ئەبیٚ راستبکا لەگەلیدا ،چۆن کەسێك راست دەکا لەگەل (لا اله الا الله)دا کەبلیٚ من لەخوای گەورە زیاتر کەسیتر ناپەرستم و عیبادەتی بۆ ناکەم دواتر کەسێکیتر و شتێکیتر بکاتە شەریکی خوای پەروەردگار ئەوە درۆ دەکا کەواتە بابەتەکە هەر زمان نیە .

---

[1]: الدعاء للطبراني رقم ١٤٧٥ :

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووی ؛ (من قال لا إله إلاّ الله وكفر بما يُعبد من دون الله)[1] کەواتە هەرتەنها (لا اله الا الله ) کە کافی نیە ئەبێ هەموو ریوایەتەکان کۆبکەینەوە ئەلێ ئەو کەسەی وتی (لا اله الاالله ) و لەخوازیاتر کەسیتر ناپەرستم و عیبادەتی بۆ ناکەم (وكفر بما يُعبد من دون الله) ئەبێ کافر بێ بەهەرشتێك بەغەیری خوای تعالی سەمع و تاعەی نەبێ بۆ هیچ کەسێك عیبادەت نەکا بۆ پێغەمبەران بۆ مەلائیکە بۆ پیاوچاکان چ جای بۆ پیاو خراپانی ئەم سەردەمی کەوا هەموو ئەو ئەحکامانەمان بۆ دائەنێن کە پێچەوانەی فەرمایشتەکانی خوای تعالی یە تۆ بچی بەقسەی ئەوان بکەی .

شێخ دەفەرموی (إلى غير ذلك من الأحاديث الدالة على جهالة أكثر الناس بهذه الشهادة)زۆر بەی زۆری خەلك بێ ئاگایە جاهیلە و نەزانە بەم شەهادەیەی کەوا دەیلێن ، واتا ئەتوانین بلێن ئەم خەلکە زۆربەی نەچۆتە ناو دینی ئیسلامەوە هەر لەبەر ئەوەی وتویەتی (لا اله الا الله) چونکە ماناکەی تێ ناگا چونکە خالص نیە چونکە موخلیص نیە چونکە راست ناکا لەگەلیدا درۆزنە چونکە موشریکە نەچۆتە ناو دینەکەوە ئەبێ زۆرئاگاداری ئەم خالە بین ئێمە نایەین لەخۆمانەوە خەلك کافر ئەکەین نەخێر ئەچین بزانین خەلك لە(لا اله الا الله )تێ گەیشتووە ئایا بەئیخلاصەوە دەیلێ وە ئیخلاص ئەوە نیە چاوی بنوقێنی و بلێت (لا اله الا الله) نەخێر بەلکو برۆ سەیری واقیعەکەی بکە بزانە عیبادەت بۆ غەیری خوا دەکا بزانە حوکمرانی و پەیرەویی لەغەیری حوکمی خوا دەکا ئەگەر کردی و پەیرەویی لەغەیری خوا کرد کەواتە ئەم کەسە موخلیص نەبوو موسلمان نەبوو بەلکو موشریك بوو .)[2]

شێخ دەفەرمووی(وقال تعليقا من قال لا إله إلاّ الله وكفر بما يُعبد من دون الله)[3] سەبارەت بەم حەدیسە چی دەلێ هەر کەسێك بلێ (لا اله الا الله) وە کافر بێ بەهەرشتێکیتر لەغەیری خوای تعالی بەومانایەیی نەیپەرستێ لەحوکمدا و لەعیبادەتدا لەهەموو شتەکاندا (وهذا من أعظم ما يبين معنى لا اله الا الله ) گەورەترین واتایە کە واتای (لا اله الا الله) واتا ئەکا و روونی دەکاتەوە (فإنه لم يجعل التلفظ بها عاصماً للدم والمال)ئایا بەموجەرت وتنەکەی خوێن و مالت ئەپارێزی ؟! نەخێر (بل ولا معرفة معناها مع لفظها)واتا تۆ ماناکەی بزانی وە

[1]:رواه مسلم
[2]: متن " تفسير كلمة التوحيد " للشيخ محمد بن عبد الوهاب -رحمه الله-
[3]:رواه مسلم

کەلیمەکەش بلێت نابێتە هۆی ئەوە تۆ بپارێزی (بل ولا الإقرار بذلك، بل ولا كونه لا يدعو إلا الله وحده لا شريك له) هەتا ئیقراریشی پێ بکەی هەر ناتپارێزیێ هەتا تۆ لەغەیری خواش نەپەرستی هەر ناتپارێزیێ (لا يدعو إلا الله وحده لا شريك له) (بل لا يحرم ماله ودمه حتى يضيف إلى ذلك الكفر بما يعبد من دون الله)كە تۆ کەسێکی موحید و یەکخوا پەرست بووی ئیمانت بەخوا هەبوو ئەبێ مەوقیفی دووەمیشت هەبێ ئەبێ بلێ من کافرم بەهەرشتێك لەغەیری خوا ئەبێ ئیعلانی ئەمە بکەی ئەبێ بەسەراحەت بلێ کافرم بەهەرشتێك لەغەیری خوای گەورە دەپەرسترێی .

شێخ دەلێ (فإن شك أو توقف لم يحرم ماله ولا دمه)ئەگەر شکی هەبوو لەکافرکردنی کافران یاخود وەستا و وتی من کافریان ناکەم ئەلێ تۆ مال و خوێنت حەلالە و حەرام نابێ بەمە (لا اله الا الله) کەدەیلێت ! واتا تۆ لەناو ریزی موسلماناندا نیت .

ئینجا خۆیی دەلێ (فيالها من مسألة ما أعظمها وأجلها، وياله من بيان ما أوضحه، وحجة ما أقطعها للمنازع.) ماشاءالله ئەم مەسئەلەیە چەند گەورەیە چەند بەرێزە چەند بەیانێکی هەتا بلێ روونە حوجەیەکە کەوا قطعی هەموو حوجەیەك ئەکا بۆ کەسێك کەوا بێت موناقەشەت لەگەلدا بکا .)[1] .

ئا بەم وتەی ئەم علماء یانە ئەوەمان بۆ دەسەلمێت کەوا هەموو کەسێکیان لەلای موسلمان نیە .

## ئیسنانەکان لەدوو حالەت دان

ئینسانەکان لەدوو حالەت دان یان ئەوەتا کەسەکە ئیماندارە و موسلمان و موحیدە ، یاخود کەسەکە موشریکە و کافرە .

(فقد نص أن هؤلاء العلماءان الناس صنفان لا الثلاث لهما إما موحيد لا يعبدوا الا الله وحده لاشرك له وإما المشرك يعبدوا غير الله)کەواتە ئینسانەکان دوو بەشن زیاتر نین یان موسلمانێك

[1] :مغتس المريد الجامع للشروح كتاب التوحيد للشيخ محمد بن عبدالوهاب.ص:٨٢٧

لەخوا زیاتر کەسیتر ناپەرستێ وە کافرە بەغەیری خوا یاخود موشریکە خواو غەیری خوا دەپەرستی .

(ومن المعلوم أن عباد القبور وكل من قدم شيئا الغير الله مما لايكن إلا لله من خصائص إلهية ليس ممن عبد الله مخلصين له الدين) وە زۆر ئاشکراشە ئەوانەی کەوا گۆڕپەرستەکانن هەرکەسێکیش کەوا شتێك بۆ غەیری خوای تعالی پێشکەش بکا کەنابێت ئەوشتە بێجگە لەخوای گەورە پێشکەش بکرێی ئەم شتەش لە تایبەت مەندییەکانی الالوهیەت بێ بەراستی ئەمانە کەسێك نین کەوا بە مخلیصی خوای تعالی یان پەرستبێ واتا موشریکن خوایان پەرستوە لەگەل خوادا کەسێکیترو شتێکیتریان پەرستووە .

کەواتە ئێمە ئینکاری ناکەین لەوەی کەوا خوا دەپەرستێ ، لەئێستادا زۆر کەس ئەمە بوویتە شوبهە لەلایان .پێمان ئەلێ کاکە نوێژ دەکا ڕۆژوو دەگرێی و زەکات ئەدا حەجیش دەکا عیبادەتێکی وا دەکا نمونەی نیە تۆ چۆن بەم کەسە دەلێ موشریك !؟ لەکاتێکدا ئەم کەسەش دەلێ (یارسول الله ) و هاواری پێغەمبەران و پیاوچاکان دەکا یاخود پەیرەویی لە بەرنامەیەی غەیری خوای گەورە دەکا وەکو ئەو مەزهەبانەی ئەمرۆ وەکو علمانیەت و دیموکراسیەت کەوا ئینسانەکان دایانناوە ئەمشتانە ئەکا بەرێبازی خۆیی ئەوە ئەو کەسە شیرکی کرد ئێمە ئینکاری خواپەرستی ئەو ناکەین بەلام لەگەل خوا پەرستیەکەیدا شیرکیشی کرد وعیبادەتی بۆ غەیری خوای تعالی کردوە .

ئێمە وتمان گەر موحید بی و بلێ عیلاقەم نیە بەکافران تۆ موشریکی چ جای ئەوەی بچی تێکەلاوی ئەم شتانە بی ئەمە نیهێنی مەسەلەکەیە.

ئەلێن (ليس ممن عبد الله مخلصين له الدين وإذا كان كذلك هؤلاء ليسوا بالمحودين)ئایا ئەوکەسانە موحیدە و یەکخوا پەرستە ئەگەر وابێ ؟.! ئەوەی کە هاناو هاوار بەرێی بۆ غەیری خوا ئەوەی کە حوکمرانیەك قبول بکا کە حوکمرانی خوا نەبێ ئەمە بەتەنها خوای گەورەی پەرستووە ؟.! هەموو کەسێکی عاقل دەلێ نەخێر بەتەنها خوای نەپەرستووە بەلکو شەریکی لەگەل خوادا داناوە کەواتە حالی کەسەکە ئەوەیە کەوا موشریکە چۆن تۆ ئەلێ موشریك نیە ! ئینجا ئەم کەسە ئەزانێ یاخود نازانێ ئەمە مەسەلەیەکیترە (ولهذا كان كل

من لم يعبد الله وحده فلابد أن يكون عابدا لغيره يعبد غيره فيكون مشركا، وليس في بني آدم قسم ثالث.)کەواتە ئەوانە موحید نین .

موحید کێ یە :.

ئەوکەسەیە کەوا بەتەنها خوای گەورە دەپەرستی وە شەریکی بۆ بریار نادا وە کافریشە بەغەیری خوای گەورە بەسەراحەت دەلێ (لا اله الا الله) .

ئەگەر بەم شێوەیە نەبوو کە پێناسەمان کرد تێکەلاوی کرد ئەوە ئەم کەسە موحید نیە بەلکو موشریکە ، بۆیە ئەلێ یان موشریکە یاخود موحیدە و سێ یەمان نیە لەنێوانیاندا (بل إما موحد ، أو مشرك ، أو من خلط هذا بهذا)یاخود تێکەلاوی کردوە (كالمبدلين من أهل الملل : النصارى ومن أشبههم من الضلال ، المنتسبين إلى الإسلام)وەکو گاورەکان یاخود ئەو سەرلێ شێواوانەی کە خۆیانداوەتە پال ئیسلام مەبەستی لەو کەسانەیە کەوا عیبادەت بۆ غەیری خوای گەورە دەکەن .)[1]

(كل من لم يعبد الله مخلصا له الدين فلا بد أن يكون مشركا عابداً لغير الله وهو في الحقيقة عابدًا للشيطان) هەرکەسێك بە ئیخلاصەوە عیبادەتی خوای نەکرد بەتەئەکید ئەم کەسە موشریکە لەحەقیەتدا عیبادەتی شەیطان دەکا چونکە هەر موشریکێك کە خوا دەپەرستێ و غەیری خواش دەپەرستێ ئەوە تابعی شەیطانە شەیطانە خوای دەپەرست بەلام بەقسەی خۆیی کرد و تەکەبووری کرد لەعیبادەتی خوای تعالی بۆیە کافربوو .( فكل واحد من بني آدم إما عابد للرحمن ، وإما عابد للشيطان)[2] کەواتە ئینسانەکان دووانن یا بەندەی رەحمانە یاخود بەنەدەی شەیطان سێ یەمیان نیە رەش و سپیە یاخود رەشە یاخود سپیە .

(قال تعالى: (وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ )[3]هەرکەسێك ئەگەر کوێربێ لەئاستی یادەکەی خوای تعالی و فەرمانەکانی و قورئانەکەی خوای تعالی خۆیی لێ وێلبکات و دووربکەوێتەوە لێی خوای تعالی دەلێ ئەم جۆرە کەسانە شەیطانێکی بۆئامادە ئەکەین

---

[1]:. مجموع الفتاوى ج ١٤ ص ٢٨٢

[2]:. مجموع الفتاوى: ٢٨٢/١٤ - ٢٨٤.

[3]:.سورة الزخرف اية :. ٣٦

کەلەگەلیدا دۆست بێ (وَإِنَّهُمْ لَيَصُدُّونَهُمْ عَنِ السَّبِيلِ وَيَحْسَبُونَ أَنَّهُم مُّهْتَدُونَ)[1] لەڕێگەی راست لایان ئەدەن واش ئەوانن کەوا ڕێگەی راستیان گرتووە .

ئێستاش زۆربەی خەلکی وا دەزانێ کەوا ڕێگەی راستی گرتووە موشریکە و یەکخوا پەرست نیە لەبەر ئەوەی ئەلێ ئیمانم بەخوا هەیە نوێژ ئەکا و ڕۆژوو دەگرێی وا دەزانێ کەوا ڕێگەی راستی گرتووە (حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَنَا قَالَ يَـٰلَيۡتَ بَيۡنِي وَبَيۡنَكَ بُعۡدَ ٱلۡمَشۡرِقَيۡنِ فَبِئۡسَ ٱلۡقَرِينُ)[2] ڕۆژی قیامەت ئەوە دەرئەکەوێی کەکاتێك ئەم شەیطانە سەریی لێ تێکداوە ئەلێ خۆزگە مەشریق ومەغریب لێك دووربایینایە خراپترین هاواری بووین (وَلَن يَنفَعَكُمُ ٱلۡيَوۡمَ إِذ ظَّلَمۡتُمۡ أَنَّكُمۡ فِي ٱلۡعَذَابِ مُشۡتَرِكُونَ)[3] لەورۆژەشدا گەرانەوە هیچ سوودێکی نیە بەلکو پێویستە ئەمرۆ بگەڕێنەوە بەلکو لەرۆژی قیامەتدا خوای تعالی دەفەرمووێی ئێوە هەمووتان موشتەریکن لەم گوناهە و بەشدارن وە لەسزادانەکەشدا .

ابن القيم دەفەرمووی :

(كما ان من غمرة قلبه بمحبة الله تعالي وذكره وخشية التوكل عليه وإناب إليه أغناه ذلك عن محبة غيره وخشية وتوكل عليه)هەرکەسێك دلی پربێ لەخۆشەویستی خوا بەراستی ئەو جۆرە کەسانە دەولەمەند ئەبن لە مەحەبەت وخۆشەویستی و تەوکلی غەیری خوای لەدلدا هەبێ (وأغناء ايضا عن عشق الصور)یاخود پەیوەست بێ بە وینەوە مەبەستی لە کەسکەکانە بۆنمونە پەیوەست بێ بەمامۆستایەکەوە کەوا لەڕێگە لایداوە یاخود پەیوەیست بێ بەکەسانێکەوە کەوا ڕێگەی هەلەیان فێرکردووە ئەو عیشقی ئەوشتانەی نیە بەلکو مەحەبەستی خوای تعالی لەدلیدا هەیە .

ئەمرۆ عیشقی صور گەلێك زۆرە هەلواسینی رەسمەکان یاخود پەیوەست بوون بە کەسەکانەوە ئیتر بەبت ئەلێ یان بەرەسم ئەلێ بەهەرچی شتێکە ئەلێ هەتا صوری غەیری ئەوانەی کەوا گیان لەبەریشن نمونەی ئالا و ولات کەخەلك بونتە عاشقی ئەم شتانە وە موحیبەتی خوایی واز لێهێناوە یاخود لەگەل مەحەبەتی خوای تعالی تێکەلاوی کردوە (وإذا

[1]:.سورة الزخرف اية :. ٣٧
[2]:.سورة الزخرف اية :.٣٨
[3]:.سورة الزخرف اية :.٣٩

خلا من ذلك صار أبد هواء أي شيء إذ تحسنه من ذكر واستعبدوا)کە ئەبێت بە عەبدی هەوای خۆیی ئەوکاتە ئیتر (فالمُعرض عن التوحيد مُشرك شاء أم أبَى)هەرکەسێك پشت بکا لەتەوحید و یەکخوا پەرستی بیەوێی و نەیەوێی موشریکە (والمُعرض عن السنّة مبتدع ضال شاء أم أبى)هەرکەسێك لەسونەتی پێغەمبەری خوا لابا ﷺ موبتدیع و سەرلیٚ شێواوە بیەوێی یاخود نەیەوێی .

باشە ئەم قسانە چی دەگەیەنیٚ (مُشرك شاء أم أبَى)ئەبیٚ بلێن ئەو علماء یانە کەسیان کافر نەکردوە ؟! ئەوەتا خۆی کافری دەکا . خوای گەورە دەفەرمووێی (وَمَن يَرۡغَبُ عَن مِّلَّةِ إِبۡرَٰهِـۧمَ إِلَّا مَن سَفِهَ نَفۡسَهُۥ)[1] تەنها ئەوانەی کەوا ناچنە سەر دینی میلەتی ئیبراهیم تەنها ئەوکەسانەن کەوا بیٚ عقلن و کەسانی بیٚ عەقلن ئەوکەسە إلا خۆیی بیٚ عقل کردوە .)[2]

کەواتە خەلکی کرد بە دووبەشەوە (سفيهاً لا أسفه منه ورشيداً)بیٚ عەقلێك لەو بیٚ عەقلتر نیە لەگەل کەسێك کەوا ڕەشید و ڕاستگۆ و ڕاستگرە .ئەگەر تەوحید و یەکخوا پەرستی نەگری لەو کەسە بیٚ عقلتر نیە ئەوە نەصی ئایەتەکە وا ئەگەیەنیٚ .( فالسفيه من رغب عن ملته إلى الشرك،)سەفیهە ئەو کەسەیە کە دینی باوکە ئیبراهیمی بەجێهێشت بۆلای شیرك (والرشيد من تبرأ من الشرك قولاً وعملاً وحالاً)ئینسانێك کەوا ڕێگەی ڕاستی گرتبێتە بەر ئەو کەسەیە کەوا تەبرای کردبیٚ لەشیرك بە قەول و عەمەل و حالی خۆیی (فكان قولُه توحيداً وعمله توحيداً وحاله توحيداً ودعوته إلى التوحيد) ئەم خالە بزانین و چونکە ئەمە بەشی یەکەم بوو لەبابەتەکە ..)[3]

عیبادەت بەمەرج وەردەگیرێی بەبیٚ مەرج وەرناگیرێی (تقرير هؤلاء الإم أن العبادة إلي وحده لاشرك له لاتقع مع شرك به) ئایا عیبادەتی خوا لەگەل شیرکدا دەبیٚ (وأن من شروط تحقيق العبادة والعلم بالمعبود والمشرك جاهلا بالله عزوجل)یەکێکە لەمەرجەکانی بەجیٚ هاتنی عیبادەت ئەوەیە کە تۆ مەعبود و پەرستراوەکەی خۆت بناسی ئەبیٚ الله بناسی کە تاك و تەنهایە ئەبیٚ عیبادەت بۆ ئەو بکەی و بۆکەسیتر نەکەیی .

[1]:.سورة البقر اية :.١٣٠
[2]إغاثة اللهفان ج ١ ص ٢١٤
[3]:. (( مدارج السالكين ج٣ ص ٤٤٦

ئایا موشریك بەم جۆرەیە كەباسمان كرد !؟ موشریك جاهیلە بەخوای خۆیی لەبەر ئەوەی عیبادەت بۆ خوا و بۆ غەیری خوا دەكا كەواتە نازانی كامەی خوایەكەیەتی و چەند خوایەكی هەیە .

(فإن الله هو رب الملك خالق لكل شيء وبهذا يستحق العبادة وتألها وجب له شكر وحده لاشرك له والمشرك لاعلم له بهذا وأيضا من شروط العبادة خالصا لله وحده لاشرك له وأن يكون له توجه مسلما حال توجه لاتقع بهذا)كەواتە پێویستە ئینسانی موسلمان ئەبێ بزانی كە الله پەرستراوی راستەقینەیە و ئەو ئەوی دروست كردوە ئەو خالقیەتی وەئەو مستەحەقی عیبادەتە وە واجبە لەسەری كەوا شوكری بكات و عیبادەتی بكا ئەوكەسەشی موشریك بی عیلمی بەمە نیە . جا تۆ سەرنج بدە كە عیلمی نەبوو ئەو نەبوونی عیلمەی دەری دەكا لەوەی كەوا موشریك بێ ئەو كەسە ؟! نەخێر دەری ناكا .

خالێكی تر (ثبت وصف شرك قبل رساله والحجه عليه العقل والفطرية)واتا ئینسانی موسلمان ئەبێ بزانی كەوا وەسفی شیرك پێش هاتنی پێغەمبەرایەتی دانراوە بۆ ئەم خەلكە وە پێش ئەوەی پێغەمبەر بێت ﷺ وە پێش ئەوەی ئەو كیتابە بێت كەوا خوای تعالی بۆیی دەهێنی ئەو خەلكەی كە بۆیی هاتووە موشركە بۆیە ئەو پێغەمبەرە دێت بۆ ئەوەی لەو شیركە دەریان بكا.

(إثبات هؤلاء ألإمم أن والصف الشرك ثبت قبل رسالة والحجة عليه العقل والفطرية)ئەو ئیمامانەی كەوا باسمان كرد (ابن تيميه و ابن القيم و محمدی كوری عبدالوهاب)هەموویان ئەلێن وصفی شرك دامەزراو دەبێ بۆ هەركەسێك هەتا ئەگەر پێغەمبەریش نەیەت ئەوخەلكە گەر لەشیركدا بوون پێیان ئەوترێی موشرك ئەمە بە عەقل و بەفیطرە ئینسان دەتوانی وەری بگرێی (ولا يحتاج إلي ذلك الرسول إلا أن العذاب لايكن بعد الحجة الرساله).

(والحجة عليه العقل والفطرية)واتا كە خوای گەورە فیطرەتی داوە بەئینسان بەو عەقل و فیطرەوە ئەبێ شیرك و تەوحید جیابكاتەوە هەتا پێغەمبەریش نەیەت ئەبێت ئەم كەسە ئەمە بزانێ ئەگەر وانەكات موشریكە بەلام (إلا أن العذاب لايكن بعد الحجة الرساله) بەلام عەزابدانی ئەو جۆرەكەسانە لەسەر ئەوشیركەی كەوا ئەیكەن لەسەریان نابێت تاوەكو

پێغەمبەرەكە نەیەت بۆیان یاخود بۆیان ڕانەگەیەنرێی هەروەكو الله تعالی دەفەرمووی (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[1]

ابن تیمیه دەفەرمووی :

(الْجُمْهُورِ مِنْ السَّلَفِ وَالْخَلَفِ : عَلَى أَنَّ مَا كَانُوا فِيهِ قَبْلَ مَجِيءِ الرَّسُولِ ، مِنْ الشِّرْكِ وَالْجَاهِلِيَّةِ : ﴿ كان ﴾ سَيْئًا قَبِيحًا ، وَكَانَ شَرًّا ؛ لَكِنْ : لَا يَسْتَحِقُّونَ الْعَذَابَ إلَّا بَعْدَ مَجِيءِ الرَّسُولِ)سەیری ئەم عیبارەتە بكەن بەباشی شێخ ئەلیٚ جمهور لە خەلەف و لەسەلەف ئەو شتە و ئەو عقیدەی كە خەلكەتێدا بووە لەپێش هاتنی پێغەمبەر ﷺ لەشیرك و لەجاهیلەیەتدا (كان ﴾ سَيْئًا قَبِيحًا)شتێكی زۆر خراپ بووە بەلام موستەحەقی عەزاب نەبوون ئەوانەی كەوا پێیان نەوتراوە إلا پێغەمبەرەكە بێت كە هات ئەوكاتە ئەبێت بەبەلگە بەسەریانەوە .)[2]

كەواتە وجودی شیركەكە هەر هەبووە ناتوانیٚ بلیٚ ئەو قەومە موشریك نەبووە (وقال أيضا فهذا كله يبين قبح ما كانوا عليه قبل النهي)ئەمە ئەوە دەگەیەنیٚ كەوا پێش ئەوەی نەهییان لیٚ بكرێی ئەوشیرك و شتە قەبیح بووە ئەم كارە و وتەیان شیرك بووە نابیٚ بوترێی شیرك نەبووە ئەو خەلكە موشریك نەبووە . كەواتە سەیری بكە جەهالەتی خەلكەكە نەبۆتە بیانوو بۆئەوەی بلێن خەلكەكە جەهالەتیان هەبوو بۆیە موشریك نەبوون ؟! نەخێر نەبۆتە بیانوو .

(وقال أيضا فلولا أن حسن التوحيد وعبادة الله وحده لا شريك له وقبح الشرك ثابت في نفس الأمر معلوم بالعقل لم يخاطبهم بهذا)ئەگەر وانەبووایە و تەوحید جوان نەبووایە وشیرك قەبیح نەبوایە مخاطەی نەئەكرد بەمە)[3]

شێخ دەفەرمووی: (فالأسماء تثبت قبل قيام الحجة) ناو موشریك پێش ناردنی ریسالە دامەزراوە و هەیە لەكیتاب و لە سونەدا سەیر دەكەی ئەو خەلكە موشریكە بۆیە ئەو پێغەمبەرەی بۆ هاتووە (فَإِنَّهُ يُشْرِكُ بِرَبِّهِ وَيَعْدِلُ بِهِ وَيَجْعَلُ مَعَهُ آلِهَةً أُخْرَى وَيَجْعَلُ لَهُ أَنْدَادًا

[1]:سورة الإسراء اية :١٥
[2].: مجموع الفتاوى" (٢٠/ ٣٧-٣٨(
[3].: مجموع الفتاوى ملجدي ٦:.١١\٦٨٢...ص٣٧٢

قَبْلَ الرَّسُولِ) پێش پێغەمبەرەکە شیرکیان کردوە وە ئەمەشیان لەسەر حیساب کراوە کەوا موشریکن بۆیە پێغەمبەرەکە هاتووە .)[1]

کەواتە جەهالەتی ئەو خەلکە نەبێتە ڕێگر بۆ ئەوەی پێ بوترێی موشریك مادەم کەوتە شیرکەوە .

لێکۆلێنەوەیەك دەکەین لەسەر ئەوەی ئایا بەراستی ئەم علماء یانە وتویانە معین کافرناکەین هەتا بەیانی ریسالەیان بۆ نەکەکەین وە ئەم حالەتە چۆنبووە ئەگەر وتراوە .

ابن تيميه دەفەرمووی .: (فإن حال الكافر لا تخلو من أن يتصور الرسالة أولا فإن لم يتصورها فهو فى غفلة عنها وعدم إيمان بها كما قال (وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا)[2] وقال (فَٱنتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَأَغْرَقْنَـٰهُمْ فِى ٱلْيَمِّ بِأَنَّهُمْ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَا وَكَانُوا۟ عَنْهَا غَـٰفِلِينَ)[3] لكن الغفلة المحضة لا تكون إلا لمن لم تبلغه الرسالة والكفر المعذب علية لا يكون الا بعد بلوغ الرسالة).

ئێستا ئەم دێرە شی دەکەینەوە (والكفر المعذب علية لا يكون الا بعد بلوغ الرسالة)واتا حالی خەلکی ئەوەیە یان ئەوەتا پێغەمبەری بۆ هاتووە کە تێگەیشتووە یان تێ نەگەیشتووە (فإن لم يتصورها فهو فى غفلة عنها)ئەگەر پێغەمبەر بێتوو ئەو گوێی پێ نەدا ئەوە لەغەفەلتدایە (وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا)[4] ئەم ئایەتە لەسەر ئەوەیە کە نابێ گوێڕایەلی و بەقسەی ئەوانە بکەی کە خوا دلی لە ئیمان غافل کردوون وە شوێن هەوالی خۆیی کەوتوە (لكن الغفلة المحضة لا تكون إلا لمن لم تبلغه الرسالة)کەواتە ئەوەی یەکەم پێغەمبەرەکەی بۆ هاتووە و ئیعراضی کردووە ، (الغفلة المحضة)وە ئەمەشیان واتا بێ ئاگایی تەواو ئەمشیان لە ڕێزی موسلمانان حیساب ناکرێی چونکە ریسالەی پێ نەگەیشتووە و لەغافلانیشدایە با بەدرۆشی نەخاتەوە مادەم ئەو کەسە جاهیلە بەدینەکە هەر موشریکە لەبەر ئەوەی (لم يعبدوا الله مخلصا له دين) .

[1] .: مجموع الفتاوى ٢٠\٣٧-٣٨
[2] :سورة الكهف اية :.٢٨
[3] سورة الأعراف اية : ١٣٦
[4] :سورة الكهف اية :.٢٨

بەلام لێرەدا شێخ دەلێ (والكفر المعذب علية لا يكون الا بعد بلوغ الرسالة) ئەو كافربوونەى كەوا خواى گەورە عەزابى لەسەر دەدا إلا لەدواى تەبليغ كردنى ريسالەكەيە (فكل مكذب لما جاءت به الرسل فهو كافر)هەركەسێك درۆزن بێ و پێغەمبەرەكان بەدرۆ بخاتەوە يان ئەوەى كە هێناويەتى ئەوە كافرە .

(وليس كل كافر مكذبا)ئايا هەموو كافرێك درۆزنە و پێغەمبەران ياخود پێغەمبەرێك بە درۆ دەخەنەوە ؟! نەخێر (بل قد يكون مرتابا ان كان ناظرا فيه)جارى واهەيە رەيب و گومان و شكى هەيە بەدرۆيى ناخاتەوە بەلكو دەلێ گومانم هەيە لەو شتە (أو معرضا عنه بعد أن لم يكن ناظرا فيه وقد يكون غافلا عنه لم يتصوره بحال)هەموو جۆرەكانى باسكرد يان ئەوەتا ئينكارى و عينادى دەكا بەدرۆى دەخاتەوە ياخود بەدرۆيى ناخاتەوە گومانى هەيە ياخود تێ نەگەيشتووە (لكن عقوبة هذا موقوفة على تبليغ المرسل اليه)ئەگەر غافل بوو تەصورى ريسالەى نەكردبوو وە ئەصلن هەر پێغەمبەرى نەبينيوە و پێ نەگەيشتووە پەيامەكەى ئەم كابرايە حوكمى كافرە بەلام ئەلێ (لكن عقوبة هذا موقوفة على تبليغ المرسل اليه)عقوبەتى ئەم كەسە لەسەر تەبليغەكەيە ئەگەر تەبليغ كرابوو عقوبە دەدەرێى ئەگەر تەبليغ نەكرابوو عقوبە نادرێى نەوەكو كافر نەكرێى )[1].

پرسيارێكى گرينگ لە شێخ ئيسلام ابن تيميە كراوە سەبارەت بە بابەتى كافر كردنى كەسانێك كە موشريكن ئەگەر معذبن ئەگەر معذب نەبن با سەيرى ئەم پرسيارە بكەين .!

(سئل الشيخ رحمه الله عن قوم داوموا على " الرياضة " مرة فرأوا أنهم قد تجوهروا فقالوا : لا نبالي الآن ما عملنا وإنما الأوامر والنواهي رسوم العوام ولو تجوهروا لسقطت عنهم وحاصل النبوة يرجع إلى الحكمة والمصلحة والمراد منها ضبط العوام ولسنا نحن من العوام فندخل في حجر التكليف لأنا قد تجوهرنا وعرفنا الحكمة فهل هذا القول كفر من قائل؟ أم يبدع من غير تكفير؟ وهل يصبر ذلك عمن في قلبه خضوع للبنبي ﷺ)لێيان پرسيوە قەومێك لەصۆفيەتى و لەدەروێشاتيدان (الرياضة) بەماناى راهێنانە لەسەر نەفس ورۆحى على ئەساس ئەمانە قەومێك هەن كەوا بەم شێوەيە خۆيان راهێناوە وە وتويانە ئێمە پێگەيشتووين ئێمە

[1]: ص-٣٠٣-٣٠٤ - أرشيف ملتقى أهل الحديث - الإيمان حقيقته و نواقضه - المكتبة الشاملة الحديثة

گەیشتینە زانین و مەعریفەتی حەقمان بینی بەو مانایەی حیکمەتمان زانی پێویست ناکا عیبادەت بکەین و نوێژ و ڕۆژوو بگرین و ئەمانەیان ڕاگرت تەکالیفەکانیان ڕاگرت ئەوامیر و نەواهی بۆ عەوامە بۆ ئەویە عەوام ڕێك بخرێت ئێمە گەیشتووینەتە حەقیقەت چ پێویست دەکا ئێمە ئەوشتانە بکەین . پرسیان لەشێخ ئایا ئەم کەلامە کوفرە ؟! یاخود بیدعەیە ؟کامیانە .

وەلامی شێخ ئیسلام ابن تیمیە دەفەرمووی (لا ريب عند أهل العلم والإيمان أن هذا القول من أعظم الكفر وأغلظه وهو شر من قول اليهود والنصارى)ئەمە گەورەترین کوفرە لەقەولی یەهود و نەصرا خراپترێکە .)[1]

ئەم قەولە ئێستا بەبارێکیتردا بیبەینەوە هەموو عەلمانیەکان ناگرێتەوە .؟ چونکە دەلێن دین عیلاقە و پەیوەندی نێوان ئینسان و خوایە !پەیوەندی نیە بەژیانی ڕۆژانەمانەوە یاخود دەلێن لەدلتدا بەس بیناسە تەواو ئیتر هەروەکو لەپێشتردا باسمان کرد کەوا علمانی جۆری هەیە جا حوکمی ئەم کەسانە چیە ؟ ئایا حوکمی ئیمانداریان بۆ دائەنرێی بەداخەوە وەکو زۆر کەس تێکەوتوە ئەلێ علمانی توند ڕەو میانرەو .

ئەمە شێخ ئیسلام پێیان ئەلێ ئەم وتەیان لە گەورەترین و توند ترین وناشرینترین کوفرە . تۆ دەبێ تا مردن خوا بپەرستی نابێ بلێ فەرمانەکانی خوای گەورەم لەسەر لاچوە ئیتر ئەگەر عیبادەت بێ یاخود ئەحاکم بێ

(والمقصود أن المتمسكين بجملة منسوخة فيها تبديل خير من هؤلاء الذين يزعمون سقوط الأمر والنهي عنهم بالكلية)ئەلێ بۆیە وتویەتی لە یەهود و نەصارا خراترە یەهود و نەصارا شەریعەتی منسوخیان هەیە گۆڕانکاریشی تێدا کراوە بەو منسوخیەتیە و گۆڕانکاریەی کردوویانە هێشتان ئەوان باشترن لەوەی بلێت من شەریعەتم لەسەر نیە بەومانایەی من نابێ یاسای خوا و شەریعەتی خوا لەسەرم بێ و جێ بەجێ بکەم خۆمان حوکمی خۆمان ئەکەین یاخود عیباداتمان لەسەر نەماوە (فإن هؤلاء خارجون في هذه الحال عن جميع الكتب والشرائع والملل)ئائەم گروپە لە هەموو شەریعەت و میتەکان چوونەتە دەرەوە (لا يلتزمون لله أمرا ولا

[1]:. مجموع الفتاوى ملجدي ٦:.٤٠١\١١....ص٢٢٠

نهيا بحال)نايەن ئەو ئەمر و نەهيانەی كەوا خوای گەورە دايی ناوە پێوەيە پابەند بن (بل هؤلاء شر من المشركين المستمسكين ببقايا من الملل)هەتا ئەمانە لە موشريكەكانی مەككە خراپترێكن چونكە موشريكەكانی مەككە (كمشركي العرب الذين كانوا مستمسكين ببقايا من دين إبراهيم عليه السلام) موشريكی عەرەب هەندێك دينی ئيبراهيم مابوو لەناو مەككەدا ئەيانبرد بەرێوە لەوانە حەج لەوانە صەدەقە لەوانە ڕۆژوو ئەمانە هەبوو ئەيانكرد كەچی ئەوان ئەلێن ئەوەش ناكەين ! كەواتە ئەوكەسەی بلێ تەكاليف هەلدەگيرێی ئەوە لەيەهود و نەصارا كافرترە ئەوە تەكفير كراوە لەلای ئەو علماء يانەوە .

(فمن كان من قوله هو أنه أو طائفة غيره قد خرجت عن كل أمر ونهي بحيث لا يجب عليها شيء ولا يحرم عليها شيء فهؤلاء أكفر أهل الأرض)هەركەسێك و هەر گروپێك بلێ ئەمر و نەهی خوام لەسەر نەماوە و نيە وە جێ بەجێ ناكەم من گەيشتوومەتە حەقيقەت ئەوە لەكافرترينی ئەهلی سەر زەوييە (وهم من جنس فرعون وذويه)ئەوە لەجنسی فيرعەون ئەوانەدايە كە وتی من خوام گەيشتە ئەو قەناعەتەی كەوا عيبادەتی كەس نەكا بەس خۆيی .

شێخ ئيسلام دەفەرمووی :. (وكثير من الناس قد ينشأ في الأمكنة والأزمنة الذي يندرس فيها كثير من علوم النبوات، حتى لا يبقى من يبلغ ما بعث الله به رسوله من الكتاب والحكمة، فلا يعلم كثيراً مما يبعث الله به رسوله ولا يكون هناك من يبلغه ذلك، ومثل هذا لا يكفر)ئاگاداری ئەم عيباراتە بە . ئەلێ زۆر كەس هەيە كە پێ نەگەيشتووە نازانێ ئالەم زۆرە كەسانەش (ومثل هذا لا يكفر)ئەم جۆرە كەسانە كافر نيە جوان سەيری عيبارەتەكە بكە مەبەستی لەكافر نيە چيە لەكاتێكدا كە بۆيی باس كردی ئەمە ئە كافرترينی ئەهلی زەوييە (فقد تبين أن هذا القول كافر ولكن تكفير قائله لايحكم به حتى قد بلغه من العلم ما تقوم به عليه الحجة التي يكفر تاركها)زانيمان ئەم قەولە كوفرە بەس كابرای پێ كافر نابێ هەتا ئيقامە حوجەی لەسەر نەكرێی (ودلائل فساد هذا القول كثيرة في الكتاب والسنة واتفاق سلف الأمة وأئمتها ومشائخها)خۆئەم قسەيە فسادەكەی زۆر زۆر ظاهيرە كە بلێ ئێمە هيچمان لەسەر نيە ئەمە هەر پێويست ناكا ڕەدبدرێتەوە دەليلی زۆری لەسەرە (لا يحتاج إلى بسطها بل قد علم بالاضطرار من دين الإسلام: أن الأمر والنهي ثابت في حق العباد إلى الموت)هەموومان ئەزانين

ئەمر و نەهلی لە ئەمریی ئێمەدا هەتاوەکو مردنە هەتاوەکو مردن لەسەرماندا لاناچێ (وَٱعۡبُدۡ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأۡتِيَكَ ٱلۡيَقِينُ )[1] کەواتە ئەم قەولە کوفرە یاخود کوفر نیە !؟ وە کابراشی پێ کافر دەبێ یاخود نا ؟! لێرەدا کە دەڵێ کافری ناکەین بزانین مەبەستەکەی چیە :.

(وأما قول القائل: هل يصدر ذلك عمن في قلبه خضوع للنبي، ﷺ ،؟)ئەم قسەیە لە دڵێك دەرناچێ کەوا خضوعی هەبێ بۆ پێغەمبەر ﷺ ملکەچی تێدا بێ بۆ پێغەمبەر ﷺ بەمانای بەقسەکردن و گوێڕایەڵی ؟!

(فيقال: هذا لا يصدر عمن هو مقر بالنبوات مطلقاً.)نەك هەر بەپێغەمبەر ﷺ بەڵکو بەهەموو پێغەمبەران ئەو کەسەی کە مقیر بێ ئەم قسە لەو کەسە دەرناچێ (بل قائل ذلك كافر بجميع الأنبياء والمرسلين) ئەڵێ قائیلی ئەم کەسە کافرە بەهەموو پێغەمبەران تەنها پێغەمبەر محمدنا (عليهم الصلاة والسلام) چونکە ئیشی پێغەمبەران ئەمر و نەهی بووە (لأنهم جميعاً أتوا بالأمر والنهي للعباد إلى حين الموت)هەموویان بۆ ئەمر و نەهی هاتوون بۆ عیبادەت کردن هەتاوەکو مردن (بل لا يصدر هذا القول ممن في قلبه خضوع لله وإقرار بأنه إله العالم) لەدەمی کەسێك نایەتە دەرەوە کەوا لەدڵی ئیمان هەبێ بەوەی کە الله خوای عالمە (فإن هذا الإقرار يستلزم)ئەو ئیقرارەی تۆ دەیکەیت کە الله خوای تۆیە ئەوە دەگەیەنی (أن يكون الإنسان عبداً لله خاضعاً له) ئەبێ ملکەچی خوا بی (ومن سوغ الإنسان أن يفعل ما يشاء من غير تعبد بعبادة الله) هەرکەسێك برەخسێنی و بۆیی جائیز بکا کە عیبادەتی غەیری خوای گەورە بکا .( فقد أنكر أن يكون الله إلهه) ئینکاری ئەوەی کرد کەوا الله خوای ئەو بێ چونکە تۆ شیرکت کرد .)[2]

## لێکدانەوە وشەکانی شێخ ئیسلام

(انظر –رحمك الله– إلى هذه الفتوى فإنه قرر في أولها أنهم أكفر أهل الأرض)نەیوت ئەمانە لەکافرترینی ئەهلی زەوین ئەوەی کە ئەم قسەیە بکات (وأكفر من اليهود والنصارى وأنهم أخبث من المشركين)هەتا لەموشریکەکانی مەککەش خراپترن (ثم ينفي الكفر عنهم بعد ذلك) بەلام دوایش دەڵێ ئەمە کافر نابێ تا ئیقامە حوجەی لەسەر نەکرێی ! ئائەم عیبارەتەیە

[1]:.سورة الحجر اية : ٩٩
[2]: :. مجموع الفتاوى ملجدي ٦:.ص٢٢٦

بۆتە ئیشكال و كێشە لەلای زۆربەی ئەوانەی كە دەڵێن ابن تیمیە كافری كافر نەكرد من چۆن ئێستا موسلمانێك كافر بكەم ! (لقلة العلم وغلبة الجهل وهذا هو الكفر المعذب علیه)سركە ئەوەیە كە ئەم كوفرە معذب علیه نەك كوفر كافر بوون ئەو كوفرەیە كە خوای گەورە عەزابی نادا لەسەری ،كەواتە كوفر بووە دوو بەشەوە واتا ئێمە بەو كەسە ئەڵێن كافرە بەس ئەگەر نەزانێ عەزاب نادرێی بەلام ئەگەر زانی ئەوە عەزابیش ئەدرێی . كەواتە كاتێك نەفی كوفر دەكا شێخ ئیسلام یاخود كاتێك شێخ محمدی كوری عبدالوهاب دەلێ ئەوەی كەوا بەدەوییی دەپەرستێ یاخود عبدالقادر دەپەرستێ من كافری ناكەم مەبەستی كافری ناكەم ئەوە نیە كەوا ئەم كەسە كافر نیە بەلكو ئەلێ من نالێم ئەو كەسە كافرێكە كەوا كوفری معذب علیه لەسەرە یانی بەو كوفرەی خوای گەورە عەزابی نادا چونكە نەیزانیوە كەواتە كافرێكە كە خوای گەورە عەزابی نادا هەتاوەكو ئیقامە حوجەی لەسەر نەكرێی . بەو مانایەی ئەگەر بەم شێوەیە بڕواتە بۆ قیامەت خوای تعالی ئیمتحانی دەكا عەزابی نادا چونكە خوای گەورە حیكمەتی وایە هیچ كەسێك سزا نادا هەتا پەیامەكەی پێ نەگا هەروەكو دەفەرمووی (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبۡعَثَ رَسُولٗا)[1] بەلام كەسەكە كافرە ئەحكامی لەسەر جێ بەجێ دەبێ ، ئەم جۆرە كەسە ئێمە ناتوانین دوعای بۆ بكەین ناتوانین صەدەقەی بۆبكەین ناتوانین داوای لێخۆشبوونی بۆ بكەین سەیركەن خوای تعالی چی دەفەرمووی لە دوعا لێخۆشبوونەكاندا لە قورئاندا (رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا وَلِإِخۡوَٰنِنَا ٱلَّذِينَ سَبَقُونَا بِٱلۡإِيمَٰنِ)[2] ئەی ئەوەی كەوا بەئیمان نەرۆیشت خۆ ئەم كەسە بەئیمان پێش ئێمە نەكەوتوە نابێت دوعای بۆ بكەین مەرجی دوعا كردن بۆی ئیمانە . بۆیە دەلێ (وهذا هو الكفر المعذب علیه، ثم يثبت بعد هذا أنهم كفار بجميع الكتب والرسل وكفار بإلهية الله وهذا هو الكفر قبل الخبر وقيام الحجة.)دوایش دەلێ ئەمانە كافرن بەهەموو پێغەمبەران(علیهم الصلاة والسلام)بە هەموو كتێب مەبەستی ئەم كافرەیە كەوا كەسەكە نازانێ بەلام كوفری كردوە وە كەسەكە كافرە بەلام تەعزیب نادرێی لەسەریی.)[3]

---

[1]:سورة الإسراء اية :١٥

[2]:سورة الحشر اية : ١٠

[3]: ص٢٨٣ - كتاب العذر بالجهل تحت المجهر الشرعي - المبحث الرابع تعريف الكفر الذي ينفيه هؤلاء الأئمة - المكتبة الشاملة الحديثة

**شوبهەیەك دەهێنین**

بەداخەوە ئێستا كەسانێك پەیابوون ئەلێن باو باپیرانی خۆیان كافر دەكەن بەم كەسانە دەلێن كەوا ئەهلی تەوحیدن و ئینسانەكان بەكوفرەكانیان كافر دەكەن هەروەكو باسمان كرد!

وەلامەكەی :

باو باپیرانمان كەسانێك بوون یان موحید بوون یاخود موشریك بوونە ئەگەر موحید بوون كێ ئەتوانی موحید كافر بكا !؟ ئەوە ئیفترایە .

ئەگەر موشریكیش بوون كێ ئەتوانی بە موشریك بلێ موحیدە !؟ ئەوە جێگای ئیتسفهامە تۆچۆن بەموشریكێك ئەلێ موسلمان ! كە موشریك بوو موشریكە ئینجا ئەم كەسە یان زانیویەتی یاخود نەیزانیوە لەدوای ئەم روونكردەوەی پێشوتردا تێگەیشتن لەم بابەتە زۆر ئاسانە .

بەكورتیەكەی باس دەكەین :.

هەركەسێك دینی تەوحیدی نەبێ موشریكە بەلام ئەم موشریكە لەسەر دوو حالەتە :.

١-یان زانیویەتی كەوا ئەمە شیركە . ٢-یاخود نەیزانیوە كەوا ئەمە شیركە .

ئەوان دێن كێشەكەیان لەوەدایە ئەو خەلكە نەیزانیوە تۆچۆن بۆ جەهەنەمی ئەبەیی ! وە ئێمەش دەلێن ئێمە نالێن جەهەنەمین كە موشریك بوو إلزامی ئەوە ناكەین بلێن إلا ئەبێ ئەو كەسە بچێتە جەهەنەمەوە یان ئەو كەسە نەیزانیوە كەمادەم نەیزانیوە خوای گەورە دەفەرمووی (وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا)[1] وە ئەم ناروونی و ئیشكالەیان بۆ روون بكەنەوە با وا تێ نەگەن كەتۆ وتت كەسەكە موشریكە . لەبەر ئەوەی موشریك لەلای ئەو یەكەسەر بۆ ئاگرە موشریك یەكسەر بۆ ئاگر نیە موشریك هەیە عەزاب ئەدرێی وە موشریك هەیە عەزاب نادرێی هەروەكو قەولی شێخ ئیسلام ابن تیمیە مان هێنا كە دەفەرمووی (الكفر المعذب علیه لایكون كما بلوغ رسالة).

(وصلى الله على نبينا محمد وعلى آله وصحبه أجمعين)

[1]:سورة الإسراء اية :١٥

ڕاڤەی

# كشف الشبهات

نووسنی

**شيخ محمد بن عبدالوهاب**

ڕاڤەکردنی

**مامۆستا کامەران کەریم**

نووسینەوەی

**زانست خوازانی شەرعی**

ئامادەکردنی

**بەرەوبەهەشت**

# كشف الشبهات

شێخ ڕەحمەتی خوای لێ بێت کە ئەم ڕیسالەیەی داناوە نامیلکەیەکی زۆر گرینگە لەڕەتدانەوەی قەبر پەرستەکان و شەخص پەرستەکان دایناوە و شوبهەکانیان پوچەڵدەکاتەوە وە کو وتمان(کشف الشبهات) بەمانای دەرخستن وپەردە هەڵدان لەسەر و لەنێوبردن و نە هێشتن و ئەو بابەتانە ئەگرێتەوە واتا لەناوبردنی شوبوهاتی قبوریین و قەبرپەرستان ئەوشوبهانەی کەهەیانە کەبەدەستیانەوە کە لەدێرین زەمانەوە پێش پێغەمبەرمان ﷺ لەزەمانی پێغەمبەر(محمد)یشدا ﷺ و لە دوای ئەمیش و تادەگاتە زەمانی شێخ (محمدی کوری عبدالوهاب) هەتا ئێستاش کە ئەو شوبوهاتانە دێت و دەروات بەدەستیانەوەیە

مامۆستا

رحمه الله

کامەران کەریم